بەرگی سێیەم

# مەملەکەتی نوور

ڕۆمانی ژیانی باشترین پیاو

لە خەندەقەوە تا فەتح





نووسینی
ماکوان کەریم

بسم الله الرحمن الرحيم

# مەملەکەتی نوور

## ڕۆمانی ژیانی باشترین مرۆڤ

(بەرگی سێیەم)


نووسینی: **ماکوان کەریم**

پێداچوونەوەی: **شەوبۆ جەلال، زیوەر ئەنوەر**

نووسینەوەی: **فیردەوس موحەممەد**

**کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی**



بەڕێوەبەری گشتی: **موحەممەد خضر ئەحمەد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤**

بەڕێوەبەری هونەری: **موستەفا موحەممەد کوردی ٠٧٥٠٩٩٩٨١٨٢**

فەیسبووک: **کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana**

ئنیستگرام: **کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana**

لقی یەکەم: **بەرانبەر دەرگەی قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری**

لقی دووەم: **چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەلاف**

ئیمێل: **mdmaktaba@gmail.com**

نەخشەسازیی ناوەوە: **موستەفا موحەممەد کوردی**

نەخشەسازیی بەرگ: **برەو نەججاڕ**

چاپی یەکەم: **٢٠٢٤**

پێوانە: **١٧ * ٢٤**

تیراژ: **٤٠٠٠**

نرخ: **٣٠٠٠٠**

**لە بەڕێووبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان**

**ژمارە سپاردنی (١٨٨)ی ساڵی (٢٠٢٠) پێدراوە**

له بڵاوکراوەکانی بزاڤی نوێ

# مەملەکەتی نوور

## ڕۆمانی ژیانی باشترین مرۆڤ

(بەرگی سێیەم)

نووسین:
ماکوان کەریم

چاپی یەکەم
٢٠٢٤



وصلى الله على ئەو زاتی پاکی قودسی ئایاته

که ئەخلاقی پەسەند دیدەی جەنابی حەیی مەننانه

مەحوی



# سەرەتای کتێبی سێیەم
# جارێکی تر لە زیندانەوە بۆ ناو پرۆژەی نوور

لە مانگی مەی ساڵی ٢٠٢٢ لە گۆشەی زینداندا دانیشتبووین لەگەڵ مامۆستا کرێکار کتێبی (ئوصولی ثلاثة)ی محەمەد کوڕی عەبدوولوەهابی بۆ شەرح دەکردین، لە پڕ بانگی من کرا وتیان بڕۆ جلوبەرگت ئامادە بکە بەیانی ڕاتدەگوازین بۆ زیندانی ڕۆما.

عەرزی مامۆستام کرد لەوانەیە چەند ڕۆژێک لە زیندانی ڕۆما بم و پاشان بگەڕێینەوە بۆ نەرویج بۆ زیندانی هاڵدن- زیندانێکە نزیکی شارەکەیە کە من لێی دەژیم. خواحافیزیم لە جەنابی مامۆستا و هاوڕێکانم کرد لە زیندانی (ساماریی) لە دوورگەی (سەردینایا) بەرەو ڕۆما دەمبەن، بەیانی بە قۆڵبەستراوی بردیانم بۆ فڕۆکەخانەی ساساری و بردیانمە میلانۆ، پاشان بردیانم بۆ ناو فڕۆکەیەکی تر بەرەو خوارووی ئیتاڵیا بەناوی (ڕۆسانۆ). درۆیان لەگەڵ کردین تەنها بۆ ئەوەی من و مامۆستا کرێکار جیا بکەنەوە، چوومە زیندانی ڕۆسانۆ لەوێ زیندانییەکان هاتن بەدەممەوە، کردیانمە ژووری زیندان و ئینجا لەوێ ڕۆژانی زیندانم بەسەر دەبرد.

بەڵام ئەم زیندانە لە چاو زیندانەکەی پێشووتردا زۆر ناخۆشبوو، ئەوەی زۆر ماندووی کردم گەرمای هاوین و هەموو ئەو جۆرە مێشوولە و مار و مێرووە بوو، کە ئێوارە دادەهات دەبوو گڵۆپی ژوورەکە بکوژێنمەوە بۆ ئەوەی مێروولە و مارمێلک و قالۆنچە گەلەکۆمەکێم لێ نەکەن، ئیتر لە شەودا دەبوو لە جیاتی خوێندنەوەی کتێب و نووسین عارەق بڕێژم و مەگەر چەند سەعاتێک بخەوم، کە ڕۆژ هەڵدەهات ئیتر باش بوو کاتی خوێندنەوە و نووسینم دەستی پێ دەکردەوە، بەڵام زۆر جار لەبەر گەرما هەناسەشم بۆ نەئەدرا، بەم شێوەیە ڕۆژم دەبردە سەر و خۆم سەرقاڵ دەکردەوە بە کتێبی فەرغەلییەوە بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، سوپاس بۆ خوا شەوان دەگەڕامەوە بۆ ناو ژیانی پێغەمبەر ﷺ ، بەڵام کە بەیانی هەڵدەسام هەموو گیانم جێگای هەڵمژینی خوێن بوو لە لایەن هاوڕێ مێشوولەکانی ژوورەکەم! زۆربەی کاتەکان بەهۆکاری خورانی لاشەم خەبەرم دەبووەوە دەگەڕامەوە.

سەرەتا کە گەڕامەوە ڕاغیب لە ناو دەوارەکە دانیشتبوو چاوەڕوانی دەکردم.

ڕاغیب: دەوارەکە دەگوازینەوە بۆ ناو شاری مەدینە بۆ ئەوەی هەر لە دەوارەکە دا بمێنینەوە، چونکە ئەم ناوچەیە دەبێتە سەربازگەی موشریکەکان ، چووینە ناو باخ و باخاتێک لە ناو مەدینە دا و دەوار هەڵدرا و ڕاغیب توانی ئەو جێگایە بەدەست بهێنێت.

ماکوان: جەنگی ئەحزاب دەستی پێ کردووە؟!

ڕاغیب: نا، سوپای موشریکەکان بەڕێگاوەیە بۆ ئەم ناوچەیە.

ماکوان: ئەی دەکرێت من و تۆ باشتر یەکتر بناسین؟ تۆ چی فەرغەلی و نومێری؟

ڕاغیب: جارێ کاتی ئەوەمان نییە، با بڕۆینە ناو ڕووداوەکان! دوایی من خۆمت پێ دەناسێنم.

ماکوان: زۆر باشە، بۆ منیش ڕووداوەکان زۆر گرنگە



# جەنگی ئەحزاب

ڕاغیب: ئەم جەنگە لە مێژووی موسڵمان بە گرنگترین جەنگ هەژمار دەکرێت لە شاری مەدینەدا، نەک لەبەر ئەوەی ١٠هەزار کەس کۆبوونەوە تا جەنگی موسڵمان بکەن، یاخود موسڵمان تێدا سەرکەوتوبوون، لەبەر ئەوەی جیاکەرەوەی دوو قۆناغی گرنگ بوو، دوو قۆناغی سەرەکی لە ژیانی موسڵماندا، لە مەدینەی پێغەمبەردا ﷺ.

ڕەوشەکە لە ناو شاری مەدینەدا پێش ئەحزاب هەمیشە لە دڵەڕاوکێ و دوودڵی و پلانی دوژمناندا بوو بە تایبەت یەهوود، مونافیقەکان و موشریکەکانی عەرەبیش بەگشتی، هەموو ئەم کۆمەڵانە خۆشکەری ئاگر و فووکردن بوون لە پشکۆی جەنگ، شاری مەدینە لەسەر ئاگر بوو، موسڵمان نەیاندەزانی پشوو چییە! هیچ کاتێکیان نەمابوو بۆ پشوودان.

ئەوەی هەموو ئەم مەکر و فێڵ و پلانانە لەناو دەبات جەنگی ئەحزابە، لە ژێر ناونیشانی قەزا و قەدەری خوا.

بۆیە بۆ هەموو موسڵمان و کۆمەڵ و دەوڵەتێکی ئیسلامی لێکۆڵینەوە لە جەنگی ئەحزاب زۆر پێویستە، بەتایبەت لە کات و زەمەنی ئێستاماندا (جیهانگیری) و هاوپەیمانی (ناتۆ) و ڕۆژئاوا بەگشتی.

کۆبوونەوەی هەموو ئەو حیزبانە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە حیزبی قورەیش و حیزبی یەهوود و حیزبی غەتەفان و حیزبە بچووکەکانی تری ناو تیرەکانی دوورگەی عەرەبی، بەڕاستی جەنگی حیزبەکان بوو دژی پێغەمبەری خوا ﷺ لێکچوونێکی زۆر گەورە هەیە لە نێوان ئێستا و ڕابردوومان، ئەوەش گرنگییەکی زۆرمان پێ دەبەخشێت کە بە سەرچاوەکان دا بگەڕێنینەوە، وانە و لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی جددی و بەرچاو بکەین بۆ ڕووداوەکانی ئەمڕۆ لەبەر ڕۆشنایی جەنگی ئەحزاب، چونکە بەڕاستی موعجیزەیە لە هەموو ڕوویەکەوە، لەگەڵ ئەوەی کە موعجیزەیە، بەڵام گونجاوە لەگەڵ ژیانی ئێستای موسڵمان بۆ هەستانەوەیان، گومانی تێدا نییە کە ژیانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێمە مەنهەجە و ڕێگایە، کە بەو ڕێگایەی ئەودا هەنگاو هەڵبێنینەوە، تاوەکو بتوانین ئەو ئەنجامەی جەنابیان دەستیان کەوتووە، ئێمەش دەستمان بکەوێت لە هەموو کات و زەمەن و جێگایەک دا، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت، هەرکەس لە ئێوە ژیان بکات و بژی دەبینێت کە ڕاجیاواز و ئیختلاف دەکەوێتە نێوان ئەم ئوممەتە بەگشتی و ئیختیلافەکەش زۆرە، بەڵام لەو کاتە دا دەست بگرن بە سوننەتەکەمەوە واتا بەو ڕێگا و جێگایەی من گرتوومەتەبەر، پاشان ڕێ و شوێنی پێنج خەلیفەی ڕاشدین (ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی و حەسەن) ئەم پێنج



هاوەڵە هاوەڵی تێکەیشتوو و پێگەیشتوون لە حوکمڕانی و دەسەڵات دا، هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: بە پەنجە و دەستان چنگ بەو ڕێگایەدا بکەن کە ئەوان گرتبوویان ئێوەش هەمان ڕێگا بگرنەبەر.

فنَّه مَن يَعِشْ منكم فسيَرَى اختِلافًا كثيرًا، فعليكم بسُنَّتي وسُنَّةِ الخُلَفاءِ الرَّاشِدينَ المَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عليها بالنَّواجِذِ[1]

کەواتە کە دەڵێن سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ یاخود (سیرەتی) پێغەمبەر ﷺ خەڵکی وا دەزانێت چیرۆکی ژیانی پێغەمبەرە ﷺ، ئێمە چیرۆک و حیکایەت ناگێڕینەوە، ئێمە باسی ژیانێک دەکەین لە موعجیزەوە نەخشە ڕێگای چارەسەری کێشەی موسڵمان و بگرە هەموو مرۆڤایەتییە، هەموو چرکە ساتێکی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێمە مەنهەجە.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە ڕاستە، شیکاری تۆ چییە (خاڵە ڕاغیب) بۆ ڕووداوەکانی جەنگی ئەحزاب و پێشەکی جەنگەکە چۆن هاتە پێش.

ڕاغیب: ویستم باسی ئەوەت بۆ بکەم, پێشەکی جەنگەکەت بۆ باس بکەم, با بەیەکەوە بڕۆینە ناو ڕووداوەکان، بزانین چی ڕوودەدات، هەموو ڕووداوەکانی ئەم جەنگە موعجیزەیە.

---

[1] ـ أخرجه مطولاً أبو داود (٤٦٠٧)، والترمذي (٢٦٧٦)، وابن ماجه (٤٤)، وأحمد (١٧١٤١) باختلاف يسير، وابن عبدالبر في ((جامع بيان العلم وفضله)) (٢٣٠٥) واللفظ له.



# پێشەکی جەنگی ئەحزاب

ڕاغیب: لەناو دەروون و ناخی جوولەکە بوغز و حیقد و ئیرەیی گەشەی سەندبوو بەتایبەتی ئەوانەی کە بەدەستی پێغەمبەر دەرکرابوون، مەبەستم (بەنی نەزیر)خوای پەروەردگار وەسف و پێناسەیان دەکات و دەفەرمووێت:

﴿۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ [المائدة]

واتە: دەبینی لەهەموو خەڵکی زیاتر، لەهەموو دوژمنان زیاتر هۆزی جوولەکە سەرسەختانە دوژمنایەتی ئیمانداران دەکەن، هەروەها ئەوانەش کە موشریک و هاوەڵپەرستن (دوژمنایەتی ئیمانداران دەکەن)، دەبینی ئەوانەی کە سۆزیان هەیە بۆ ئیمانداران ئەوانەن کە دەڵێن: ئێمە نەسرانین چونکە قەشەیان هەیە و خواپەرستییان تیایە و فیزاوی نین و خۆ بەگەورە دانانێن.

کەواتە سەختترین دوژمن دژی موسڵمان یەهوود و موشریکەکانن، ئاخر خۆ یەهوود تەنها بە ئیرەیی و ڕق کینەی واز ناهێنێت، بەڵکو هیوایەت و ئومێدیان هەمیشە لەسەر فیتنە و ئاشووب و کاری قێزەوون بو دژی موسڵمان، خۆشیان جەنگ ناکەن بەڵکو خەڵکی تر هان دەدەن دژی موسڵمانان.

هەربۆیە جوولەکەی بەنی نەزیر شاندێکی گەورەی پێکهێنا لەسەرکردەکانی کە بریتی بوون لە : (حوويیەی کوڕی ئەختەب، سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیق نەزیری، کینانەی کوڕی ڕەبیعی نەزیری) زۆری تر لە سەرکردەکانیان کە پێکهاتبوون لە ٢٥ کەس، شاندەکەیان ڕۆیشتن بۆ لای هەموو هۆزەکانی عەرەب، بۆ کۆکردنەوەیان دژی موسڵمان و جەنگ کردن لەگەڵیاندا، هەڵسان بە هاوپەیمانییەکی ترسناک و شەڕێکی زۆر گەورە لەگەڵ موسڵمان، ئامانجیان لە ناووبردنی هەموو موسڵمان بوو لە منداڵی ناو لانکەوە بۆ پیر و پەکەوتەکانیان، واتا جەنگێکی یەکلاکەرەوە بە تەواوەتی، سەرەتا شاندە شەیتانییەکەی یەهوود ڕۆیشتن بۆ لای قورەیش، لە نێوانیان دا گفتوگۆیەکی زۆر ترسناک ڕوویدا، شاندەکەی یەهوود زۆر بە ڕاشکاوانە داوایان لە موشریکی مەککە کرد کە خۆیان ئامادە بکەن و سوپا کۆبکەنەوە دژی موسڵمان بۆ سەر شاری مەدینە، لەسەر قورەیشە کە بتوانن هەموو هاوپەیمانەکانیان کۆبکەنەوە، یەهوودیش هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی هەموو هۆزەکانی تری عەرەب بۆ هاوکاری و سەرخستنی قورەیش لە دوور و نزیکی نیوەدوورگەی عەرەبییدا هەرچی موشریکە کۆیدەکاتەوە بۆ لێدانی موسڵمان.



لێرەدا قورەیش پرسیارێکی زۆر جوانی لە یەهوود کرد، داوایان کرد کە وەڵامەکەیان زۆر ڕاشکاوانە و ڕوونبێت و هەموو قیاداتی قورەیش گوێ بیستی بن، چونکە قورەیش لە گومان و دووڕیانێکدا بوون وەڵامیان دەست نەدەکەوت، لەناو خۆیاندا لە دوودڵی دا دەژیان، پرسیارەکەیان ئەوەبوو ئایا موسڵمان لەسەر دینی حەقن یان ئێمە بەو پێیەی ئەوان خاوەنی کتێبی ئاسمانین؟!

موشریکەکان توانای دۆزینەوەی وەڵامیان نییە، ئایا محەمەد لەسەر حەقە یان ئەوان، خۆشیان نازانن شوێن کام ئایینە بکەون، بەڵام ئەوان شوێن هەوا و ئارەزووی خۆیان کەوتوون تا ئەم ساتەوەختە، فیترەت و سروشتی خۆیان خراپ کردووە لە پێناو بەرژەوەندی و دەسەڵات و بازرگانی، لە کۆتاییدا بڕیاریان دا دژی ڕێباز و بەرنامەی خوا بجەنگن.

خۆیان بڕوایان بەو کار و مەنهەجە نییە کە لەسەری دەڕۆن، جیاوازییەکە خۆشیان هەستیان پێ دەکرد تەنانەت هێندەی پانتایی ئاسمان و زەوی بوو، لەکوێ خوایەک بپەرستی خوای هەموو کەون و گەردوونە و خالق و درووستکەری هەموو بوونەوەرە! لەکوێ لات و عووزا بپەرستی، کەچی وەڵامی یەهوود ئەوەبوو: مەنهەجی ئێوە ڕاسترە لە مەنهەجی محەمەد.[٢]

ماکوان: سوێند بەخوا مرۆڤ لە یەهوود سەری سووڕ دەمێنێت، چۆن هاوپەیمانی لەگەڵ بتپەرست و موشریک دەبەستێت واز لە موسڵمان دەهێنێت، کە ئیمانداران زۆر نزیکترن لە یەهوود، پێغەمبەری خوا ﷺ باش دەناسن و لە کتێبەکەیاندا باس کراوە یاخود بە پێچەوانەوە لە یەهوود سەرسووڕهێنەرتر کافرەکانی مەککەیە، خودی پێغەمبەر باش دەناسن و ڕەوشت و ڕاستگۆیی و هەموو هەڵسوکەوتێکی دەزانن، لە ناو خۆیاندا بووە، ئەمانەت و داوێنپاکی و دەستپاکی محەمەد باش دەزانن! چۆن ئاوا دژایەتی دەکەن؟! لەگەڵ یەهوود دەستیان تێکەڵ کردووە، دەشزانن کە یەهوود ئەهلی غەدر و خیانەتن.

ڕاغیب: خوای گەورە دەرحەقی ئەم گفتوگۆیەیان لە سورەتی النساء دەفەرموێت:

---

[٢] ـ قالوا لليهود: يامعشر يهود إنكم أهل الكتاب الأول و العلم مما أصبحنا نختلف فيه نحن و محمد، أحد بيننا خير أم دينه؟ لقد قالوا في وقاحة وجحود بل دينكم خير من دينه، وأنتم أولى بالحق منه.



﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾﴾

ئایا نابینی و سەرنج نادەی لەوانەی کە بەهرەیەکیان لە کتێبی ئاسمانی پێدراوە (لەگەڵ ئەوەشدا) باوەڕیان بە فاڵچی و جادووگەر و بت و پەیکەر هەیە. دەربارەی ئەوانەش کە کافرن دەڵێن: ئەوانە چاکترن و ڕێبازی ڕاستریان گرتووە لەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان (بە ئایینی ئیسلام هێناوە).

ئەو (جوولەکانە) کەسانێکن کە نەفرینی خوایان لەسەرە، ئەوەی خوا نەفرینی لێبکات، ئیتر هیچ کەست دەست ناکەوێت بیکەیتە پشتیوانی.

ماکوان: باسێکی ڕۆلی یەهوودم بۆ بکە لەم جەنگەدا و چییان کرد؟!

ڕاغیب: لە سێ خاڵدا دەتوانم بۆت کورت بکەمەوە کە چەندە کاری خراپ و قێزەونیان ئەنجام داوە و چۆن ئەو هۆزانەیان دژی موسلمانان کۆکردۆتەوە.

خاڵی یەکەم: ڕۆڵی یەهوود هەمیشە پلان و وەسوەسە و چاوبەستنی خەلکی و تەزویر و جوانکردنی ناشرینەکان بوو، بێجگە لە درۆ و ڕاهێنانی خەڵکی لەسەر خراپەکاری، ئەوەی لەو سەردەمدا توانیان بە ئاسانی بیکەن و خێرا دەستەکەیان بۆ خەڵکی ئاشکرا بوو، بەڵام لە دنیای ئەمڕۆ دا ئاڵۆزتر کارەکانیان ئەنجام ئەدەن، ئەویش لە ڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە هەموو جۆرەکان لە جیهاندا.

ئەوەی لێی کۆڵیوەتەوە لە ژیانی یەهوودییەکان دەزانێت چەندە گرنگی ئەدەن بە ڕاگەیاندن هەر لە ڕۆژنامە و گۆڤار و کەناڵی ئاسمانی و ئاژانسی هەواڵ و لاپەڕەکانی ئەنتەرنێت هەر لە ڕێگای ئەم کەرەستە ڕاگەیاندنانەوە چۆن بەویست و ئارەزووی خۆیان چۆنیان بوێت بیروباوەڕی خەڵکی دەگۆڕن.

هەر وەکو قورئان بۆی ئاشکراکردووین کە چۆن پروپاگەندە بڵاودەکەنەوە، خودی قورئانیش چۆن وەڵامیان ئەداتەوە، پێویستە لەسەر موسڵمان هەمان شێوە و میتۆدی قورئان بگرنەبەر بۆ وەڵام دانەوەی ڕاگەیاندن و چەواشەکاری یەهوود.

خاڵی دووەم: ڕۆڵی یەهوود لە هاوپەیمانی و دەست خستنە ناو دەستی موشریکەکان بۆ لێدانی موسڵمان لەکاتێک ئەوان هەموو بتپەرست بوون، لێرەوە لەوە دڵنیا دەبین کە هەموو کوفر و کافران ئەوانیش یەک میللەتن و دژی ئایینی خوای پەروەردگارن.



هەرچەندە یەهوود ئایینی ئاسمانییە و ئەوانیش بڕوایان بە یەهوود نییە، بەڵام هەرچی گرووپ و هۆز و حیزبەکانی عەرەبە کۆیان کردنەوە بۆ دژایەتی دینی خوا، ئەگەر چی جیاوازی پێناسە و ئایینیشیان هەبێت، بەڵام لە بەرامبەر موسڵماندا یەک دوژمنن، بۆ نموونە خۆ یەهوود و نەسارا هەردووکیان بە خوێنی سەری یەکتر تینوون و تاسەر ئێسقان دژی یەکترن، بەڵام بەرامبەر موسڵماندا خۆیان بە برا و پشتوپەنای یەکتر دەزانن، خوای گەورە لە سورەتی البقرةدا دەفەرمووێت:

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾﴾

واتە: جوولەکە دەڵێن: گاورەکان لەسەر هیچ بنەما و ڕاستییەک نین، گاورەکانیش دەڵێن جوولەکە لەسەر هیچ بنەماو ڕاستییەک نین، بەمەرجێک ئەوانە کتێبی (تەورات و ئینجیل دەخوێننەوە) هەروەها ئەوانەش کە هیچ نازانن (لە بتپەرستانی عەرەب) هەر وا دەڵێن و (بڕوایان بە ئیسلام و هیچ لایەکیان نییە) خوایش لە ڕۆژی قیامەتدا دادگایی دەکات لە نێوانیاندا و بڕیاری دروست لەسەر جیاوازییان دەدات.

لە کاتی جەنگ دژی موسڵمان دەبنە برا و هیچ جیاوازییان نامێنێت، ئەمەش زۆر پێویستە موسڵمان هەستی پێ بکەن لە کۆن و ئێستا و داهاتوودا!

خاڵی سێیەم: ڕۆڵی یەهوود لە جووڵەکردن بە قورەیش و کۆکردنەوەی هێزی تری عەرەب لە غەتەفان و کە گەیشتنە ١٠ هەزار سەرباز، بەڵام خۆیان ڕاستەوخۆ هیچ بەشدارییەکیان نەبوو تەنها لە ناچاریدا نەبێت لە کۆتاییدا، ئەم شێوەکارەی یەهوود لە ڕابردوودا کردوویەتی تا ئەم ساتەوەختەی ئێستاش بەردەوامە، لەو شێوە ئوسلوبەی هەیانە ئەوان سوپای تر دەجووڵێنن و خۆیان تەماشا دەکەن و وزە و توانای دەوڵەتانی تر بەکار دەهێنن، خۆیان نیشان نادەن، نەک لەبەر ئەوەی زیرەک و بەتوانا و خاوەنی سیاسەتن، بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆیان ترسنۆک و جەبانن و حەزیان بە ژیانە و ئاواتیان کۆکردنەوەی سەروەت و سامانە.

خوای پەروەردگار لە سورەتی البقرةدا دەفەرمووێت:



﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾

واتە: بەردەوام ئەم جوولەکانە دەبینیت کە لە هەموو خەڵکی زیاتر بە تەنگ دنیا و ژیانی دنیاوە دین هەتا بگرە لە هاوەڵپەرست و موشریکەکانیش، (جا ئەگەر ڕاستیان بکردایە) ئاواتیان نەدەخواست کە: هەزار ساڵ هەریەکەیان تەمەنی ببوایە، هەرچەندە وەنەبێ ئەو تەمەنە درێژە لە سزا ڕزگاریان بکا، خوایش زۆر بینایە بەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

موشریکەکان گیانی خۆیان ئەبەخشی و ماڵ و سەروەت خەرج دەکەن، یەهوود لە دوورەوە تەماشا دەکات و بە پەنجەکانی تەنها ئاماژە دەکات.

بەو شێوەیە قوڕەیش زۆر چالاکانە سوپای ئامادەکردو لەگەڵ هاوپەیمانەکانیاندا کەوتنە گفتوگۆ لە کینانە و توهامە و بەنی سولەیم، ئەوان ئێستا خاوەنی ٤ هەزار سەربازن بۆ جەنگی موسڵمان، بە پێچەوانەی قوڕەیش، غەتەفان زۆر ئارەزووی بە جەنگ نەبوو، چونکە لە شاری مەدینەوە زۆر دوور بوون، ئەو دوژمنایەتییە دوورو درێژەی کە قوڕەیش هەیبوو لەگەڵ موسڵماندا ئەوان نەیانبوو، بۆیە زۆر بەچالاکانە نەهاتن بەدەم یەهوودەوە، تەنانەت هەندێکیان باسی عەهد و پەیمانی خۆیان کرد لەگەڵ پێغەمبەردا . صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ

یەهوود وەکو پیشەی خۆی کەوتە درۆ و چەواشەکاری بۆ غەتەفان و پاشان دوای درۆکردن بەکارهێنانی پارە، ئەوەی بە ڕاگەیاندن و پڕووپاگەندە بیروباوەڕی ناگۆڕێت لەبەردەم پارە دا لاواز دەبێت، مامەڵەی یەهوود لەگەڵ غەتەفان وەکو سوپای مورتەزیقە بوون بە پارە بەکرێی گرتن.

بەروبوومی ساڵێکی تەواوی بەخشی بە غەتەفان لە بەروبوومی خەیبەر، لە بەرامبەر کۆکردنەوەی ٦ هەزار سەربازدا، ئەوانیش کە ئەو سەروەتە زۆرەیان خرایە بەرچاو دەستبەجێ هەڵسان بە کۆکردنەوەی سەرباز لەناو هۆز و عەشیرەت و تیرە جیاوازەکاندا.

سەرکردەکانی غەتەفان، بەدوای دنیا و سەروەت و سامانی یەهوود کەوتن، ئەگەر چی هەندێکیشیان پەیمانیان هەبوو لەگەڵ پێغەمبەردا.

تیرە و عەشیرەتەکانی ناو هۆزی غەتەفان زۆر بوون، لە کۆتاییدا توانیان لە ڕێگای (عویینەی کوڕی حوسەین) لە بەنی فەزارە، (حارسی کوڕی عەوف) لە بەنی موڕە (مەسعەری کوڕی ڕەقیلە) لە بەنی ئەشجەع و زۆری تر، ئەمانە لە ناسراوەکانی عەرەب بوون، بەڵی توانیان ئەو ژمارەیەی یەهوود دەیویست کۆی بکەنەوە ٦ هەزار سەرباز ئامادەکران.



لەگەڵ ئەوەی یەهوود زۆر ڕەزیل و چاوچنۆکن، بەڵام لە بواری ڕێگەگرتن لە دینی خوا ئامادەیە زۆر بە دڵفراوانی پارە ببەخشێت.

بۆ بەرهەڵستکاری بیروباوەڕی دروست و شێواندنی ئامادەن هەرچی بەرنامە و پرۆژە و کاری قێزەون و خراپەکاریی و وروژاندنی (شاز)، پارە وەکو لافاو دەبەخشن جا ئەگەر کەسێک حەقیقەتی یەهوود نەزانێت زۆر سەری سوڕ دەمینێت لە بەخشین و دڵفراوانی یەهوود.

بەهەر حاڵ ١٠ هەزار کەس بە فیتی یەهوود لە موشریکەکانی عەرەب کۆبوونەوە بۆ جەنگی موسڵمان، ژمارەیەکی بێشومارە، عەرەب شانازی بە ژمارەی هەزارەوە دەکرد، ئێستا ١٠ هەزار کەسی کۆکردۆتەوە لایان خەیاڵی بوو.

گومانی تێدا نییە ئەم هەواڵە گەیشتە خەڵکی شاری مەدینە ، تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەخت بوو ، بەڵام موسڵمان دەبێت باش لەوە تێبگەن کە خودای گەورە قورسی کرد و ئیبتیلا و بەڵای لەسەر موسڵمان زۆر کرد، ئەوە مانای سەرکەوتنی خوای پەروەردگار نزیکە، کە موسڵمان گەیشتنە لوتکەی ئازار و نارەحەتی، سەرکەوتن دەنێرێت خوای گەورە لەجێگا و ڕێگایەکەوە کە مرۆڤ هیچ کات خەیاڵیشی بۆی نەچووە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾﴾

[البقرة]

واتە: ئایا لاتان وایە هەروا بە ئاسانی دەچنە بەهەشتەوە (بێتەنگانە و ناخۆشی)؟ مەگەر نموونەی ئیماندارانی پێشووتان بۆ باس نەکراوە، کە تووشی شەڕ و ناخۆشی و تەنگانە و گرانی و نەداری بوون، تەکانیان خواردووە و زۆریان بۆ هاتووە بەڕادەیەک هەتا پێغەمبەرەکەیان و ئەوانەیکە باوەڕیان هێناوە لەگەڵیدا دەیانوت: باشە پەروەردگارەکەی سەرکەوتن دەبەخشێت؟ ئیتر کەی خوا یارمەتی دەنێرێت؟ ئاگادار بن و دڵنیابن بەڕاستی یارمەتی خوایی زۆر نزیکە.

مسوڵمانی خاوەن ئیمان و تێگەیشتوو لە سوننەتی خوای پەروەردگار لەم کەونەدا خێرا ئیمانی زیاد دەکات و دەزانێت ئەوە نیشانەی سەرکەوتنی موسڵمانە، موسڵمان لە شاری مەدینە کە ئەوەیان بینی زۆر بە ئاسایی وەریانگرت، چونکە پێشتر مامۆستاکەیان تێیگەیاندبوون، کە سوپایەک بەو زۆر و زەبەندییە نیشانەی سەرکەوتنی موسڵمانە و بۆیە تەنیا ئیمانیان زیادی کردوو وتیان خوا و پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ڕاستیان فەرمووە، یەقین و ئیمانیان زیاتر بوو بە خوای پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێت:



﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنٗا وَتَسۡلِيمٗا ﴿٢٢﴾﴾ [الأحزاب]

واتە: کاتێک ئیمانداران ئەو دەستە و گرۆهانەیان بینی و وتیان: ئەمە ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەرەکەی بەڵێنی پێداوین (کە ئاوا دژایەتی ئایینەکەی دەکرێت و کافرەکان و دووڕووەکان نەخشە و پیلان دەکێشن بۆ ڕیشەکێش کردنی)، دیارە کە خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو لە پێشهاتنیدا، بێگومان ئەو دژایەتییە باوەڕی ئیماندارانی ئەوەندەی تر زیاتر و پتەوتر کرد (واتە سوورتر بوون لەسەر ئیمان و دڵنیابوون لە سەرکەوتنی خوایی).

لەلایەکی ترەوە دووڕووەکانی مەدینە کە ئەو ڕەوشەیان بینی خێرا ترسیان لێنیشت و ئەژنۆیان شکا، چونکە مونافیق تەنها حیسابات بە وەرەقە و قەڵەم دەزانێت و ئەنجامی بۆ دەردەچێت، هیچ حیساباتێکی ئەوتۆیان نییە بۆ قودرەت و توانا و هێزی خوای پەروەردگار، تەنها عەقڵیان لە گەورە و بچوکدا بەکار دەهێنن، تەنها لە ڕووی ماددییەوە بونیادی حساباتی خۆیان ئەکەن کە ژمارەی موشریکەکانیان بیست وتیان ئەو ژمارەیە هیچ کەس توانای بەسەریدا نییە، هەرگیز شکست ناهێنن، توانامان بەسەریاندا نییە زۆر جیاوازین لە ڕووی سەربازییەوە، هەموو ئەم باس و خواستانە شیکاری ئەوان بوو.

خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت:

﴿وَإِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا ﴿١٢﴾﴾ [الأحزاب]

واتە: لەولاشەوە دووڕووەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشی و گومانی خراپی تێبوو دەیانوت: بەڵێنی خوا و پێغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەڵەتاندن بووا!

ئەمەش حەقیقەتی بیروبۆچوونی ئەوانە، ئەوەی لە دڵیان بوو بە گوفتاریش وتیان ئیتر لەو کاتەوە مونافیقەکان بە تەواوەتی کوفریان دەرکەوت، ئیتر بە تەواوەتی دەرکەوت کە مونافیقن بۆ خەڵکی بەگشتی و ترس ئەژنۆی شکاندبوون، خوای گەورە ئەفەرموێت:



﴿قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾﴾ [الأحزاب]

واتە: بەڕاستی خوا ئەو کەسانە دەناسێت کە کۆسپ و تەگەرە دروست دەکەن لەئێوە، ئەوانەی بە براکانیان دەڵێن وەرن بۆ لای ئێمە، (خۆتان بدزنەوە لە سوپای ئیمانداران)، ئەوانە تەنها کەم نەبێت خۆیان ناخەنە ناو تاڵوکەی جەنگەوە.

بەرامبەر ئێوە دەست نوقاو و بێ هیمەتن، جا کاتێک ترس و بیمی جەنگیان بۆ دێت ئەوە دەیانبینیت، تەماشات دەکەن، چاوەکانیان دەسووڕێتەوە و ئەبڵەق دەبێت وەک کەسێک لەترسی مەرگ بێهۆشی بەسەردا هاتبێت، جا کاتێک ئەو ترس و بیمە نەما، زمان درێژەکانیان ئازارتان دەدەن بەقسەی ڕەق و ناخۆش، لەکاتێکدا ئەوان چاوبرسی و بەهەڵپەن بۆ پارە، ئا ئەوانە باوەڕیان نەهێناوە، بەو هۆیەوە خوا کردەوەکانیان پووچ کردنەوە، ئەوکارەش هەمیشە بۆ خوا ئاسانە.

ئەوەش کاردانەوەی دووڕووەکان بوو.



# کۆکردنەوەی هێز بۆجەنگ لەلایەن موسڵمانەوە

ڕاغیب: کە موسڵمانان هەواڵیان زانی خێرا بە گرنگ وەریانگرت و دەستبەجێ بیریان لەوە کردەوە چۆن ڕووبەڕووی ئەو ڕەوشە ببنەوە، زۆر بە ئەرێنی وەریانگرت و دەست بەجێ مەجلیسی ڕاوێژ و شوورا ڕێکخرا، ئەمەش سەرەتایەکی ڕاست و تەندرووستە.

ئەگەر سەرنجی سوپای سەرکەوتوو بدەین، یەکەم کاری سوپای سەرکەوتوو بەستنی ڕاوێژ و شوورایە لەسەرەتای هەموو کارێکدا، ئەگەر تەماشای سوپای بەدر بکەین کە سوپایەکی سەرکەوتوو بوو یەکەم کاری بە ڕاوێژ بوو، کەواتە ئەمە شتێکی هەروا سەرپێیی و سادە نییە، بەڵکو سوننەتی خوای گەورەیە لەم کەونەدا مەجلیسی شوورا پێکهات بوو لە موهاجیرەکانی قورەیش و ئەنسارییەکانی مەدینە لە فارس و ڕۆم و حەبەشی، تەنها عەرەب بەشدار نەبوو لەناو ئەم مەجلیسە ڕاوێژەدا، نموونەی سەلمان لە دەوڵەتی فارسەوە هاتبوو، بیلال خەڵکی حەبەشە بوو، سوهەیب لە سریانی ڕۆم بوو، هەموو توانا و هێزێکی لە خۆی کۆکردبووەوە.

واتا هەموو جۆرە ڕەگەزێکی لە خۆگرتبوو، ئەمەش تواناى ئوممەتی ئیسلامی بەهێز کردووە بەدرێژایی ١٤ سەدە.



# بیرۆکەی خەندەق لەلایەن سەلمانی فارسی

ڕاغیب: لە چارەسەری کێشەی جەنگی ئەحزاب، هۆکاری سەرەکی لە دەرچوونی ئەو قەیرانە لەدەستی پیاوێکی فارس بوو، کە هیچ پەیوەندی بە عەرەبەوە نەبوو، بەڵام لە موسڵمانەکان بوو، بەڵکو بە هۆکاری وتەیەکی بوو بە ئالوبەیتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

ئەویش جارێک لە ناو ئەنسار و موهاجیرەکان دا دانیشتبوو، لەگەڵ ئەوەی کوڕی پاشایەکی فارسە، بەڵام شانازی بە ئیسلامەوە دەکرد، عەرەبەکانی مەدینە و مەککە باسی عەشیرەت و تیرەکانی خۆیان دەکرد کە ئەم کوڕی کێیە و نەسەبی چییە؟

هاتە سەر باسی سەلمان، سەلمان وتی من کوڕی ئیسلامم.

ئیتر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی (سەلمان لە ئێمەیە و ئالوبەیتە).

لە ناو مەجلیسەکەدا باسی ئەوە کرا چۆن ڕووبەڕوویان ببینەوە، ئیتر سەلمانی فارس ڕووی کردە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێی فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئێمە لە خاکی فارسدا ئەگەر گەمارۆ بدراینایە و هێرشمان لەسەر بوایە، خەندەقمان لێ ئەدا، کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بیرۆکەکەی گوێ لێبوو زۆری پێ باش بوو، بێ دوودڵی بڕیاری بیرۆکەی سەلمان درا بەلێندانی خەندەق.

ئەمەش واقیعیەتی مەنهەجی ئیسلامییە، موسڵمان لە مردن ناترسن بەڵام بەگوێرەی پێویست هێز و توانا کۆ دەکەنەوە بۆ ڕووبەڕووی دوژمن و لە کۆتاییدا تەوەکولیان بەخوای موتەعالە، بۆ هێزی موسڵمان تەنها خۆی ئەدا لە ٣ هەزار کەس، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موشریکی ئەحزاب، پێویستە خاوەنی پلان بن، چونکە موشریکەکان ١٠ هەزار کەسن، یەهوودی خەیبەر لەگەڵیان دا جەنگ بکات یاخود خەڵکانی تر.

ئەمە ڕاکردن نییە لە دەستیان، بەڵکو پاراستنی سوپاکەیە لەدەست سوپای زۆر و زەبەندی کوفر، هیچ تەنازولێک بۆ دوژمن ناکرێت، بەڵکو دوژمن دەخرێتە چوارچێوەی قەیرانێک کە ناتوانێت لێیدەربچێت، چونکە ئەوان دوورن لە ماڵ و سەروەت و سامان و خواردن و ئاویان، بۆیە زەمەن لە بەرژەوەندی موسڵمانە، هەتا درەنگ تر بکەون لە جەنگ سوپای دوژمن بەرەو فشار و داڕووخان دەڕوات، بە هەموو شێوەیەک بیرۆکەکەی زۆر نایاب بوو، دەستبەجێ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بیری لەوە کردەوە لەکوێدا خەندەق لێبدرێت، کۆمەڵێک هاوەڵی لەگەڵ خۆی برد لەوانەی کە لە ستراتیژی سەربازی شارەزان لە دەوری شاری مەدینەدا دەگەڕان،



کوێ گونجاوە بۆ هەڵکەندی خەندەق، سوپای سەرکەوتوو پێویستە هەموو هۆکارێک بگرێتە بەر.

پێغەمبەر ﷺ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای شاری مەدینەی پشکنی، زانی کە هەردوو جێگاکە پارێزراوە لە ڕووی سروشتییەوە هەموو گرد و شاخ و هەورازی بەرزە، پاشان تەماشای خواروری شاری مەدینەی کرد، بریتییە لە دارستانی خورما و قەڕەم و گژوگیای زۆر، هەرگیز سوپا لەوێوە بۆ جەنگ نایەت.

دەمێنێتەوە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی باکوور و باشوور، لە کۆتاییدا گەڕەک و ناوچەی (بەنی قورەیزە) کە لەنێوان ئەوان و پێغەمبەر دا ﷺ هاوپەیمانی هەیە و بەهیچ شێوەیەک هاوکاری قورەیش نابێت بکرێت، هەروەها هاوپەیمانی هەیە ئەگەر دوژمن هێرش بکاتە سەر شاری مەدینە هەربۆ ئەو مەبەستە و زیاتر دڵنیابوون، پێغەمبەر ﷺ خۆی پەیامی نارد بۆ جوولەکەی بەنی قورەیزە کە لەسەر وەعد و پەیمانی خۆیان ماون کە سوپای موشریک لە ڕێگای ئەوانەوە هێرش نەهێنن؟ ئەو دڵنیاییە زۆر گرنگ بوو، چونکە ئەگەر بێت و لەوێوە دزە بکاتە ناو شاری مەدینە، سوپای موسڵمان بەگشتی لەناودەچێت.



## پڕۆژ      ندەق لێدان

ڕاغیب: ئەوەی کە ماوەتەوە تەنها باکووری مەدینەیە کە کراوەیە بە درێژایی ١٢کم، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بڕیاری دا لەوێدا خەندەق لێبدرێت بۆ ئەوەی ناوچەی نێوان گەڕەکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای مەدینە بەتەواوەتی دابخرێت.

ئەم پڕۆژەیە بە حیساباتی دنیایی ئەستەمە، هیچ ئەقڵێک ناتوانێت قبووڵی بکات، قووڵی خەندەقەکە (٥)م لە هەندێک جێگا ئەگاتە (١٢-٨)م، درێژی خەندەقەکە ( ١٢)کم، پێوەری هەڵکەندنی ئەو خەندەقە یاخود چاڵ بەگشتی  سێ سەد هەزار مەتر چوارگۆشە دەکات.

پڕۆژەیەکی زۆر خەیاڵاوییە هەر چاڵێک کە هەڵدەکەندرێت هەتا قووڵبێتەوە کارکردن تێیدا زەحمەتتر دەبێت.

هەموو ئەم پڕۆژەیە لە ماوەی ٢ هەفتە دا تەواو بوو!

ژمارەی هەموو هاوەڵان ٣٠٠٠ هاوەڵ بوون، ناکرێت هەموو کاربکەن، هەندێک سەرقاڵ دەبن بە پاسەوانی و هەندێک نەخۆش و پەککەوتە و هەندێک لەوانە کار دەکەن، بەڵام گریمان هەموو بەیەکەوە کاردەکەن، زۆر ئەستەمە لە ماوەی دوو هەفتە دا ئەو مەشرووعە گەورەیە کۆتایی پێبێت، ئەگەر فریشتە هاوکاریان نەبووبێت، چونکە بە گشتی خاکی مەدینە خاکێکی بەردادوییە و خۆڵی زۆر کەمە، خۆ ئەگەر بە پێوەری ئامێری پێشکەوتووی ئێستا بێت بۆ ئەو کاتە زیاتر پێویستی بە (١٢٠) شۆفڵ و هەڵکەری زەوی و ئامێری زۆر گەورە هەیە ئەگەر تەواو بێت لەو کاتەدا، بە هەموو پێوەرێک لە توانای مرۆڤ دا نییە ئەو پڕۆژەیە لەو کاتە کەمە دا، لەکاتێکدا یەکەم جارە موسڵمان لە پڕۆژەیەکی وادا دەستبەکاربن.

کەواتە لە ڕووی ژیان و حساباتی دنیای ماددی، خەڵک بە خورافی دەزانێت بەڵام بەڕاستی ڕووی داوە، ئەوەش مانای ئیمانی ڕاستەقینە و دەسەڵاتی خوامان بۆ دەردەخات، هێزی خوای پەروەردگار و ناردنی سەربازانێک کە نەزاندراوە و بریتییە لە فریشتەکان، ئەم جۆرە کارانە هەمیشە بۆ موسڵمانی ڕاستەقینە لە هەموو کات و زەمەنێکدا دووبارە دەبێتەوە، لە هەموو کاتێک دا پێویستیمان بە کاری کۆمەڵسازی و هاوکاری و هاریکارییە تا بتوانین پڕۆژەکانمان سەرکەوتوو بێت، خۆ ئەگەر کافر و موشریک بە کۆمەڵ کارەکان ئەنجام بدەن سەردەکەون، ئەی ئەگەر موسڵمان ئەنجامی بدەن ئەوە خوای گەورە بەرەکەتی زیاتر دەخاتە ناو کارەکانیان.

پێغەمبەر خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ کاری کۆمەڵکاری چەند هەنگاوێکی نا کە لە چوار خاڵدا کۆ دەبێتەوە.



یەکەم: بەشداریکردنی سەرکردە لەگەڵ سەربازەکانیدا، ئەگەر سەرکردە وەکو سەربازەکانی مامەڵەی کرد و خۆی وەکو ئەوان نیشاندا، ئەوە بە دڵنیاییەوە سەربازەکانی هەموو توانا و هێزی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ سەرکەوتنی پڕۆژەکانیان، نەک لەبەر ئەوەی لە سەرکردەکەیان دەترسن، بەڵکو هەست بەوە دەکەن کە خاوەنی کێشەیەکی ڕەوان و لەگەڵ سەرکردەکەیاندا هاوبەشن.

لەبەر ئەوە پێغەمبەرمان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بینی لەناویاندا کاری دەکرد و کە خۆی حاکمی دەوڵەت و سەرۆکی هەموو هێزی چەکدارەکانە و لێپرسراوی هەموو سوپایە، خۆی خەندەق لێئەدات و چاڵ هەڵدەکەنێت و پاچ دەوەشێنێت و خۆڵ بە شانی لادەبات جلەکانی داکەندووە، سکی ڕووتە بۆ ئەوەی جلەکانی نەبێتە هۆکاری ماندووکردنی زیاتری، ئەوە پێغەمبەری خودایە، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سوپاکەی برسی بوو خۆی لەوان زیاتر برسی بوو.



ئەبوتەڵحەی ئەنساری هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ برسیمانە و هەموو هاوەڵان سکاڵایان هەیە لە تاو سکیان بەردیان بەسکیانەوە بەستووە!

هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەردی سکیان نیشانی پێغەمبەر دا، پێغەمبەریش ﷺ سکی موبارەکی خۆی بۆ دەرخستن دوو بەردی بە سکییەوە بەستبوو، ئەگەر گەل و میللەت برسین ئەوا سەرکردە وەکو ئەوان دەژی و لەوانیش برسیترە، بەئازاری میللەتەکەی دەزانێت.

بۆچی کاری کۆمەڵکاری لە ئێستادا سەرکەوتوو نابێت، ئێستا سەرکردە سێ ژن و چوار ژن دەهێنن و سەرباز و میللەتەکەی نەک پارەی ژنی نییە بەڵکو پارەی ژیانیشی پێ نییە، خۆ بە درووشم و قسەکردن نابێت، دەبێت لە واقیعدا ببینرێت، بەداخەوە ئێستا میللەت لە زەحمەت کێشاندان، بەڵام قیادات لە نیعمەت و خۆشیدا دەژین ئیتر چۆن کاری بەکۆمەڵ سەرکەوتوو دەبێت.

هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بەناوی (جابری کوڕی عەبدووڵلا)[٣] دەڵێت هەستم بە برسێتی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە زۆری برسییە، لە ماڵەوە چەند پارچە گۆشت و چەند نانی وشکمان هەبوو، بەشی دووکەس یان سێ کەسی بکردایە، دەڵێت چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و عەرزم کرد، ئەزانم جەنابت لە هەموویان زیاتر برسیتریت، جا بۆیە حەز دەکەم جەنابت لەگەڵ دوو هاوەڵی تر تەشریف بهێنیت بۆ ماڵمان بۆ نانخواردن، ئەڵێت: کە وام بە پێغەمبەر ﷺ وت ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاواری کرد لە خەندەقەکەدا وتی ئەی هاوەڵان جابری براتان نانی بۆ درووست کردوون لای ئەو میوانداری دەکرێن!

جابر بەڕاکردن هاتەوە بۆ لای خێزانی، بەخێزانی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئەهلی خەندەقی بانگ کردووە بۆ ماڵی ئێمە!

ژنەکەی جابر وتی: ئەی عەرزی پێغەمبەرت ﷺ کردووە کە خواردنەکەمان بەشی دوو کەس یان سێ کەس دەکات!

ئەویش وتی بەڵێ.

---

[٣] ـ جابر بن عبدالله.



ژنەکەی وتی: (الله ورسوله أعلم) خوا و پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باشتر دەزانن، تەماشای ئەو یەقین و ئیمانە بکە.

ئەو ڕۆژە ئەوەی کاری لە خەندەق دا دەکرد (١٠٠٠) کەس دەبوون، ١٠ کەس ١٠ کەس بانگی دەکردن بە ١٠٠ جار هەموویانی تێر کرد و بە موعجیزە هەموو ئەهلی خەندەق بە چاوی خۆیان ئەو موعخیزەیان بینی، خۆشترین خواردنیان خوارد ، ئیتر چۆن کار ناکەن و ئەترسن لە ١٠ هەزار سەربازی کوفر کە ئەوان بەو شێوەیە موعجیزە ببینن.

لە کۆتایی هەمووان دا پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نانی خوارد، ئەم خۆنەویستییە و هەستی بەرپرسیارێتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زیاتر ئەوان هان ئەدات بۆ کاردن.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خەمی خۆی نەبوو، بەڵکو خەمی ئوممەتەکەی بوو.

دووەم: بەگەرخستنی توانا و وزەی هەمووان بۆ کاری کۆمەڵسازی زۆر جار کە کاری کۆمەڵی موسڵمان فەشەل دەهێنێت، بە هۆکاری ئەوەیە کە قورسایی لەسەر شانی هەندێک خەڵکی کەمە و ئەوانیتر هەموویان تەماشایان دەکەن و هاوکارنین لەگەڵیان دا، ئەمەش هۆکاری ئەوەیە کە سەرکردەی لێهاتوو توانای ئەوەی هەیە کە کار بۆ هەموو سەربازەکانی بدۆزێتەوە، بەگوێرەی توانا و وزەی سەربازەکان.

کەسێکت نەدەبینی لە شاری مەدینە تایبەت بێت، هەموو وەکو یەک کاریان دەکرد لە نێوان چل هەنگاو دا پیاوێکی لێبوو کاری دەکرد، بەم شێوەیە هەموو بەشدار بوون، بە باشترین شێوە کاری یەکتریان تەواو دەکرد.

سێیەم: کارکردن و ئیدارەیەک لە ژێر چاودێری و بڕیار و کاری جددی و خۆشەویستی و ڕێزدا.

لە هەموو کارێکدا کە کۆمەڵێک پێی هەڵدەستن پێویستە چوارچێوەیەکی ئیداری هەبێت، جیاوازی لە نێوان خەڵکی دا نەکات و دادپەروەربێت و ڕێزی گەورە و بچوکی تێیدا پارێزراو بێت، هیچ کارێکی کۆمەڵکاری بێ ئەمیر نابێت، هیچ ئەمیرێکیش کارانییە هەتا گوێ ڕایەڵی نەکرێت، ئەگەر گوێ ڕایەڵی نەما هیچ کارێک سەرناگرێت، بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموویانی وا فێرکردبوو کە ئەوەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکات گوێڕایەڵی خوای کردووە، بە پێچەوانەوە سەرپێچی بکات سەرپێچی خوای پەروەردگاری



کردووە، ئەوەی گوێڕایەڵی ئەمیر بکات گوێڕایەڵی پێغەمبەری کردووە، بە پێچەوانەوە سەرپێچی پێغەمبەری کردووە.[٤]

هەروەها خوای پەروەردگار لەبارەی ئیدارەی خەندەقەوە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾﴾ [النور]

بە ڕاستی ئیمانداران ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوە بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی و هەر کاتێک کۆ دەبنەوە لە خزمەتیدا بۆ کارێکی گرنگ و پێویست کە هاوکاریی دەوێت، ناڕۆن و (خۆیان نادزنەوە) هەتا مۆڵەت نەخوازن، بە ڕاستی ئەوانەی کە مۆڵەتت لێ دەخوازن هەر ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هەیە، هەر کاتێک بۆ کارێکی تایبەتی خۆیان داوای مۆڵەتیان لێکردیت، ئەوە مۆڵەتی ئەوانە بدە کە دەتەوێت و داوای لێخۆشبوونیشیان لە خوا بۆ بکە، بە ڕاستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

هاوەڵان خۆیان نەدەدزییەوە لە کارکردن، هەرکەس بێت و داوای گەڕانەوە بۆ ماڵ بکات ئەمەش مانای وانییە دیکتاتۆرییە، نەخێر بەڵکو هەموو کارەکەیان بەکاری خۆیان دەزانی، پێغەمبەری خوا یارمەتی هەندێک هاوەڵی ئەدا بۆ کاری گرنگی خۆیان بەواتای ئەوەی کاری زۆرەملێ و فەرمانی سەربازی سەخت نەبووە، هەموو هاوەڵان هەستی بەرپرسیارێتیان بۆ درووست بووە.

ئەمەش بە هۆکاری نەرم و نیانی و ڕێزی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ بۆ گەورە و بچووک، هاوەڵان و پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو بەدەم کارکردنەوە سروود و هۆنراوەی عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەیان دەوتەوە، هەموو دەیان وت:

اللهم لولا أنت ما اهتدينا — ولا تصدقنا ولا صلينا

فأنزلن سكينة علينا — وثبت الأقدام إن لاقينا

إن الالى قد بغوا علينا — وإن أرادوا فتنة أبينا

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٤ ـ مَن أطاعني فقد أطاع اللهَ ومَن عصاني فقد عصى اللهَ ومَن أطاع الأميرَ فقد أطاعني ومَن عصى الأميرَ فقد عصاني.صحيح البخاري، رقم ٧١٣٧.



هەموو بەیەک دەنگ ئەم هۆنراوەیان کردبوو بە سروود

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی بەرز دەکردەوە و دەیفەرموو:

اللهم لا العيش الا عيش الآخرة فاغفر للأنصار والمهاجرة.

هاوەڵانیش وەڵامی پێغەمبەریان ئەدایەوە و ئەیان وت:

نحن الَّذين بايعوا محەمەدا على الجهاد مابقينا أبدا

بەم جۆرە لە ژینگەیەکی پڕ خۆشەویستی و برایەتی پڕ لە ڕێکخستن و هێز، بەو پەڕی جوانی پڕ لە سۆز و هەستی یەک جەستەیی و خۆشحاڵی هەموو بەشداربوون لە هەڵکەندنی خەندەق، بەم شێوەیە کاری کۆمەڵکاری سەردەکەوێت.

چوارەم: بەرزکردنەوەی ئاستی دەروونی و هیمەت و ڕوواندنی ئومێد و هیوا بە ئەنجامدانی کارەکەیان، هاوەڵان بە گشتی لە هەموو کارەکانیاندا خاوەن هیمەت و بەرزی ناخ و هەمیشە خاوەن ئومێد و هیوابوون، دەیانزانی کارکردن لە خەندەق نیشانەی سەرکەوتنیانە، چونکە لەم جەنگەدا ئەگەر سەربکەون، بەسەر هەموو عەرەبدا سەرکەوتوون نەک هۆزێک و دوو هۆز، بەڵکو هیوای ئەوە لە ناو دڵیاندا ڕوابوو کەدەبێت بەسەر هەموو جیهاندا سەربکەون!

چونکە پێغەمبەرەکەیان ئەو هیوا و ئومێد و هیمەتی لە دڵ و دەروونیاندا ڕواندبوون، لەکاتی هەڵکەندنی خەندەق بەردێکی گەورە هەموو هاوەڵانی ماندوو کردبوو، پێغەمبەری خوا جەنابیان خۆی تەشوێ و پاچی هەڵگرت بۆ شکاندنی بەردەکە و فەرمووی بەناوی خوا، دانەیەکی کێشا بە بەردەکە سێ یەکی بەردەکەی شکاند و فەرمووی الله اکبر، خوای گەورە کلیلی دەرگای قەڵاکانی شامی پێیبەخشیم، سوێند بەخوا لێرەوە چاوم لە باڵەخانە و بینا بەرزە سوورەکانیەتی. پاشان فەرمووی بەناوی خوا، جارێکی تر کێشای بە بەردەکەدا سێیەکی تری شکاند و فەرمووی الله اکبر، خوای گەورە کلیلی دەرگای قەڵای فارسی پێبەخشیم، سوێند بەخوا لەم جێگایەوە چاوم لە باڵەخانە سپیەکانی فارسە. بۆ جاری سێیەم فەرمووی بەناوی خوا، کێشای بە بەردەکەدا بەردەکەی هەموو شکاند و فەرمووی الله اکبر، خوای گەورە کلیلی یەمەنی پێبەخشی ، سوێند بەخوای گەورە لێرەوە چاوم لە دەرگای شاری صەنعایە[٥]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥] ـ (قال النبي (ص) وَهوَ يَضرِبُ صَخْرَةصَعْبَة اعْتَرَضتِ الصَّحابَة: فَأخَذَ المعْول, فَقَالَ بِسْمِ الله ,فَضَرَبَهُ ضَرْبَةً فَكَسَر ثُلثَ الحَجَر, فَقَالَ: الله أكْبَر أعْطَيْتُ مَفَاتِيحَ الشَّامِ وَالله انِّي لأبْصُرُ قُصُورَهَا الحُمْر مِنْ مَكاني هَذا. ثُمَّ قَالَ بِسْمِ اللهِ وَضَرَبَ أخْرى فَكَسَرَ ثُلُثَ الْحَجَرِ, فَقَالَ: ألله أكْبَر أعْطيتُ مَفَاتيحَ فَارس وَالله انِّي لأبْصُرُ المَوَائِنَ أبْصُر قَصْرَهَا الأَبْيَض مِن مَكَانِي هَذَا, ثُمَّ قَالَ بِسْمِ الله, وَضَرَبَ ضَرْبَةً أخْرى فَقَلَعَ بَقيَةَ الْحَجَرِ فَقَالَ: ألله أكْبَر أعْطَيْتُ مَفَاتِيحَ الْيَمَنِ وَالله انِّي لأبْصُرُ أبْوابَ صَنْعَاءَ مِنْ مَكَانِي).



بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فێرمان دەکات کە خەونەکانمان گەورە بکەین ئامانجەکانمان فراوان بکەین، ترسیان ئەم گەمارۆیە نییە، کاتییە و دەڕوات و ئاوا دەبێت، یان ئامانج ئەو دەوڵەتە بچووکە نییە لە شاری مەدینە، بەڵکو ئاوات و هیوا و ئامانجەکە زۆر گەورەترە بەڵکو هەموو جیهان بە گشتییە و کار بۆ ئەوە دەکەین کە بانگەوازمان بگاتە هەموو جیهان.

خەڵکی لە ئاگری دۆزەخ دووربخەینەوە و نووری ئیسلام بگەیەنینە هەموو کون و کەلەبەری دونیا بۆ ئەوەی ڕووناکی بکاتەوە.

ئەمەش هیوای هاوەڵان بوو بۆیە لە خەندەقدا، سەرکەوتوو بوون کە پرۆژەیەکی زەبەلاح بوو.

هیچ نائومێدییەک ڕووی نەکردە هاوەڵان، تەنانەت بۆ چرکەساتێک تووشی بێهیوایی نەبوون، بەڵکو لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا لەماوەی دوو هەفتەدا خەندەق تەواو بوو پرۆژەکەیان سەرکەوت، چاوەڕوانی جەنگ بوون پێغەمبەری خوا ﷺ دوای تەواوبوونی خەندەق هەموو هاوەڵانی کۆکردەوە کە بریتیبوون لە سێ هەزار هاوەڵ، سوپای ڕێکخست لەسەر خەندەق و هێزی بەرگری و هێزەکانی دابەش کرد و خاڵی پاسەوانی لە ناو شار و دەروازەکاندا دانا و شاری بەتەواوەتی قاییم کرد، خەندەقی وا بە گرنگی پاسەوانی لەسەر دانا کە بەهیچ شێوەیەک کەس نەتوانێت تێپەڕی بکات.



# سوپای موشریک گەیشتە سنووری مەدینە

ڕاغیب: لە مانگی شەوالی ساڵی ٥ کۆچی سوپای موشریک گەیشتە سنووری شاری مەدینە کە بریتی بوون لە ١٠ هەزار سەربازی قورەیش و غەتەفان و بەنی سولەیم...هتد.

بۆ عەرەب شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو کە تووشی خەندەق بوون، ئەم جۆرە پلانە عەرەب هەرگیز نەیزانیوە، لە هونەری جەنگی ئەواندا نەبووە، خۆیان بۆ هەموو ڕووبەڕووبونەوەیەکی موسڵمان ئامادە کردبوو بێجگە لە خەندەق، تووشی شۆک بوون کە خەندەقیان بینی چ پڕۆژەیەکی گەورەیە.

ئینجا موسڵمان کەوتنە هەڵدانی تیر بۆ موشریکەکان، موشریکەکان نەیان ئەتوانی هەنگاو هەڵبهێنن بۆ تێپەڕاندنی خەندەق، هەرچییان دەکرد توانای پەڕینەوەیان نەبوو، موشریکەکان هەوڵی زۆریان دا و تواناکانیان خەست کردەوە، بەڵام هەر نەیانتوانی تا لە ئێوارەیەکی درەنگ دا هەندێک لە سوپای موشریک توانیان لە جێگایەکی تەسکی خەندەقەوە بپەڕنەوە بەرەی موسوڵمانان بۆ جەنگ کردن، هێزێکی بەتوانا بوو کەسێک سەرپەرشتی دەکرد ناسرابوو بە قارەمانی عەرەب ناوی (عەمری کوڕی عەبد لوەدود)[٦] بوو لەگەڵیدا سەرکردە عیکرەمەی کوڕی ئەبوجەهلیان لەگەڵ بوو هەروەها (ضراری کوڕی خەطاب)، بەڵام دەست بەجێ موسڵمان بۆیان دەرپەڕین، جەنگێکی مەیدانی زۆر خەست لە نێوان (علی کوڕی ئەبو تاڵیب) و (عەمری کوڕی عەبدول لوەدود) دا ڕوویدا، قارەمانی ئیسلام عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب قارەمانی عەرەبی کوشت، پاشان لە دوای کوشتنی عەمر لەلایەن ئیمامی عەلییەوە ئەوانیتر هەموو ڕایان کرد.

چەند جاریتر زۆر هەوڵیان دا لەو جێگایەوە بێنە ناو موسڵمان، زیاد لە دە جار هەوڵیان دا، بەڵام سەرکردەی لێهاتوو (ئوسەیدی کوڕی حوزەیر)[٧] نەیهێشت یەک هەنگاو بێنە پێشەوە، کەتیبەیەکی موسڵمان کە بریتی بوو لە ٢٠٠ موهاجیر، بە تەواوەتی هەموو سریەکەی خالیدی کوڕی وەلیدیان شکاندو بە ملشۆڕی گەڕانەوە دواوە تواناییان نەبوو هیچ کارێک بکەن.

ماوەی یەک مانگ جەنگ بەردەوام بوو لەماوەی ئەو مانگەدا یەکێک لە ڕۆژەکان هێرشەکانیان چڕ کردەوە لەسەر موسڵمان، کافرەکان لە کاتی نوێژی عەسر هەتا وەکو نوێژی مەغریب، موسڵمانەکان نوێژەکەیان لە دەست چوو واتا نوێژی عەسریان لە دەست دا هاوەڵان زۆر بەوە نارەحەت بوون، بەڵام چارەیان نەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦] ـ عمرو بن عبدالودود.

[٧] ـ أسيد بن حضير.



خوای پەروەردگار ماڵ و گۆڕەکانیان پڕ بکە لە ئاگر کە چۆن سەرقاڵیان کردین نوێژی عەسرمان لەدەست چوو تا ڕۆژ ئاوابوو .[٨]

بۆ ڕۆژی دواتر ئەوەندە هێرشیان هێنا موسڵمان نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریبیان لەدەست دا و هەموویان لەگەڵ عیشادا بەیەکەوە کۆکردەوە، نوێژەکانیان کرد واتا هەر چوار نوێژەکە بەیەکەوە لە کاتی نوێژی عیشادا بەرگرییەکی زۆر چالاکانە و سەختیان کرد، چەند هاوەڵێک بریندار و شەهید بوون لەو بەرگرییەدا، گەمارۆ هەر بەردەوام بوو.

ئەم ڕەوشە ڕۆژێک و دوو ڕۆژ و هەفتەیەک نەبوو بەڵکو مانگێکی ڕێک بەردەوام بوو کافرەکان بەتەواوەتی ماندوو بوون توانایان نەما بەهیچ شێوەیەک لە خەندەق بپەڕنەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴿١٠٥﴾﴾ [النساء]

واتە: ئێمە بەڕاستی قورئانمان بۆ تۆ ڕەوانە کردووە، سەرتاپای حەقیقەت و ڕاستەقینەیە بۆ ئەوەی دادوەری بکەی لە نێوان خەڵکی دا بەو شێوەیەی کە خوا نیشانی داوی، نەکەیت بەرگری لە ناپاکان بکەیت.

هیچ چارەیەکیان نەما ناچار بوون بڕیاری گەڕانەوە بدەن، بەڵام یەهوود ئەو هەموو سوپایەی کۆکردۆتەوە هەروا بە ئاسانی واز ناهێنێت، تا بەتەواوەتی موسوڵمانان لەناو نەبات، یەهوود بیریان کردەوە بەتایبەت سەرۆکی بەنی نەزیر، (حوییەی کوڕی ئەختەب) لەگەڵ سوپای موشریکەکاندا بوو، کەسێکی کافر و حاقید و پڕ بوغز و قین بوو بەرامبەر موسڵمان، وتی: ڕێگایەکی ترمان ماوە ئەویش تاکە ڕێگای دەرچوونمانە لەم قەیرانی خەندەقە، ئەویش بەنی قورەیزەیە.

---

[٨] ـ ملأ الله عَلَيْهِم بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ ناراً كَمَا شَغَلُونَاعَنِ الصَّلاةِ اوسْطى حَتّى غَابَتِ الشَّمس) رواه البخاري.



# خیانەتی بەنی قورەیزە

ڕاغیب: هەر وەکو باسمان کرد بەنی قورەیزە وەعد و پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا هەبوو، ئەوان گەڕەک قەڵا وماڵیان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی مەدینە بوو، خۆ ئەگەر لای ئەوانە دەرگایان بۆ سوپای ئەحزاب بکرێتەوە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا هەموو شاری مەدینە لە ناو دەچێت.

ئەی چی دەڵێیت هێزی ئەوان بچێتە سەر هێزی موشریکەکان و لەو ڕێگەیەوە جەنگ لەگەڵ موسڵمان بکەن، موشریکەکان بیرۆکەکەیان زۆر بەدڵ بوو کە حوییەی کوڕی ئەختەب بۆیانی باس کرد کە ئەو دەڕوات گفتوگۆ لەگەڵ بەنی قورەیزە دەکات.

حوییەی کوڕی ئەختەب ڕۆیشتە ناو شاری مەدینە بە نهێنی و توانی خۆی بگەیەنێتە ناو قەڵا و بارەگای بەنی قورەیزە و لەگەڵ گەورەی بەنی قورەیزە کەوتە گفتوگۆ و پێی وت: هەموو قورەیش و غەتەفانم کۆکردۆتەوە بە سەرکردەکانییەوە، پەیمانیان داومەتێ کە تا هەموو موسڵمان لەناو نەبەین ناگەڕێینەوە، جا ئەمڕۆ ڕۆژی عیزەتی ئێمەیە با کارەکەمان لەدەست دەرنەچێت!؟

سەرۆکی بەنی قورەیزە بەناوی (کەعبی کوڕی ئەسەد) وتی: وەڵاهی سوێند بەخوا ڕۆژی نەهامەتی و زەلیلیت بۆ هێناوم، حوییەی وازمان لێبهێنە، ماڵ کاول من لە چاک و ڕاستگۆیی و وەفا هیچی ترم لە محەمەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نەبینیووە.

بەڵام حوییەی هەر وازی لێ نەهێنا دەیویست ڕازی بکات، لە کۆتاییدا ڕازی کرد، کە لە ناو قەڵاکەیدا دەمێنێتەوە تا قورەیش و غەتەفان هەموو موسڵمان لەناو دەبەن، حوییەی کوڕی ئەختەب لەناو قەڵاکەیدا دەرناچێت.

هەرچۆن بوو شەیتانی بەنی نەزیر، شەیتانی بەنی قورەیزەی ڕازی کرد کە هاوپەیمانی لەگەڵ موشریکدا بکات دەرگا بکاتەوە بۆ موشریکەکان بڕۆنە ناو شاری مەدینە.

خۆ ئەگەر ئەو دەهەزار سەربازە بتوانن بڕۆنە ناو شاری مەدینە لەگەڵ بەنی قورەیزە ئەوا بەتەواوەتی موسڵمان هەموو لە ناو دەچن.

پێویستە ئەو خیانەتەی بەنی قورەیزە بەهەند لەبەر چاو بگرین، چونکە دوایی کاردانەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَی بە شوێن دادێت.



چاو و موخابەراتی ئیسلامی دەست بەجێ هەواڵەکەی زانی و هەواڵ گەیشتە پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەر ﷺ هیچ متمانەی بە یەهوود نەبوو چونکە دەیزانی خیانەتکار و پەیمان شکێنن.

ماکوان: جاباشە پێم بڵێ ڕاغیبی برام، یەهوود کەی خاوەنی وەعد و پەیمان بوون بە سەدان جار وەعد و پەیمانیان شکاندووە، خۆ ئەمە بە سوودفە(ڕێکەوت) نییە هەروا خۆڕسک نەبووە جارێک نا دووجار، ئەوە بەنی قورەیزە ئەوە بەنی قەینووقاع و بەنی نەزیر، جارێ خەیبەر و قەڵا لەولاوە بوەستن و لە دنیای ئەمڕۆشدا جوولەکەی دونیا بەتایبەت سەهیۆنی جیهانی لە وڵاتی فەلەستین.

من بڕوام وایە ئەوە واقعی ئەوانە و دەبێت هەرگیز بڕوامان پێیان نەبێت.

خوای گەورە باسیان دەکا و دەفەرمووێت:

﴿أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُواْ عَهۡدٗا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ [البقرة]

واتە: هەرجارێک پەیمان ببەستن (لەگەڵ خوا و پێغەمبەر و موسوڵماناندا) خێرا دەستەیەکیان پەیمانەکەیان شکاندووە، بەڵکوو زۆربەی زۆریان بڕوایان نییە (بەڕێز و قەدری پەیمان و ئیمان).

ڕاغیب: زۆر ڕاستە، ئەمانە ئەهلی غەدر و خیانەت و درۆ و کاری قێزەونن.

هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ زیاتر و دڵنیابوون سەعدی کوڕی عەبادە و سەعدی کوڕی موعازی نارد لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەە و چەند هاوەڵێکی تر، فەرمووی بڕۆن لێکۆڵینەوە بکەن و بزانن هۆزی بەنی قورەیزە خیانەتیان کردووە، خۆ ئەگەر ڕاست بوو لەبەر چاوی خەڵکیدا بۆم باس مەکەن، تەنها بە ئیشارەتی پەنجە بڵێن، ئەگەر وانەبوو دەنگ بەرزبکەنەوە و بڵێن بەنی قووڕەیزە لەسەر وەعد و وەفای خۆیانن.[٩]

حیکمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوە دابوو کە فەرمووی بە نهێنی پێم بڵێن ئەگەر خاوەنی خیانەتەکە بوون، ئەوەش قیادەی لێوەشاوە و زیرەک ئەنجامی ئەدات، نەک وەکو ئێستا هەرچی پرووپاگەندەی دوژمنە وای کردووە موسڵمانی ترساندووە لە فیلم و تەلەفیزیۆن، هەموو ئامێر و دەزگاکان چۆتە ماڵی موسڵمان کە ئەو پڕوپاگەندانەی دوژمن و هێزی ئەوان دەبینێت دەڵێت ئیتر هیوای سەرکەوتن نەماوە!

---

٩ ـ (انْطَلِقوا حَتَّى تَنْظُرُوا أحَقٌّ مَا بَلَغنا عَنْ هَؤلاءِ أمْ لا؟ فَان كَانَ حَقاً فَالْحَنوا لي لَحْناً أعْرِفُهُ وَلا تَفُتُوا في أعْضادِ النَّاس، وَانْ كَانوا عَلَى الْوَفَاء فَاجْهَروا بِهِ النّاس).



کۆمەڵێک وەکو وەفد چوونە لای بەنی قورەیزە بۆ ئەوەی قسەیان لەگەڵ بکەن لەسەر ئەو هەواڵە ئایا ڕاستە یان لەسەر پەیمانی خۆیانن!؟

بەڵکو یەهوودی بەنی قورەیزە سوپای ئامادە کردبوو بۆ لێدانی موسڵمان و بە ئاشکرا بەدەنگی بەرز جنێویان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەدا، دەیان وت: پێغەمبەری چی و هیچ عەقد و پەیمانێک لە نێوانمان دا نییە، بە محەمەدیش ڕابگەیەنن جەنگ دەکەین، هەر لەدوای ڕۆشتنی وەفدەکە ٧٠ سەربازیان خستە ناو شاری مەدینە و دەستیان کرد بە کوشتنی ژن و منداڵ لەناو شاری مەدینە دا.

هاوەڵان بەپەلە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، وتیان: عەزەل و قارە (عضل و قارة) ئەو نهێنییەیان بەکار هێنا واتا خیانەتیان کردووە هەروەکو لە نزیک بیری (ڕەجیع) خیانەتیان کرد و ٧٠ هاوەڵیان شەهید بوون.

پێغەمبەر ﷺ بە بیستنی هەواڵەکە زۆر خەفەتبار بوو، ئەوەندە خەفەتی خوارد زۆر نارەحەتی کرد تەنانەت کراسەکەی هەڵداوە دەموچاوی موبارەکی پێ داپۆشی، ماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە مایەوە، پاشان لەسەر سەری لابردو بەدەنگی بەرز فەرمووی الله اکبر مژدەتان لێ بێت ئەی موسڵمان بەفەتح و سەرکەوتنی خوای گەورە.[١٠]

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر چۆن بێت دەیویست بە گوێرەی توانای باری دەروونی سوپاکەی بەرزبکاتەوە و هیچی تر هاوەڵان بەو هەواڵە نەڕووخێن.

ئەگەر چی پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی ئەو هەواڵە بڵاو نەبێتەوە، بەڵام ڕێک پێچەوانەکەی ڕووی دا، ویستی خوای پەروەردگار وابوو هەموو هاوەڵان هەواڵەکەیان زانی کە بەنی قورەیزە خیانەتیان کردووە، خوای گەورە دەیویست موسڵمان بزانن کەکێ ڕاستگۆیە و کێ موونافیقە، بۆ ئەوەی ڕیزی سوپاکە بەتەواوەتی پاک بێتەوە.

ئەوەندە ڕەوشەکە نارەحەت بوو کە موسڵمان تووشی ئیبتیلا و تاقیکردنەوەی زۆر سەخت بوون، کەوتنە قۆناغێک وەکو زەمینلەرزە وابوو هەموو ڕاچلەکین، گومانی تێدانییە لە قۆناغی زەمینلەرزە ئەوەی موسڵمانی ڕاستگۆ و خاوەن ئیمانە و توانای مانەوەی هەیە، لەبەرامبەر دا موونافیق توانای خۆراگری نییە و خێرا دەڕووخێت.

خوای گەورە لەسەر ئەو ڕەوشە دەفەرمووێت:

---

[١٠] ـ (الله اكبر أَبْشِروا يا مَعْشرَ المُسْلِمين بِفتْحِ الله وَنَصرِه).



﴿إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾﴾ [الأحزاب]

واتە: کاتێکیش دوژمنان لەسەر و خوارتانەوە هاتنە سەرتان، کاتێکیش چاوەکان ئەبلەق بوون، دڵەکان گەشتبوونە گەروو، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بەبەڵێنەکانی خوای گەورە (بەسەرکەوتنی ئیمانداران)﴿١٠﴾ واتە: لەوێدا ئیمانداران تاقی کرانەوە و تووشی تەنگانە و سەختیەکی زۆر توند و بەهێز بوون، تووشی دڵەلەرزەیەکی زۆر سەخت کران﴿١١﴾

بەڵام دوای قۆناغی زەمینلەرزەی ناخی موسڵمان بەدڵنیاییەوە سەرکەوتن نزیکە، بەدوایدا سەرکەوتن دێت بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾﴾ [البقرة]

واتە: ئایا وا دەزانن هەروا بە ئاسانی دەچنە بەهەشتەوە (بێ تەنگانە و ناخۆشی) مەگەر نمونەی ئیماندارانی پێشووتان بۆ باس نەکراوە کە تووشی شەڕ و ناخۆشی و تەنگانە و گرانی و نەداری بوون و تەکانیان خواردووە و زۆریان بۆ هاتووە بە ڕادەیەک کە هەتا پێغەمبەرەکە و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە تەکیا وتوویانە: کەی پەروەردگار سەرکەوتن دەبەخشێت؟! کەی خوا سەرمان دەخات؟! ئاگادار بن و دڵنیا بن کە ئا ئەو کاتە ئیتر سەرکەوتنی خوا نزیکە.

بەڵام حاڵ و گوزەرانی مونافیق زۆر جیاوازە، موشریک چواردەوری مەدینەی گرتووە و یەهوود هاتۆتە ناو هاوکێشەی ئەوان و ئیتر بە بۆچوونی خۆیان پێیان وایە سەرکەوت نەک نابن بەڵکو ئەستەمە.

خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾﴾ [الأحزاب]

واتە: کاتێکیش دووڕووەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشی گومانی تێدابوو دەیانووت بەڵێنی خوا و پێغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەڵەتاندن بوو، هیچی تر نەبوو؟!



یەکێک لە موونافیقەکان دەیوت: محەمەد پەیمانی گەنجینەی کیسرا و ڕۆمی پێ ئەداین، کەچی کەس لە ئێمە تواناى پاراستنی خۆشی نییە کە بڕوات دەست بە ئاو بگەیەنێت.

ئینجا موونافیقەکان دەستیان کرد بە خۆدزینەوە و خۆکشانەوە، بەهانە و بیانوویان دەگرت، هەندێک داوای مۆڵەتیان دەکرد و هەندێکیان ڕایان دەکرد.

خوای گەورە دەربارەیان دەفەرمووێت :

﴿وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَـٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾﴾ [الأحزاب]

واتە: کاتێکیش هەندێک لە دووڕووەکان وتیان: ئەی خەڵکی یثریب، ئەمە هیچ شوێنی ئێوە نییە بگەڕێنەوە ناوشار، دەستەیەکیش لەوان مۆڵەتیان لەپێغەمبەر ﷺ دەخواست و دەیانووت: ماڵەکانمان بەدەرەوەیە (گوایە دوژمن بەئاسانی دەتوانێت هەڵکوتێتە سەری). لەڕاستیدا وانییە ماڵەکانیان بەدەرەوەنین (دوژمن ناتوانێت زەفەریان پێبەرێت)، تەنها ڕاکردنیان مەبەستەو هیچی تر.

سوپاس بۆ خوا واخەریکە ڕیزی موسڵمان لە موونافیقەکان پاک دەبێتەوە، ئەوەش بۆخۆی نیشانەی سەرکەوتنە.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکردەیەکی واقعی و خاوەن کردار بوو، هەر چۆن بێت دەبێت ڕووبەڕووی ئەو واقیعە ببێتەوە و چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە، سوپای موسڵمان پاسەوانی خەندەق بوون لە باکووری مەدینە، پاشان کۆمەڵێک مەفرەزەی درووست کرد کە بڕۆن منداڵان و ژنانی موسڵمان بپارێزن لە دەستی یەهوودی بەنی قورەیزە، لە دوای ئەوەی کە ئەو مەفرەزانەی نارده شاری مەدینە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بیری لەوە کردەوە چی بکات بەرامبەر بە قورەیش و غەتەفان و یەهوود.



## دانوستانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هۆزی غەتەفان

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا ﷺ بیریکردەوە، چۆن بتوانێت ئەو هێزە پارچە پارچە بکات و لە ڕووی سیاسییەوە کاری خۆی بکات، بیری کردەوە لە کامیانەوە دەست پێ بکات قورەیش یان غەتەفان یاخود یەهوود؟

پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی لە ڕێگەی پارە و وروژاندنی حەزی دنیایی بخاتە بەردەم.

لەگەڵ لۆژیکەوە هەر هەوڵێک لەگەڵ قورەیشدا بێ هیچ ئامانج و هیوایەکی لەسەر دانامەزرێت، چونکە لە نێوانیان دا دوژمنایەتییەکی دوورو و درێژ هەیە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ یەهوود ئەزموونی زۆری هەیە و چارەسەر لەگەڵیاندا بێ هوودەیە، چونکە ئەهلی غەدر و خیانەتن. ئەوەی کە ماوەتەوە تەنها غەتەفانە، زۆرینەی سوپا و سەرباز لەدەست ئەوان دایە، ئەوان دوژمنایەتی ئەوتۆیان لەگەڵ موسڵماندا نییە، بەڵکو بۆ پارە و سەروەت و سامانی خەیبەر جەنگ دەکەن و ئەگەری ئەوەیان هەیە زیاتریان بخرێتە بەردەم، پاشەکشە بە سوپاکەیان بکەن ، واز لەو هاوپەیمانییە بهێنێت و بگەڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەنهێنی ناردی بەشوێن سەرکردەکانی غەتەفان، زۆر بە نەهێنی توانی شاندی بەرامبەر بهێنێتە ناو شاری مەدینە کە پێکهاتبوون لە (عویەینەی کوڕی حوسن، حارسی کوڕی عەوف) و چەند سەرکردەیەکی تر، زۆر بە نهێنی کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیاندا، تەنها خودی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیاندا کۆبوویەوە، لەبەر ئەوەی زۆر خێرا کارەکەی ئەنجامدا، کاتی ئەوە نەبوو کە هاوەڵان بەشداری پێ بکات، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای دانوستانی لەگەڵیاندا فەرمووی: ئەم دانوستانە دەچێتەوە بەردەم هاوەڵان، ئەوانیش دەبێت ڕەزامەندی لەسەر دەربڕن دانوستانەکە بریتی بوو: لە سێ بەشی بەروبوومی شاری مەدینە بدرێتە غەتەفان بەو مەرجەی لە جەنگ بکشێنەوە و واز لەگەمارۆی سەر مەدینە بهێنن، هەردوو لا لەسەر ئەوە ڕێکەوتن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ موافەقەتی (ڕازیبوونی) ڕێکەوتنەکەی بەست بە هاوەڵان ئەگەر ئەوان ڕازی بوون، ئەوان ڕۆیشتن و پێغەمبەر ﷺ دەست بەجێ کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەوس و خەزرەج دا کرد، لەگەڵ هەردوو سەرکردەی هۆزەکە کە بریتیبوون لە هەردوو سەعدەکە، سەعدی کوڕی عەبادە و سەعدی کوڕی موعاز بۆیە تەنها ئەو دووانەی هەڵبژارد چونکە ئەوان خاوەنی بەروبوومی شاری مەدینەن، هەر ئەوان نزیکن لە هۆزی غەتەفان وەکو شاری مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ موڵکایەتی بە بەروبوومی شاری مەدینە ناکات، ڕاستە ئەو سەرکردەی دەوڵەتە و پێغەمبەری



خوایە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزی موڵکی خەڵک دەگ و لە کۆتاییدا جەنابیان خاوەنی نین، موڵکی ئەوس و خەزرەجە.

هەر لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ لەدوای کۆبوونەوە لەگەڵ غە ان ئەو دوو هاوەڵەی بانگ کرد و ناوەرۆکی دانوستانەکەی بۆ ڕوونکردنەوە فەرمووی: لەگەڵیاندا ڕێککەوتووم لەسەر گەڕانەوەیان.

ئەوان خۆشحاڵ بوون بە بیرۆکەکە، بەڵام سەعدی کوڕی موعاز زۆر بە ئەدەب و بە حیکمەتەوە وتی: ئەی ڕەسولی خوا ئەمە فەرمانی جەنابتە و بەسەرماندا دەڕوات یاخود خوای پەروەردگار ئەمری پێکردووین و واجبە لەسەرمان؟ یان ئێمەش دەتوانین قسەی تێدابکەین؟ ئایا تەنها بۆ ئەوەت کردووە کە چاکەی ئێمەت دەوێت و لەبەر خاتری مانەوەمانە؟!

واتا ئەگەر فەرمانە ئێمە هیچ قسەیەکی تێدا ناکەین و چی دەفەرمووی گوێڕایەڵین، بەڵام ئەگەر وەکو ڕایەکی مرۆڤانەیە و دوورە لە وەحییەوە با ئێمەش قسەی خۆمان بڵێین؟

پێغەمەبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەڵکو ئەمەوێت شتێکتان بۆ بکەم، (پەیوەندی بە وەحییەوە نییە)، سوێند بەخوا ئەوەی کە دەیکەم بۆتان لەبەر ئەوەیە کە هەموو عەرەب ئێوەیان خستۆتە چوارچێوەی کەوانەیەکەوە، لە هەموو لایەک چواردەوورتان گیراوە و پێچراوون تەنها ویستم لە شەوکەت و هێزیان کەم بکەمەوە.

سەعدی کوڕی موعاز وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە و ئەوان جاران لەسەر هاوبەش دانان بووین بۆ خوا، بەندایەتیمان بۆ بت دەکرد، خوامان نەدەپەرست هەر نەمان دەزانی خوا چییە، ئەوان هەرگیز نەیان توانیوە، تەماع بکەنە بەروبوومی ئێمە، ئەگەر یەک بەرهەمیش بێت (مەبەستی خورمایەک بوو) یان پێمان فرۆشتوون یاخود بەخشیومانە، یان وەکو خزمایەتی و سیلەی ڕەحم داومانە پێیان، کاتێکیش خوای پەروەردگار ئەم ئیسلامەی پێمان بەخشی و عەزیز و سەربەرزی کردین، ئەی چۆن ماڵ و سەروەتمان بدەین پێیان؟ پێویستمان بەوان نییە و سوێند بەخوا بێجگە لە بەخشینی شمشێر، هیچ لە ئێمە وەرناگرن هەتا وەکو خوای گەورە حوکم بکات.

ئەوەیە عیزەتی موسڵمان، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر خۆشحاڵ بوو زۆر پێی موعجیب بوو، بەهەمان شێوە سەعدی کوڕی عوبادە هەمان ڕای سەعدی کوڕی موعازی هەبوو، لەگەڵ ئەوەی پێچەوانەی ڕای پێغەمبەر ﷺبوو بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەیە کە تۆ دەتەوێت، پاشان سەعد پەیماننامەکەی دڕاند.

دەست بەجێ پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوە غەتەفان، کە شووراکەی ڕازی نەبووە بە دانوستانەکە و بەتەمای هیچ نەبن.



لە ڕاستیدا ڕاو بۆچوونی هەردوو سەعدەکە لە جێگای خۆیدا بوو، بۆیە دەستبەجێ پێغەمبەری خوا ﷺ قبووڵی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ زانی بەو پەڕی دڵسۆزی و حیکمەتەوە ڕاوبۆچوونی خۆیان دەڵێن دیدو بۆچوونیشیان زۆر ستراتیژیانەبوو، بۆیە ڕەوشەکە پێچەوانەی ئەوەیە بڵێین زۆر سۆپەرمانی و عەنتەریانە بیریان کردبێتەوە کێشەکە لە دانی سێ لەسەر یەکی بەروبوومی شاری مەدینە نییە، بەڵکو کێشەکە هۆزی غەتەفانە، بۆچی ببنە خاوەنی ئەو دەستکەوتە و سەرکەوتنە، جێگای قبووڵ نییە سەروەری و سومعەی دەوڵەتەکە لەکەدار بێت، لە بەرامبەر خەڵکی و هەروەها نیوەدوورگەی عەرەب بە گشتی، خۆ غەتەفان پیاو چاک ناسرا و نوخبەی عەرەب نین، بەڵکو دز و جەردە و ڕێگر و موورتەزیقەن، تەنها بەکرێ جەنگ دەکەن.[11]

خۆ ئەگەر ئەو دەرگایەیان بۆ بکرێتەوە، چەند جاریتر بۆ سەروەت و سامان هەڵدەکوتنەوە سەر شاری مەدینە.

هەروەها غەتەفان زۆر نزیکن لە شاری مەدینەوە، وەکو قورەیش نین بگەڕێنەوە بۆ مەککە، پێویستە دەوڵەتی ئیسلامی پارێزەری سەروەتی خۆی بێت، جا بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەست بەجێ ڕاوێژ و شوورای بەست، چونکە بنەڕەتی حکومدارییە و حکومەت و دەوڵەت و دەسەڵات و هێز ڕاوێژی لەگەڵ نەبوو شکست دەهێنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ وانەی فێری هاوەڵان و ئوممەتەکەی کرد و ڕاهێنان لەسەر وتە و ڕای جیاواز و دەربڕینی بیر و بۆچوون بۆ باشتر بەڕێوەبردن و کاری چاکتر و داهێنان بۆ ئوممەتەکەی.

سبحان الله دوای ئەو گفتوگۆیە، وەکو بڵێی خوای گەورە سەعدی کوڕی موعازی خستە بەر تاقیکردنەوە، ئەو لاوە خوێنگەرمە بەسەختی بریندار بوو لە خەندەق، تیرێک لە نێو شانی دا و برینەکەی زۆر سەخت بوو، ئەمەش قەیرانێکی تربوو ڕووی کردە موسڵمان، سەرکردە و قیادەی گەورەی ئەوس و حەکیم و جەنگاوەر و لێزانە و لە ناو هۆزەکەی گوێی بۆ دەگیرێت و خۆشەویستی هەمووانە و پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری خۆش دەوێت و لەسەر هەموویەوە خوای پەروەردگار خۆشی دەوێت.

داخۆ کاردانەوەی چی بێت ئەم لاوە ٣٧ ساڵە کاتێک بریندار بوو ، چی بڵێیت؟!

تەنها دوعایەکی کرد و وتی: خوای مەعبوودم زاتی بەرزت دەزانێت کە هیچ شتێک ئەوەندەی جیهاد لە پێناوی تۆدا لەلام خۆشەویست نییە، لە دژی ئەو هۆزەی پێغەمبەرەکەت

---

[11] ـ قال سعد بن مَعاذ بِمُنتهى الحِكْمة: يا رَسول الله أمْراً تُحِبُّهُ فَنَصْنَعهُ, أمْ شَيْأً أَمَرَكَ الله بِهِ لابُدَّ لَنا مِنْ العَمَل بِهِ, أمْ شَيْئاً تَصْنَعُهُ لَنا؟



صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بە درۆ دەخەن و لە جێگا و شوێنی خۆیدا دەریانناوە، خوای پەروەردگار دەزانم کە ویستی زاتی تۆیە جەنگ ڕووبدا لەنێوانماندا، خوایە گیان ئەگەر ئێستا جەنگ ماوە لەگەڵ قوڕەیش بیکەم، بمهێڵەرەوە تا لە پێناوتا بجەنگم، ئەگەر کۆتایی جەنگە خوای پەروەدگار ئەو خوێن و برینەم با سەربکات و لە پێناوتا شەهیدبم، خوای مەعبوودم نەمرم هەتا تۆڵەی ئەم خیانەتە لە بەنی قوڕەیزە دەکەمەوە.

سبحان الله گەنجێک برینداره تەمەنی ٣٧ ساڵە داوای شیفا ناکات، بەڵکو داوای جیهاد دەکات بەسەختی برینەکەی، پاشان دوعاکەی ئەوەیە کە لە پێناویدا بمرێت و شەهید ببێت بە قیسمەتی.[١٢]

تا چرکەساتی کۆتایی ژیانی خیانەت و غەدری یەهوودی و بەنی قوڕەیزەی لەبیر نەچۆتەوە، دەیزانی خیانەتەکەیان چەند گەورە و کاریگەری خراپ لەسەر موسڵمان دروست دەکات.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٢] ـ (قالَ سَعد يَدْعوا: اللّهم اِنَّكَ تَعْلَمُ أنَّهُ لَيْسَ أحَداً أحَبُّ الَيَّ أن أجاهِدُهُم قيلَ من قَوم كَذبوا رَسولِكَ وَأخرجوهُ, أللّهم فَانَني أظُنُّ أنَّكَ قَدْ وَضَعَت الحَرب بَيْنَنا وَبَيْنَهُمْ فَاِن كَانَ نَقيَ مِنْ حَرْب قُرَيْش شَئٌ, فَأَبْقِني لَهُم حَتَّى أجَاهِدُهُم فيك, وَانْ كُنْتَ وَضَعتَ الحَرْبَ فَأفْجُرْها واجْعَل موتَتي فيها ثُمَّ قَالَ في آخر دُعائهِ: ولا تُمِتْني حَتّى تَقر عَيني مِنْ بني قُرَيْظَة؟).



## ناردنی سەرباز لەلایەن خوای پەروەردگار بۆ سەرکەوتنی موسڵمان

ڕاغیب: سات لە دوای سات ڕەوشەکە سەخت تر دەبوو، کۆتایی بە مونافیقەکان هات لە ڕیزی موسڵمان هەموو دەرچوون لە سوپای موسڵمان، موسڵمان ئەوەی لە تواناياندا بوو کردیان بێ درێغی کردن، هۆکاری جەنگیان گرتەبەر ئەویش هەڵکەندنی خەندەق بوو لە ماوەیەکی دیاری کراوادا.

توانیان بەرگەی سەرما و برسێتی بگرن، جەنگیان کرد و پاسەوانی تەواوی خەندەق و شاری مەدینەیان کرد، بە ڕۆحیان بەرگریان کرد و نەیانهێشت دوژمن هەنگاوێک بێتە پێشەوە لە هەوڵ و خەبات و کۆشش نەوەستان، ڕاوێژ و شوورایان جێ بەجێ کرد، نزا و دوعایان لەبیر نەکرد.

ئیتر ئێستا کاتی هاتنی سەکەوتنە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، پەیمان وەکو زاتی بەرزییەتی.

هەموو موسڵمان دوعایان دەکرد دەیانوت: (أللّهُمّ اسْتُر عَوراتنا وآمِن رَوعَاتِنا) و پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای دەکرد و دەیفەرموو: خوای ڕەوانەکاری کیتاب خێرا لە حیساب، هەموو ئەحزاب شکست پێ بێبهێنە، خوایە تووشی زەلیلی و زەمینلەرزەیان بکە و با شکست بهێنن.[١٣]

لە دوای ئەو هەموو هەوڵ و چالاکی تێکۆشانەی موسڵمان و بەگەڕخستنی وزە و تواناکانیان و هەوڵدانەکانیان، بەدڵنیاییەوە سەرکەوتنی خوای پەروەردگار نزیکە سەرکەوتن بە جۆرێک دێت کە هیچ مرۆڤێک بەخەیاڵیدا نەهاتووە، بە ڕێکخستنێکی ڕەببانی، تا هەموو لایەک ئەوە بزانێت و یەقینی هەبێت کە لەلایەن خوای گەورەوە سەرکەوتنەکە هاتووە، سەربازی ڕەحمان زۆرە بەڵام ئەوەی لە ئەحزاب دا بەشداربوو بێگومان هەر زۆر بوون، بەڵام سێ سەرباز هەڵدەبژێرین کە کاریگەری تەواوی لەسەر شکستی سوپای ئەحزاب دانا.

سەربازی یەکەم: کەسێک بەناوی (نوعەیمی کوڕی مەسعوود)[١٤] یەکێک بوو لە ناسراوەکانی غەتەفان و موشریک بوو، کێ بڕوا دەکات لەو کاتەدا ئەم پیاوە موسڵمان بێت بێ بانگەواز و هیچ جۆرە کاریگەرییەکی قورئان و بینینی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی جەنگ دا

---

[١٣] ـ (أللّهم منزل الكتاب سريع الحساب اهزم الاحزاب، اللهم اهزمهم و زلزلهم)،صحيح البخاري ٤١١٥.

[١٤] ـ نعيم ابن مسعود.



موسڵمان دەبێت، سەیرە چۆن کەسێک خاوەنی سوپایەکی وا بەهێزبێت و خۆی یەکێک بێت لە قیاداتی لەو ساتەوەختە و موسڵمان بێت! وا موسڵمان لە دارمانی تەواو دان دوای خیانەتی بەنی قورەیزە، سەیرە چۆن سوپای بەهێز جێ دەهێڵێت و دەڕواتە ناو سوپای لاواز!

بەڕاستی ئەوەی ڕووی دا نوعەیم خوای گەورە هیدایەتی دا، سوپای کافر و موشریکی جێهێشت و هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من موسڵمان بووم، بەڵام کەس لە هۆزەکەم بە موسڵمان بوونمی نەزانیوە، چیت پێباشە و چیت دەوێت بۆتی بکەم؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی نوعەیم تۆ تەنها یەک کەسی، ئەو سوپایەمان لێ دوور بخەرەوە بە گوێرەی توانات، خۆشت باش دەزانیت کە جەنگ پلان و لێ زانینە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ نەکرد بۆ شتێکی دیاری کراو، بەڵکو بەجێی هێشت بۆخۆی، بەڵام خوای گەورە خستییە دڵی و مێشکی، کە بە مێشکی هیچ کەسدا نەهاتووە، تەنانەت خودی پێغەمبەری خواش ﷺ بیری لێ نەکردۆتەوە.

هەروەکو ئاماژەم پێدا نوعەیم پیاوێکی ناسراو بوو لە ناو عەرەب و یەهوود دا کەسایەتییەکی باوەڕپێکراو بوو، ڕاستەو خۆ چووە لای یەهوود و لای بەنی قورەیزە مایەوە، ئەوان وایانزانی موشریکە و لەسەرکردەکانی غەتەفانە خۆشی ئاگادار بوو بەوەی کەچی لەژێرەوە ڕووی داوە و چ هاوپەیمانییەکی شەیتانی بەستراوە دژی موسڵمان، پێی وتن ئەی هۆزی یەهوود ئێوە باش من دەناسن دەشزانن خۆشەویستی و دڵسۆزیم بۆ ئێوە هەیە، بەتایبەت لە نێوانی من و ئێوەدا.

وتیان: بەڵێ ڕاستە و وایە.

نوعەیم: بەڕاستی قورەیش دەیەوێت فێڵتان لێ بکات خراپەتان لەگەڵ دەکات، ئێوە ئەوە جێگاتانە و شاری خۆتانە و هەموو سەروەت و سامانتان لێرەیە، ژن و ماڵ و منداڵتان لێرەیە، کەس توانای نییە بتانپارێزێت لە خۆتان زیاتر، قورەیش بۆ جەنگی محەمەد هاتووە، نە سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵیان هیچی لێنایە، کەی ویستیان دەگەڕێنەوە بەجێتان دەهێڵن، محەمەد واز لێدەهێنن بۆتان و ئەو کات محەمەدیش تۆڵەتان لێدەکاتەوە.

بەنو قورەیزە وتیان: ئەی باشە چارە چییە؟!

نوعەیم: هاوکاریان دەکەن بۆ جەنگ هەتا وەکو خەڵکێک لەبەرانبەر ئەوە لە قورەیش وەرنەگرن بۆ ئەوەی دڵنیابن.

یەهوودی بەنی قورەیزە وتیان: ئاماژەت بە ڕاو و بۆچوونێکی باش کرد.



پاشان نوعەیم ئەوانی جێهێشت و ڕاستەوخۆ چووە لای قیاداتی قورەیش پێی وتن: ئێوە دەزانن چەندە ڕێز و خۆشەویستیم هەیە بۆتان ئەی هۆزی قورەیش، ئامۆژگاریتان ئەکەم بە شتێک.

قورەیش وتی: بەڵێ وایە و ئامۆژگاریەکەت چییە؟!

نوعەیم: بەڕاستی ئەوەندەی من ئاگادارم یەهوود زۆر پەشیمانە لەو پەیماننامەیەی لەگەڵ ئێوە بەستوویانە، لەگەڵ محەمەد پەیماننامەیان شکاندووە، جا وەعد و پەیمانیان داوە بە محەمەد کە لە ئێوە بارمتە وەربگرن و بەدیاری بیدەنە محەمەد بۆ ئەوەی زیاتر لە محەمەد نزیک ببنەوە، ئامۆژگاری من بۆ ئێوە تەنها ئەوەیە ئەگەر داوای بارمتەیان لێ کردن مەیاندەنێ.

بەهەمان شێوە چووە لای غەتەفان، هەمان پێشنیاری بۆ کردن، بەتەواوەتی بڕوایان بە نوعەیم کرد، بۆ دڵنیابوون لە قسەکەی نوعەیم، قورەیش و غەتەفان شاندێکیان پێکهێنا و نامەیەکیان نووسی بۆ یەهوودی بەنی قورەیزە، هەموو ئەمانە تەگبیری خوای پەروەردگارە، قورەیش لە نامەکە دا نووسیبووی بە زووترین کات هاوکاریمان بکەن، چونکە لە توانامان دا نەماوە و خەریکە بە تەواوەتی لێرەدا ماندوو دەبین، خێرا لەگەڵماندا هەڵسن با ڕووبەڕووی محەمەد ببینەوە.

یەهوودوەڵامی دانەوە: ئەمڕۆ ڕۆژی شەممەیە، تاوەکو بارمتە نەنێرن ئێمە لەگەڵتاندا هاوکار نابین.

کە شاندەکەی قورەیش و غەتەفان گەڕانەوە و داواکەی یەهوودیان پێ گەیشت وتیان نوعەیم لەگەڵماندا ڕاستی وتوە.

نامەیان نووسییەوە بۆ یەهوودی بەنی قورەیزە، کە ئێمە بارمتە نادەین و هەڵسن لەگەڵمان بۆ جەنگ!؟

ئینجا یەهوود وتیان: بەڕاستی نوعەیم لەگەڵماندا ڕاستگۆ بوو.

بە فەزڵی خوای گەورە دووبەرەکی کەوتە نێوان ئەحزاب، سوپاس بۆ خوا دابەش بوونەوە، هاوپەیمانی لە نێوانیاندا نەما، هۆکارەکەی نوعەیمی کوڕی موسعود بوو.

خوای گەورە هەرچی بوێت دەیکات خوای گەورە دەفەرموێت:



﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ [يس]
واتە: بێگومان هەر كاتێک فەرمانی خوا دەرچوو، ویستی شتێک جێبەجێ بكات و بیهێنێتە دی، پێی دەڵێت ببە، ئەویش دەستبەجێ و بێ دواكەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و درووست دەبێت.

سەربازی دووەم: بریتی بوو لە ڕەشەبای سارد و خۆڵاوی كە سەربازی ڕەحمانە، خوای پەروەردگار ڕەشەبای بۆ ناردن، ئەوەندە سارد و خێرا بوو چووە ناو سەربازگەكەیان، هەرچی خێمە و كەپریان هەبوو دای بەسەر یەكدا و تەنانەت زۆر لە كەرەستە و شتومەكەكانیان با بردی، هەموو ئاگرەكانیان كوژایەوە، تیژی باكەی ئەوەندە بەهێز بوو هەموو بڕیاری ئەوەیان دا بگەڕێنەوە و جەنگ كۆتایی هات، گەمارۆ لەسەر شاری مەدینە لابرا.

ئەی بۆچی هەر لەسەرەتاوە ڕەشەبا هەڵی نەكرد بۆیان، دوای یەک مانگ خوای پەروەردگار ڕەشەبای نارد؟

بۆ ئەوەی موسڵمانان تاقی بكاتەوە و ڕاستگۆ و درۆزن جیابكرێتەوە و موسڵمان و مونافیق دەربكەوێت.

ئەی بۆچی ئەم ڕەشەبایە هەموویانی لەناو نەبرد وەكو ڕەشەباكەی عاد و ثەمود؟

لەبەر ئەوەی ئەو سوپا كافرە لە دواییدا هەموو موسڵمان دەبن، دەچنە ناو هێزی موسڵمان و ئەم گەردوونە بە قەزا و قەدەری خوای پەروەردگار دەگەڕێت.

سەربازی سێیەم: فریشتەكان بوون بەشداربوون لەگەڵ موسڵمانان دا، خوای پەورەردگار دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٌ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا﴾ [الأحزاب]
واتە: ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە یادی نیعمەتی خوا بكەنەوە لەسەرتان (مەبەست جەنگی خەندەقە كە خوای گەورە فریای ئیمانداران كەوت)، كاتێك سەربازانی كوفر هاتنە سەرتان ئێمەش ڕەشەبایەكی بەهێز و سەربازانێكمان ناردەسەریان كە نەتاندەبینین، خوای گەورە بینا بوو بەهەوڵ و كۆششتان (چۆن پاسەوانیتان دەكرد، چۆن ئەو چاڵەقووڵ و درێژەتان هەڵكەند... هتد).



زیاتر لە جەنگی مەیدانی لەگەڵ بەنی قورەیزەدا دەردەکەوێت کە فریشتە بەشداربوون تەنانەت خودی حەزرەتی (جوبرەئیل) بەشداربووە.

خوای پەروەردگار سەرکەوتنی خۆی ناردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ حوزەیفەی یەمانی نارد بۆ ناو سەربازگەی کافرەکان بۆ دڵنیابوون لێیان و تەمەشای حاڵ و گوزەرانیان بکات، ڕەشەبا وێرانی کردبوون هەموو خۆیان کۆکردەوە بۆ ڕۆیشتن، حوزەیفەی یەمانی بە موژدەوە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە بەتەواوەتی هەموو سەربازەکان لە گەڕانەوەدان.

ئەم جەنگە جەنگێکی سەخت نەبوو لە ڕووی مەیدانییەوە، بەڵکو گەمارۆکەی سەخت بوو، لە هەردوولا بە پەنجەی دەست خەڵکیان لێ کوژرا، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾﴾ [الأحزاب]

کاتێك ئیمانداران ئەو هەموو دەستە و گرۆهانەیان بینی وتیان: ئەمە ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەرەکەی بەڵێنی پێداوین (کەئاوا دژایەتی ئایینەکەی دەکرێت و کافران و دووڕووەکان نەخشە و پیلان دەکێشن بۆ ڕیشەکەن کردنی)، دیارە کە خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو لەپێش هاتنیدا، بێگومان ئەو دژایەتییە باوەڕ و ملکەچی نەبێت هیچی تری بۆ زیاد نەکردن (واتە سوورتر بوون لەسەر ئیمان).

بەوەش گەورەترین جەنگ لە نێوان موسڵمان و موشریکەکان کۆتایی پێ هات.

هەروەکو ئەوەی خوای گەورە پێمان بڵێت سەرکەوتن لە کوشتن و بڕین و جەنگ دا نییە، بەڵکو سەرکەوتن کاری پێویستە، بڕیاردانی ڕاستگۆیی و جیهادی دەوێت، خۆڕاگری لە مەیدان دا دەوێت، پاشان سەرکەوتن بە جۆرێک دێت کە خوای پەروەردگار دەینێرێت کە بە خەیاڵی کەسدا نەهاتبێت.



# جەنگی بەنی قورەیزە

ڕاغیب: کاتێ کۆتایی هات بە ڕووداوەکانی جەنگی ئەحزاب یان جەنگی خەندەق ئەو دوو ناوەی لێنراوە، بەڵام خیانەتی یەهوود خەنجەرێکی زۆر گەورە بوو لە پشت موسڵمان، چونکە یەهوود دوژمنی خوا و پێغەمبەر و ئیمانداران و دوژمنی ڕاستی و حەق و ڕەوشتی بەرزن.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای یەک مانگ دوای نوێژی بەیانی گەڕاوە بۆ ماڵەکەی، بۆ ئەوەی پشوویەک بدات و تەپوتۆز و غوباری جەنگ لە خۆی بکاتەوە و خۆی بشۆرێت کە ماندووی یەک مانگ لە لاشەی دەربچێت، بەڵام جوبرەئیل هات لە نیوەڕۆدا بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێوە چەکەکانتان داناوە بەڵام ئێمەی فریشتە هێشتان چەکمان دانەناوە.

خاتوو عائیشە دەڵێت بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ خۆڵ و غوبار بە دەم و چاوی جوبرەئیل دەسڕێت، پاشان جوبرەئیل فەرمووی دەرچن بۆیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بۆ کوێ؟ جوبرەئیل ئاماژەی کرد بۆ بەنی قورەیزە و فەرمووی: من لە پێشتانەوە دەڕۆم خان و ماڵ و قەڵایان دەلەرزێنم و ترس و لەرز ئەخەمە گیانیان.

بەم شێوە جوبرەئیل خۆی و پۆلێک فریشتە ئامادەی جەنگەکە بوون، فەرمان کرا بە موسڵمان کە دەبێت هەڵبکوتنە سەر بەنی قورەیزە بە زووترین کات، موسڵمانان تووشی ئەوە نەهاتن بڵێن با پشوویەک بدەین، خێرا و دەست بەجێ هەڵسان و ڕووە و قەڵا و بارەگای بەنی قورەیزە کەوتنە ڕێ، لە دوای گەمارۆی مانگێک پشوویان نەدا، چونکە پشوو تەنها لە بەهەشت دایە، دونیا جێگای کار کردنە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەس نوێژی عەسر نەکات تا دەگاتە گەڕەک و ناوچەی بەنی قورەیزە، سێ هەزار هاوەڵ و فریشتە گەمارۆی قەڵای بەنی قورەیزەیان دا و ماوەی ٢٥ شەو و ڕۆژ گەمارۆکە بەردەوام بوو.

بەڵام ڕەوشەکە لەمەولاوە دەگۆڕێت لە کاتێکدا موسڵمانان گەمارۆ درابوون، ئێستا ئەوان گەمارۆی دوژمن ئەدەن لە نێوانی چاوترووکانێکدا خوای پەروەردگار ڕەوشەکەی گۆڕی بۆ ڕەووشێکی تر.

لە کۆتایی گەمارۆی پێغەمبەری خوا ﷺ ترس و لەرزی خوا کەوتە دڵیان، یەهوود خۆیان ڕادەستی پێغەمبەر ﷺ کرد و هەموو ملکەچ بوون بۆ فەرمانی پێغەمبەر ﷺ.



پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمانی کرد هەموو جەنگاوەر و سەربازەکانیان ببەستنەوە، ئەوس پێشتر هاوپەیمانی بەنی قورەیزە بوون، هاتنە لای پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ داوای ئەوەیان کرد وەکو بەنی قەینوقاع کە هاوپەیمانی خەزرەج بوون تەنها بە دەرکردن وازی لێهێنان، ئەمانیش هەروا لەگەڵیان دا بکات، داوای ئەوەیان کرد لە پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ ، پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمووی: ئایا ئێوە ڕازی دەبن کە پیاوێک لە خۆتان حوکم بدات بەسەریاندا؟

هەموو ئەوسییەکان وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ.

پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمووی: ئەو کەسە سەعدی کوڕی موعازە گەورەی ئەوس، هەموو ئەوس وتیان ئێمە ڕازین.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ ناردی بە شوێن سەعد لە شاری مەدینە، لە جەنگی ئەحزاب بریندار بوو بە سواری گوێدرێژێک هاتە خزمەتی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ ، هەموو ئەوسەکان لە دەوری کۆبوونەوە و وتیان سەعد بەرامبەر بە هاوپەیمانەکانت چاکەیان لەگەڵ بکە، پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ بۆیە تۆی کردووە بە حاکم و دادوەر بەسەرمانەوە بۆ ئەوەی چاکەیان لەگەڵ بکەیت.

وەڵامی کەسیانی نەدایەوە تا زۆریان بۆ هێنا و وتی: سەعد لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێک ناترسێت، تەنها لە لۆمەی خوا ترسی هەیە.

کە سەعد گەیشتە خزمەت پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ ، پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمووی هەڵسن لەبەرامبەر گەورەکەتان.

دوای ئەوەی کە لەسەر گوێدرێژەکە دابەزی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمووی: سەعد ئەم هۆزەی یەهوود لە ژێر فەرمانی تۆ دایە.

سەعد: فەرمانم بەسەریاندا دەڕوات و پیادە دەکرێت؟!

پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمووی: بەڵێ.

سەعد: قسەم بەسەر موسڵماندا جێبەجێ دەبێت؟!

پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمووی بەڵێ.

سەعد: پاشان ئاماژەی کرد بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ کە قسەی جێبەجێ دەکرێت و گوێی بۆ دەگیرێت لەلایەن پێغەمبەرەوە؟



پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ فەرمانەکەشت بەسەر مندایە.

سەعد: هەرچی دەستی چەکی گرتووە بکوژرێت، ماڵ و سەروەت و سامانیان بەسەر موسڵمانان دا دابەش بکرێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دادوەرییەکەت بەو شێوەیە بوو کە دادگەری خوای پەروەردگاری لەسەر بوو لە سەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە.

دەستبەجێ موسڵمانان دەستیان کرد بە پیادەکردنی فەرمانەکەی سەعد و ئەوەی پیاوی چەک هەڵگرتن بوو لە بەنی قورەیزە بوو کوشتیان، کە بریتیبوون لە ٤٠٠ سەرباز و ماڵ و منداڵیان دابەش کرا بەسەر موسڵماندا.

گەورەی بەنی قورەیزەش گیرا حوییەی کوڕی ئەختەب، باوکی خاتوو سەفیە خێزانی پێغەمبەر و دایکی ئیمانداران.

وەکو وەفایەک بۆ قسەی خۆی چووە ناو قەڵای بەنی قورەیزە، دوای بەسترانەوەی هێنایانە بەردەمی پێغەمبەر ﷺ وتی: محەمەد هەرگیز لۆمەی خۆم ناکەم بۆ ئەوەی کە دژایەتیم کردوویت، بەڵام هیچ کەس ناتوانێت بەسەر خوای پەروەردگار سەرکەوێت

پاشان حوییەی کوڕی ئەختەب وتی ئەی خەڵکینە فەرمانی خوای گەورەیە بە سەربەنی ئیسرائیل دەبوو ئەم جەنگە هەر ڕووبدات، پاشان گەردەنی خستە بەر شمشێری موسڵمانان، ملیهوڕی وا ملییان پەڕاند.

چەند کەسێک لەوانە نەکوژران ئازاد بوون، یەکێک لەو یەهوودیانە (عەمری کوڕی سەعدی) بوو بە هیچ شێوەیەک نەچووە ناو خیانەتی بەنی قورەیزە و لەگەڵیاندا بەشدار نەبوو، تەنها ئەوانە کوژران کە غەدریان کرد، محەمەدی کوڕی مەسلەمە لێپرساوی پاسەوانەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو، ئەو یەهوودییەکانی ئازاد دەکرد کە بەشدار نەبوون لە خیانەتەکە دا هەموو لەسەر دینی یەهوودی خۆیان مانەوە کۆچیان کرد بۆ شام.

ماکوان: هیچ کەس ناتوانێت لۆمەی موسڵمانان بکات لەبەرامبەر کوشتنی سەربازانی بەنی قورەیزە، چونکە (سزا لە جۆری کردار وەردەگرێت) ئەوان هەوڵیان دا کە هەموو موسڵمان لە ناو بەرن، بەسەر خۆیان دا شکایەوە، سزای خۆیان وەرگرت و هەموو تاوانبارانی جەنگ بوون، (والجزاء من جنس العمل ولا يحيق المكر السيئ إلابأهله)

ئەی دوای بەنی قورەیزە سەعد چی بەسەر هات؟!



ڕاغیب: لە دوای ڕووداوی بەنی قورەیزە سەعد دوعاكەی گیرابوو، خوێن بەربوو لە برینەكەی تەنانەت ئەوەندە خوێنی لێڕۆیشت دەرچوو لە خێمەكەشی تا بە خۆشحاڵی و ڕازیبوونەوە گەڕایەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بۆ شەهید بوونی سەعدی كوڕی موعاز عەرشی ڕەحمان لەرزی، هەروەها كۆمەڵێك لە موونافیقەكان ئەوسی بوون سەرەیان بەركەوت كە تەرمی سەعدی هەڵبگرن، وتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ لاشە و تەرمی زۆر سووكە؟ فەرمووی فریشتەكان تەرمەكەیان هەڵگرتووە.

نەهامەتی و نارەحەتی تاڕادەیەك كۆتایی هات، هێزی یەكەم لە ناوچەكە دا لە ئێستا دا موسڵمانانن، ساڵی ٥ و ٦ی كۆچی ساڵی تەمكین و جێنشین كردن بوو، موسڵمانان لەم یەك دوو ساڵە دا پشوویان دا زیاتر گرنگی درا بە زانست و زانیاری و ئاوەدانكردنەوە، هێزی سەربازی و چەك و جبەخانەی بە هێز و بانگەوازی ئیسلامی ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی سەند.



# دامەزراندنی جێنشینکردن و تەمکین

ڕاغیب: ڕووداوی جەنگی ئەحزاب و بەنی قوڕەیزە زۆر جەنگێکی سەرسوڕهێنەر بوو بۆ موسڵمان، جەنگێکی ئەوتۆ تێیدا ڕووی نەدا، خوای گەورە لە جەنگ پاراستنی، بەڵام تاقی کردنەوەیەکی زۆر گەورە بوو بۆ ئیمانداران، ڕاستگۆکان بەڕاستی تێیدا خۆگربوون، لەگەڵ ئەوەدا بۆ موسڵمان دوو قۆناغی گرنگ بوو دوای جەنگی ئەحزاب، جیاوازی ئەم دوو قۆناغە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان ڕوون دەکاتەوە و دەفەرمووێت: لەمەودوا ئێمە دەچینە سەر دوژمن ئیتر توانای نییە بێتە سەر ئێمە بۆ جەنگ.

(قال الآن نغْزوهم وَلا يَغْزونا، نَحْن نَسير إليهم).

پێش ئەحزاب موسڵمانان هەمیشە لە ترس و دڵەڕاوکێدابوون و کێشەی زۆریان بۆ درووست دەبوو، جێگاکەیان نا ئارام و پڕ جەنگ بوو، بەڵام دوای جەنگی ئەحزاب دەوڵەت پێگەیشت و لە ساوایی دەرچوو، توانا و هێزی زۆری بەبەراکرد و زۆر لە دوژمنەکان بەتەواوەتی لێیان دەترسان، جێگای خۆیان لە ناو نیوەدوورگەی عەرەب دا بە تەواوەتی قایم کرد، هیچ کەس لە هۆز و لاکان جورئەتی ئەوەیان نەبوو قسە بکەن بەرامبەر موسڵمان، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە قووڵی بیری کردەوە و فەرمووی لەمەودوا ئێمە جەنگیان لەگەڵ دەکەین و دەچینە سەریان.

ئیتر بە تەواوەتی ئەم ماوەیە ماوەی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی بە هێزە لە دوای قۆناغی هیجرەت، پێنج ساڵی کۆچی موسڵمانان تەمکینیان بۆ درووست بوو لە دەوڵەت و بانگەواز و بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام، بەهێزکردنی ڕاگەیاندن و هەموو دەزگاکانی دەوڵەت لەو سەردەمەدا.

بە تەواوەتی قۆناغێکی پڕ شادی و دڵ خۆشی دەست پێ دەکات.

ئەم قۆناغە دێتە پێشەوە موسڵمان دەست ڕۆشتوو دەبن و خاوەن هێز و سەرووەری تایبەت دەبن بە خۆیان، ڕۆژ بە ڕۆژ لە وڵاتانی فارس و ڕۆمدا هەواڵیان دەبیسترێت، خەڵکی بە چاوی ترەوە تەماشایان دەکەن، هێزی هۆز و عەشرەت و تیرە کۆتایی هات، لە مەودوا وەکو ئوممەت مامەڵە لەگەڵ هێزەکانی تری دنیادا دەکات و ئەرزشی نەتەوە و گەل و هۆز نەما، لە ناو دەوڵەتی ئیسلامی هەموو توانا و هێز و ڕەگەزێک لە خۆ دەگرێت، جیاوازی لە نێوان ڕەگەز و جۆری پێست ناکات، بەڵکو لەسەر بنەمای پرنسیپ و باوەڕ مامەڵە دەکات.



ئەگەر بکرێت پێم خۆشە لەسەر ئەو ڕووداوانەی باسم کرد و بینیمان تۆش قسەی خۆت هەبێت ماکوان؟ شیکاری تۆ چییە بۆ ئەو ڕەوشە لەدوای خەندەق؟!

ماکوان: شیکاری من بۆ ئەم سیرەی پێغەمبەری خوایە ﷺ پێش هەموو شتێک، بە باشترین زانستی دەزانم بۆ موسڵمانان، لەبەر ئەوەی من و جەنابت و خەڵکی بە گشتی لێیکۆڵێتەوە و تەماشای ژیانی باشترین پیاوی سەرزەوی دەکەیت و کە هاوشێوەی لە پلە و پایەیدا نییە.

باسی کەسێک دەکەیت خوای پەروەردگار سوێندی بە تەمەنی خواردووە و پێی دەفەرموێت:

﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ [القلم]

تۆ لەسەر باشترین و بەرزترین ڕەوشتی.

واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێوێنەو مەزنیت.

ئەگەر خوێندنەوە و شیکاری بۆ سیرەی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتەکاندا گرنگ بووبێت ئەوا لەم سەردەمەی ئێستاماندا گرنگترینە، لەبەر ئەوەی واقعی ئەم ئوممەتە زۆر لە دواوەیە، لە ڕووی سەربازی لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی.

گومانم نییە و خاوەنی یەقینم کە خوای پەروەردگار هەرچی بوێت لە کونفەیەکون دا دەیکات، بەڵام ئەوەی کە لەسەر ئێمە واجبە ئەوەیە هۆکار بگرینە بەر بۆ زیندووکردنەوەی ئەم ئوممەتە، ئەویش بە ڕێبازی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە سیرەکەیدا، بۆ نموونە لەو پەڕی لاوازی و بەرەو نووشستیدا، هەواڵی فەتحی شام و فارس و یەمەنی دانێ، ئەم فراونی دید و ڕووئیای پێغەمبەر ﷺ لە قورئان و وەحییەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەوەی ئەوان توانیان پێی سەرکەون، لەبەر دەستی ئێمەدا هەیە کە خودی قورئان و سوننەتەکەیە، سوپاس بۆ خوا نەفەوتاوە و وەکو خۆی لامان ماوەتەوە و خوای گەورە بۆی پاراستووین، لە ڕووی ماددیشەوە ئێستا زۆر بە هێزترە موسڵمان تا سەردەمەکانی کۆن و بگرە دوو سەرمایەی زۆر گرنگی لەبەردەست دایە ئەویش سەرمایەی مرۆڤ و ئابوورییە، بەڵام بە داخەوە قورئان و سوننەتی وەلاناوە بۆیە لاسەنگە و توانای نییە خۆی پارسەنگ بکاتەوە بە قورئان و سیرەی پێغەمبەر ﷺ.

ژیان و نموونەی سیستەمی زۆرمان بینی لە دەوڵەتەکانماندا کە فەرمانداری موسڵمانان دەکەن، هەر لە شووعییەکان و ئیشتراکییەکان و سەرمایەداری و دیموکراسی...هتد



هیچمان بە هیچ نەکرد هەموو فەشەل و شکست لە دوای شکست بەسەر خەڵکەکەیاندا هێنا، کوا سیستەمی عەرەبچیی جەمال عەبدولناسری تاغوت، کوا سەددام سۆسیالیزمی عەرەب، کوا بورقیبە و قەزافی و شای ئێران...هتد

بێجگە لە ئەوان و پیش ئەوان هەموو تاغوت و ملهووڕ بوون و خۆیان بە هیلاکەت برد ، میللەت و گەلیان سەرگەردان کرد، جیل لە دوای جیل و ڕەوەند لە دوای ڕەوەند دەبێت باجی دەستی ئەم عەلمانییە خوانەناسانە بدەین.

جا من ئاوا تەماشای ژیانی پێغەمبەر دەکەم ﷺ کە هەمیشە چارەسەری هەموو کێشەیەکە، بۆ ئوممەتی موسڵمان پڕۆژەی ئامادەیە بۆ پڕکردنەوەی کون و کەلەبەرەکانی عەلمانی کردوویەتییە ئەم ئوممەتە عەزیزە.

پێویستە شیکاری بۆ هەموو لایەنەکانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بکەین، بنەما عیلمی و سەرەکییەکانی تێدا دەست بخەین، هەموو بەرهەم و هەوڵەکانی زۆر بەهەند لەبەر چاو بگرین و کاری پێبکەین.

لەبەر ئەوەی باشترین زانستە ئەم مێژووی ژیانی پێغەمبەرە ﷺ ، بۆچی ناونراوە بە سیرە ناوترێت مێژوو؟ یان چیرۆک یان هەواڵ و زانیاری؟! سیرە لە زمانی عەرەبی دا واتا گەڕانەوەی شتێک بۆ بنەڕەتی خۆی کەواتە ئێمە کە دەڵێین سیرەی پێغەمبەرە ﷺ واتا گەڕانەوەی بۆ ئەو کارەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داوە.

یەکەم: دەبێت لەوە تێبگەین کە باسی سیرە دەکەین واتا باسی هەموو وێستگەکانی شەریعەت دەکەین، یاساکانی باری کەسایەتی، یاساکانی مێژوو، جیهاد، چۆنیەتی پێکەوە ژیان، سیستەمی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و فیقهی ئیسلامی بەگشتی هەمووی لە سیرەی پێغەمبەر ﷺ دەرهاتووە.

زانایان هەولێکی زۆریان داوە تا ئەحکامی ئەم ئیسلامەیان لە سیرە و قورئاندا دەرهێناوە.

دووەم: دەبێت هەموو لەوە تێبگەین کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆیەوە هەنگاوی هەڵنەهێناوە یان لە مەجلیسی شوورایدا، لە خۆیەوە ڕای خەڵکی قبووڵ نەکردووە، یان هەرشتێک کە نە کەڵکی بۆ ئیسلام و موسڵمانان نەبێت پێغەمبەر ﷺ ڕاستی کردۆتەوە، ئەمەش بە ئاراستەی وەحی بووە، نەک وابزانین، ژیان و واقیعەکە ئاوای خواستووە.

سێیەم: دەبێت لەوە تێبگەن کە بۆیە سیرەی پێغەمبەر ﷺ دەخوێنینەوە و دەینووسین و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین، زیاتر بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺمان

خۆش بووێت لە هەموو کردار و ڕەفتار و گوفتار و هەڵسوکەوتیدا، چونکە بۆ ئێمەی موسڵمان پێشەنگە، ئەبێت لە هەموو وێستگەکانی ژیاندا لاسایی بکەینەوە.

چوارەم: لەوە تێبگەین و فێربین کە کەسایەتی بەو جۆرە بووە، چۆن هەڵسەنگاندنی بۆ خەڵکی کردووە! چۆن ڕاو بۆچوونەکانی هەڵبژاردووە، کام ڕەفتار و گوفتارە باش بووە ئەوی هەڵبژاردووە، ئێمەش فێری ئەو حیکمەتانەبین لە ڕووی مەیدانییەوە واقیعناسی بێت، یاخود لە پێش دانان بیت یاخود پێوەرناس و هەروەها ناسینی جۆری نموونەی خەڵکەکەمان کەپێی دەووترێت هونەری هەڵسوکەت و قسەکردن و مامەڵەکردن، هەموو ئەمانە لە ژیانی پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ەوە فێر دەبین.

گرنگی بدەین بە چۆنیەتی هەڵسانەوەی بانگەواز و ئوممەتەکە و بنەڕەتی ئەو دوو توخمە گرنگەی ئیسلام (بانگەواز و ئوممەت) تا بتوانین توخمی سێیەم پێ دابمەزرێنین ئەویش دەسەڵات و دەوڵەت و خیلافەتە.

هەروەها گرنگی بدەین بەو لایەنانەی کە واقعی ژیانمان نیشان ئەدات لە سیرە دا، بەو مەرجەی لە مێژووی ئەواندا نەژین، بەڵکو چارەسەری واقعی خۆمانی پێ بکەین بە ڕەوش و مێژووی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ.

هەر چەندە ئەو پەرەگرافەی کۆتایی دەبێت زیاتر شیکاری لەسەر بکرێت خەڵکی نابێت لە مێژووی کۆندا بژی. مەبەستم ئەوەیە هەندێک گرووپ و لایەن هەن لە دڵسۆزی خۆیان یان نەزانی، لە ئێستادا چاوەڕوانی تەیرولئەبابیل دەکەن ئەم هیوایە خەیاڵ پڵاوە، ئەمە واتای ئەوەیە کە لە مێژوو دا نەژین، بەڵکو دەتوانین واقعی تەیرولئەبابیل بگۆڕیت بۆ سارووخ و فڕۆکە و...هتد.

گومانی تێدا نییە کە لێوردبوونەوە و دیراسەکردنی مێژوو گرنگە لە ژیانی مرۆڤدا بە شێوەیەکی گشتی و موسڵمانان بە تایبەتی، چونکە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە بۆ مێژوو داوایەکی خواییە و فەرمانمان پێ کراوە کە بەدواداچوونە مێژووییەکان بخوێنین و بخوێنیەوە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:



﴿وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾﴾ [الأعراف]

واتە: خۆ ئەگەر بمانویستایە ئەوە بەو ئایەت و فەرمانانە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام ئەو خۆی چەسپاند بە زەوییەوە و (دەستی کرد بە دنیا پەرستی) و شوێنی ئارەزووی خۆی کەوت. جا نموونەی (ئەو جۆرە کەسانە) وەکو نموونەی سەگ وایە، ئەگەر دەریبکەیت و پیا هەڵبشاخێیت هەناسە بڕکێیەتی (زمانی دەردەکێشێت)، یاخود ئەگەر وازی لێبهێنیت ئەوە هەر هەناسە بڕکێیەتی، ئەوە نموونەی ئەو کەسانەیە کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ زانیووە و بڕوایان پێی نەبووە، کەوابوو ئەم جۆرە بەسەرهاتانە بگێڕەوە بۆ ئەوەی (دابچڵەکێن) و بیربکەنەوە.

ژیانی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ گەورەترە لە مێژوو، بەڵکو بەشێکە لە خودی و تایبەتە و لێی جیانابێتەوە، پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ قورئانێکی ڕۆشتوو بوو واتا خودی ژیانی قورئانە، باشتر بڵێم لە خودی ژیانی هەمووی وەحییە، بۆیە بۆ ئێمە دەبێتە ئایین، نەک مێژوو لەبەر ئەوەی هەموو ژیانی بە گوێرەی توانای مرۆڤەکان پیادە دەکرێت بەڕێگا ڕۆیشتنی ئەو بۆ ئێمە گرنگە کە بمانگەیەنێتە بەهەشت، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾﴾ [آل عمران]

واتە: (ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناح و هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، (چونکە ئەو) خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە.



# هەرگیز خەڵکێک شوێن کەسێک ناکەوێت کە ژیانی نەزانێت

من و نومێر و جەنابتان لە باسی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵیدا بووین و دەزانین پێغەمبەر ﷺ چەندە نارەحەت و سەختی چەشتووە تا ئەو دەوڵەتەی وا دامەزراندووە، لە هیجرەتەوە بۆ ئەحزاب لە ناو ڕووداوەکاندا ژیاون، ئەزانم چەندە پێداکێشانی گەورە تێیدا ڕووی داوە، هەموو لا چۆن دەیانویست هەرچۆن بووە ئەو دەوڵەتە درووست نەبێت، بەڵام بەویست و فەزڵی خوا دەوڵەتەکە سەرکەوتووبوو، هۆکاری دەگەڕێتەوە بۆ ئاراستەی وەحی پێغەمبەر ﷺ و سەرکردایەتی حەکیمانەی رسول الله لە دامەزراندنی دەوڵەتەکەی لەگەڵ ئەو هەموو خستنە بەردەمەی لەمپەرو ئازاردانە.

بە کۆتایی جەنگی ئەحزاب یاخود خەندەق، وەکو فەرمووتان قۆناغێکی گرنگ دەستی پێ کرد، وەکو ڕابردوو نییە. پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جوان واقیعەکە ڕوون دەکاتەوە لە فەرموودەیەکیدا دەفەرمووێت: لەمەو دوا ئێمە لە گەڵیاندا دەجەنگین و دەچینە سەریان، ئەوان توانای ئەوەیان نەماوە هێرش بکەنە سەرمان[15]

سوپاس بۆ خوا دەوڵەتەکە بەهێزە، کەس توانای ئەوەی نەماوە هەڵیبکەنێت و لەناوی بەرێت، تەواو کۆتایی ئەوەش هات کە دوژمن بیر لەوە بکەنەوە جارێکی تر هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە.

ئەم قۆناغە نوێیە دەتوانین ناوی بنێین قۆناغی فەتح و تەمکین و سەروەری و بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە جیهاندا، ئیسلام زۆر بە خێرایی لەم قۆناغەدا بڵاو دەبێتەوە، نەک تەنها لە نیوەدوورگەی عەرەبی بەڵکو زۆر بەئاسانی لە هەموو جیهاندا، ئەویش نهێنییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هێز و عیزەت و دادپەروەری موسڵمانان.

سروشتی ئەم ئیسلامە وایە، سەرەتا بە نارەحەتی و سەختی دەست پێ دەکات و هەموو لایەک دژایەتی دەکات، لە دواییدا کە چرۆی کرد گوڵی گەشاوە سەر دەردەکات، هەرچی سەرمای زستان کاریگەربێت بەهار و هاوین خۆشتر و جوانتر دەبێت.

تەماشا بکە لە مانگی ذولقعدەی ساڵی ٥ کۆچی کە ئەحزاب ڕۆیشت و کۆتایی بە جەنگ هات.

---

١٥ ـ قالَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يَومَ الأَحْزَابِ: نَغْزُوهُمْ، ولَا يَغْزُونَنَا، صحيح البخاري، رقم ٤١٠٩.



هەر لەو مانگە دا قۆناغی نوێ دەستی پێکرد و موسڵمان هێرشی سەربازییان دەست پێکرد بە خێرایی بە ئامانجی سەرەکی کە هەموو ئەوانەی غەدریان کرد لە موسڵمان ئاقڵ بکرێن و هەموو لایەک ئەوە بزانن کە بزانرێت حورمەتی دەوڵەتی ئیسلامی و موسڵمان شتێکی هەروا ئاسان نییە، هەروا ناهێڵن بەسەریاندا بڕوات، دەبێت سەرپێچی کارانی سزا بدرێن.

لە ماوەی ساڵێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ٢٠ ڕۆژ جارێک سوپایەک لە شاری مەدینەوە ڕێک دەخات، هەر چەندە زۆر سەختە لە ٢٠ ڕۆژ دا سوپا دەربچێت لە ماوەی یەک ساڵدا، بەڵام ناچارن چونکە ڕەوشەکە ئەوە دەخوازێت و چاوچنۆک زۆرە لەسەر دەوڵەتەکە و بەتایبەت نووری ئیسلام، هەر گەل و میللەتێک جیهاد و خەبات نەکات زەلیل دەبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ئەگەر کارتان بوو بە سوو و سەلەم و ڕیبا خواردن، بە دوای کلکی مانگاوە بوون، بە واتای ئەوەی خەریکی شوانی و ماڵی دنیابن و حەز بە زۆری سامان و مەڕ و ماڵات بکەن یان خۆتان سەرقاڵ کرد بە کشتوکاڵ و هیواتان لەسەر بوونیادنا و وازتان لە کۆشش و خەبات و جیهاد هێنا، خوای پەروەردگار زەلیلی دێنێت بەسەرتاندا، ئەو بەڵا و نەگبەتەی دونیا وازتان لێ ناهێنێت تا نەگەڕێنەوە بۆ دینەکەتان.[١٦]

بە دڵنیاییەوە زەلیلی و سەرشۆڕی موسڵمان هۆکارەکەی خۆشەویستی بۆ دنیا و ترسانە لە مردن، هەرچی کەسە بەسەریدا زاڵ دەکات نەک هەر ئەوەش، بەڵکو خەڵکی بڕوا بە ئایینەکە ناکەن دەڵێن: ئەگەر دینەکەیان ڕاستە بۆچی بانگەوازی بۆ ناکەن، یان بۆ لە پێناویدا ناجەنگن، خەڵکی هیچ متمانەی پێ نامێنێت، چۆن دەبێت دینی خوای گەورەمان هەبێت و بیروباوەڕی مرۆڤ زاڵبێت لەم زەوییەدا، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ۝٨٥﴾ [یونس]

واتە: ئەوسا (ئیمانداران) وتیان: ئێمە ئیتر هەر پشتمان بەخوا بەوستووە، پەروەردگارا مەمانگێڕە بەهۆکاری سەرگەردانی بۆ قەومی ستەمکاران (کە هەم ئێمە ئازار بدەن هەم خۆشیان گوناهبار بن و دوور بکەونەوە لە ئیمان).

موسا بە قەومەکەی وت: ئەی قەوم و عەشرەتم ئەگەر ئێوە (بەڕاستی) باوەڕتان بەخوا هێناوە، دە ئیتر هەر پشت بەو ببەستن ئەگەر موسڵمانن.

---

[١٦] ـ إذا تبايعتم بالعِينةِ وأخذتم أذنابَ البقرِ ورضيتم بالزرعِ وتركتم الجهادَ سلط اللهُ عليكم ذُلًّا لا ينزعُه شيءٌ حتى ترجعوا إلى دينِكم رواه أحمد (٤٩٨٧) وأبو داود (٣٤٦٢) وصححه الألباني في صحيح أبي داود.



دەبێت هەموو لایەک ئەوە باش بزانیت هۆکاری نەهامەتی و نەگبەتی زۆر جار دەگەڕێتەوە بۆ لاساری موسڵمان و سەرپێچی کردنی، لەبەر ئەوە خەڵکی لایان ڕادەکات و هیچ متمانەیەکیان نابێت لە ناو گەلانی تر.

ئێستا من دەپرسم، ڕاغیب برام چی ڕوویدا لە دوای گەڕانەوەی ئەحزاب لە ساڵی ٥ کۆچی تا شەشی کۆچی ڕەوشەکە چی بوو، با بڕۆینە نێو خەڵکی؟!

ڕاغیب: بەگشتی تێڕوانینەکانت زۆر بە پێزبوو، دەمەوێت بڵێم ئەگەر ئەم تێگەیشتنە لەناو دوو ڕەوەندی ئەم ئوممەتە زیندوو بکرێتەوە، ئەوە دڵنیابە سەردەمی عیزەت و عیزەتی دەوڵەتی ئیسلامی و خەلافەت دەگەڕێتەوە.



## چالاکی سەربازی موسڵمان دوای خەندەق

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستەوخۆ دوای ڕۆشتنی سوپای ئەحزاب دەستی کرد بە جیهاد، لە کوێوە دەست پێبکات؟ بێگومان لەوە دەست پێدەکات کە هەموو عەرەبی لێکۆکردەوە بۆ لەناو بردنی موسڵمانی شاری مەدینە، سەرەتا سەرۆکی کۆکەرەوەی سوپای ئەحزابی لە بەنی قورەیزە دا نارد بۆ دۆزەخ، ئەویش(حوییەی کوڕی ئەختەب) بوو کە لەگەڵ (کەعبی کوڕی ئەسەد) سەرۆکی بەنی قورەیزە ، بەڵام حوییە لە بەنی نەزیر بوو، لەکاتی کوشتنی (کەعب) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کەعب زۆر ئامۆژگاریم کردی کە سەرپێچی و سەرەڕۆیی نەکەی، ئەویش لە وەڵامدا وتی: سوێند بە تەورات ئەی ئەبولقاسم، ئەگەر لەبەر سومعە و ترسی قەومەکەم نەبێت بڵێن کە لە شمشێر دەترسێت، ئەوا موسڵمان دەبووم و شوێنت دەکەوتم، بەڵام لەسەر دینی یەهوودم لەگەڵ قەومەکەمدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی لە ملی بدەن، ئەوەی کە ماوەتەوە لە قیاداتی بەنی نەزیر لە خەیبەر وەکو حوییەی کوڕی ئەختەب ترسناکە و توانای ئەوەی هەیە جارێکی تر سوپا کۆبکاتەوە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش ( سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیقە)[17] لەهەمان جۆری ئەو کەسانەیە کە هەرگیز بە دەردی خۆی دانانیشێت، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لەوە کردەوە ئەویش بەهەمان دەردی حوییەی بڕوات.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[17] ـ سلام بن ابی الحقیق.



# کوشتنی سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیق

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا ﷺ مەفرەزەیەکی ڕێکخست تەنها بۆ کوشتنی سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیق لە خەیبەر، کە نزیکەی ١٥٠ کم دوورە لە باکووری مەدینەوە، سەرۆکی ئەم مەفرەزەیە (عەبدوڵڵای کوڕی عەتیک) بوو -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- ئەو مەفرەزەیە هەموو لە خەزرەجییەکان بوون، لە مانگی زولحیجەی ساڵی ٥ کۆچی دا بوو یەک مانگ بەدوای ڕۆشتنی سوپای ئەحزاب، ئەوەش فکرەی سەربازی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە چەندە ورد و دەقیق بوو، چونکە بەو مەفرەزەیە گەورەترین سەرۆکی فیتنە و تاوانباری جەنگ لەناو دەبات، لەگەڵ ئەوەشدا هاندەر و کۆکەرەوەی سوپایە ئەو توانایەی هەیە لە نزیکترین و زووترین کاتدا.

مەفرەزەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەتیک توانیان بەسەرکەوتووی سەلامی کوڕی حوقەیق بکوژن، موسڵمانان لە فیتنەی ئەم سەرۆکی فیتنەیە ڕزگاریان بوو، ئەمەش زەرەر و زیانێکی زۆر گەورە بوو لە یەهوود بەگشتی، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی سەرکەوتنی موسڵمانان بەکاربهێنێتەوە بۆ هێرش کردنە سەر ئەوانەی کە بەشداربوون لە جەنگی ئەحزاب، لە دوای لەناو بردنی بەنی قوڕەیزە و کوشتنی دوو سەرکردەی بەنی نەزیر، پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای دابەشکرد بەسەر هەموو نیوەدوورگەی عەرەبدا بۆ ئاقڵ کردن و سزادانیان بۆ ئەوانەی کە بەشداربوون لە لەناوبردنی موسڵمانان، ئیتر بۆ ئەوەی هەرگیز بیر لە چوونە سەر موسڵمانان و هێرش کردنە سەریان نەکەنەوە.



# مەفرەزەی محەمەد کوڕی مەسلەمە

ڕاغیب: هەر لەدوای گەڕانەوەی هێزەکەی (عەبدوڵڵای کوڕی عەتیک)[18] لە خەیبەر بە سەرکەوتوویی دوای ئەو یەکەم هێز کە هێرشی برد هێزەکەی محەمەد کوڕی مەسلەمە بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ناردی بۆ ناوچەیەک بەناوی (قرطاء) کە (٣٠٠)کم لە شاری مەدینە دوورە، ناردی بۆ ناو هۆزی بەنی کیلاب و بەنی بەکر، ئەم دوو هۆزە بەشداربوون لە جەنگی ئەحزاب، لەگەڵ ئەوەی هێزەکەی محەمەد کوڕی مەسلەمە تەنها پێکهاتبوو لە (٣٠) سوارچاکی موجاهید، بەڵام دەستکەووتێکی زۆر گەورە و سەروەری زۆر گەورەیان تۆمارکرد، هەرگیز ناگونجێت بە بیرکردنەوەی سەربازی ماددی ئەو هێزە بچووکە سەروەری وا گەورە تۆماربکەن، هۆزی بەنی بەکرد کە ئەو هێزەی موسڵمانی بینی هەموو هەڵاتن و بەناو بیاباندا پەرش وبڵاو بوونەوە.

(١٠) کەسی لێکوشتن و (١٥٠) وشتری لێ گرتن و زیاتر لە (٣) هەزار سەرەمەڕی لێ گرتن.

کاریگەری ئەم هێزە زۆر بەهێز بوو زیاتر باری دەروونی موسڵمان بەرزبوویەوە و هەیبەت و شان و شەوکەتیان لە ناو عەرەبدا زۆر بەهێزتر بوو، ترسیان خستە دڵی هەموو هۆزەکانی عەرەب، تا ڕادەیەک گوزەرانی ئابووری لە مەدینەدا باش بوو چونکە لە دوای قەیرانی سوپای ئەحزاب موسڵمان زۆر هەژار و برسی بوون.

باری دەروونی موسڵمان باش بەرز بوویەوە، لە حاڵەتی ئەوە دەرچوون کە وا بزانن تەنها هێرش دەکرێتە سەریان پێچەوانە بوویەوە ئێستا ئەمانە هێرش دەبەن، بێجگە لە هەموو ئەم دەسکەوتانە، دەستکەوتێکی زۆر گەورەتریان دەستکەوت کە هەرگیز بەخەیاڵیاندا نەهاتبوو.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[18] ـ عبدالله بن عتيك.



# بە دیل گرتنی سومامەی کوڕی ئوسەیل و موسڵمانبوونی

ڕاغیب: لە گەڕانەوەی هێزەکەی محەمەد کوڕی مەسلەمە کەسێکیان بەدی کرد لە نزیک شاری مەدینە جێگای گومانی ئەو هێزە بوو، محەمەد کوڕی مەسلەمە دیلی کرد و لەگەڵ خۆیدا هێنای بۆ شاری مەدینە، چونکە لای هێزەکە ناسراو نەبوو. لە ڕاستی دا ئەو کەسە گەورەی بەنی حەنیفە بوو، یەکێک بوو لە دەوڵەمەندەکانی عەرەب و ناسراوەکانی عەرەب، هۆزی بەنی حەنیفە هۆزێکی زۆر گەورە بوون لە نیوەدوورگەی عەرەب دا.

هاتبوو بە نهێنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بکوژێت، گرتنی ئەم پیاوە لە ڕێگادا کارێکی زۆر باش و ئیجابی بوو، نەک لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندی عەرەبە و گەورەی هۆزی بەنی حەنیفەیە.

با بزانین چی ڕوو ئەدات لەم پیاوە دیلە، موسڵمان بەستیانەوە بە کۆڵەگەی مزگەوتەکەوە کاتێک پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بینی پێی فەرموو: سومامە پێم بڵێ چی ئەکەیت چی لە هەگبەت دایە؟!

سومامە وتی: خێر و چاکەم پێیە ئەی محەمەد صلى الله عليه وعلى آله وسلم وتی بە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەگەر بمکوژی ئەوە گەورەیەکی هۆزی عەرەبت کوشتووە، لە دوامەوە هۆزێکی گەورە هەیە ناهێڵێت خوێنم بەهەدەر بڕوات تۆڵەم دەکەنەوە، خۆ ئەگەر چاکەم لەگەڵ بکەیت و ئازادم بکەیت هەرگیز چاکەت لەبیر ناکەم ؟ ئەگەر داوای پارە دەکەیت بە ئارەزووی خۆت داوا بکە بۆ ئازادبوونم پێت ئەبەخشم، شێوەیەک بوو لە هەڕەشە و ملکەچی.

بەڵام پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە سوپای قوڕەیش و ئەحزاب نەترسا، ئێستا لە هێزێکی وەکو بەنی حەنیفە هەرگیز گوێ نادات، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەدوای سەروەت و سامانەوە نییە موسڵمان بوونی کەسێکی لەلا خۆشەویستترە لە هەموو ئەم گەردوونە.

بۆیە زۆر گوێی پێ نەدا و وازی لێ هێنا، داوای کرد لە هاوەڵان کە لە بەردەمیدا باسی ئایین و قورئان خوێندن بکەن و تا لە ڕەوشتی موسڵمانان و برایەتی و خۆشەویستی نێوانیان تێبگات.

بۆ ڕۆژی دووەم هاتەوە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: بزانم چیت لە هەگبەدایە و بیر لەچی دەکەیتەوە سومامە؟!

سومامە وتی: خێر و هیچ، قسەکانی دوێنێی دووبارە کردەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم وازی لێ هێنا و تا زیاتر لە ناو موسڵماناندا بێت و لە نوێژ و وانە و فێربوونیان تێبگات و نێوانی



سەرکردە و سەرباز و حاکم و حکومی موسڵمانان زیاتر بناسێت، بۆ ئەوەی ئیسلام لە ڕووی واقیعەوە زیاتر بناسێت.

بۆ ڕۆژی سێیەم: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەمان پرسیاری لێ کرد، زانی کە نیشانەی وەرگرتنی هیدایەتی پێوە دیارە، ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە، بەڵام زانی کە سەرسامە بە موسڵمان و دینەکە.

بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەروا ئازادی کرد بێ فیدا و هیچ پارەیەک، ئەویش لەوە تێگەیشت کە ئەم پیاوە سیاسی و کەسێکی سەربازی نییە بەتەنها، بەڵکو زۆر لەوانەش گەورەترە. عەرەب بەشێوەیەکی گشتی ئازا و ڕاستگۆ بوون ئەویش گەورەی بەنی حەنیفەیە و سەرمایەدارێکی سیاسی گەورەیە، بۆیە هەر لەدوای ئازاد کردنی چووە نزیک دارخورمایەک، غوسڵی دەرکرد و گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕاستەوخۆ وتی ( أشهد إن لا اله الا الله، وانک یا محەمەد رسول الله)، دیار بوو فێری ئەوە ببوو کە دەبێت هاتنە ناو ئیسلام غوسڵ دەرکردنە و دەبێت پاک بیتەوە.

ئەو نەیدەویست لە کاتی دیلیدا موسڵمانان بوونی خۆی ڕابگەیەنێت، بۆ ئەوەی نەڵێن مونافیقە و ترسنۆکە، دوای ئازاد بوونی بە هەڵبژاردەی خۆی موسڵمان بوو.

ئینجا دوای ماوەیەک لە خزمەتی موسڵمان و پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دا مایەوە هیچ پێویستی بەوە نەکرد، بەڵکو ڕاستەوخۆ خۆی بڕیاریدا وتی: سوێند بەخوا ئەی محەمەد پێشتر لە ژیانمدا لە تۆ زیاتر ڕقم لە کەسێتر نەبووە، بەڵام ئێستا لە تۆ زیاتر کەسم خۆشناوێت، لەسەر ئەم زەویەدا لەهەموو شتێک زیاتر ڕقم لە دینەکەی تۆ بووە، بەڵام ئێستا خۆشەویسترین دین دینەکەی تۆیە.

چ چرکە ساتێکی خۆشە! ئیمان چۆتە ناو دڵی ئەم هاوەڵە بەڕێزە، ئەوەش کاریگەری عەفوو و لێ خۆشبوونی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

سومامە پێشتر وا بڕیاری دابوو کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکوژێت و بڕوات بۆ عومرە، چووە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فورمووی ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێش ئەوەی دەستگیر بکرێم و موسڵمان بم پلانم وابوو دوای کوشتنی تۆ بڕۆم بۆ عومرە جا نازانم چی دەفەرموویت؟

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمانی پێکرد کە بڕوات عومرەکەی بکات.

کاتێک چووە شاری مەککە و موشریکەکان زانیان موسڵمان بووە، یەکێک لە موشریکەکان وتی: ئەوە چییە، تۆش تووش بوویت! واتا بەوەی تووشی موسڵمان بووە، وەکو تانەو تەشەر



ئەیاندا لە موسڵمان دەیانوت (صبأت) وەکو بلّێ کافربوویت بە دینی باو و باپیرانت، بتپەرستی؟!

ئەویش وتی: نەخێر بەڵکو موسڵمان بووم بوومە یەکێک لە ئیمانداران و شوێنکەوتووی محەمەد پێغەمبەری خوا ﷺ پێشتر تووشی سەرگەردانی و بتپەرستی و خورافات ببووم، بەڵام ئێستا سوپاس بۆخوا موسڵمان بووم.





# گەمارۆی سومامەی کوڕی ئوسەیل بۆ قوڕەیش

ڕاغیب: لە دوای ئەوەی کە سەرکردەکانی قوڕەیش هەڵوێستیان زۆر ناشرین بوو لەگەڵیدا ئەویش بڕیارێکی زۆر ناوازەی دا، بەوپەڕی جورئەت و ئازایی و بەرخودان وتی: ئەی سەرکردەکانی قوڕەیش، سوێند بە خوا لە (یەمامەوە) یەک دەنک گەنمتان بۆ نانێرم هەتا وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگام نەدات.

بڕیارێکی زۆر سەیر و ناوازە! بڕیاریدا گەمارۆی ئابووری بخاتە سەر قوڕەیش کە بە هێزترین هۆزی ناوچەکەن، لەبەر ئەوەی دژی ئیسلامن، ئەوەش ئازایەتی ئەو هاوەڵە بەڕێزەبوو، هەموو پەیوەندی لەگەڵ قوڕەیش دەپچڕێنێت، تا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدەکات، ڕووبەڕووی بەهێزترین پیاوان و هێز و مێژووی پەیوەندی قوڕەییش دەبێتەوە، ئەمە هێزی ئیمانە و دیاری خواییە تا دوێنێ بوو قوڕەیش گەمارۆی خستە سەر موسڵمانان لە خەندەق بە ١٠ هەزار سەرباز، بەڵام وا بەیەک کەس لە هاوەڵ گەمارۆ دەخاتە سەر شاری مەککە کە دانیشتوانی ١٠ هەزار کەسە!

ئەوە هێزی قەزا و قەدەری خوای پەروەردگارە!

سومامە گەمارۆی ئابووری خواردنی خستە سەر شاری مەککە، چونکە یەمامە سەرچاوەی گەنم و جۆ بوو بۆ شاری مەککە، تەنانەت ناونرابوو بە عەمباری مەککە، یاخود لادێی مەککە، ئەمەش کاریگەری ئازار و نارەحەتی زۆر دەخاتە سەر شاری مەککە، کە ئیتر نان و ئارد بە تەواوەتی لە قوڕەیش برا و تەنانەت یەک نانیان پێ درووست نەدەکرا، بۆ قوڕەیش گەمارۆیەکی زۆر سەخت و ترسناک بوو.

لە بەرامبەردا بۆ سومامەی کوڕی ئوسەیل، زەرەر و زیانی زۆر بوو کە پارەیەکی زۆر لە دەست ئەدات، لەگەڵ قوڕەیش بە تەواوەتی پەیوەندی سیاسی و ئابووری پچڕاند لە کۆتاییدا سومامە ژیانی لەسەر کڕین و فرۆشتن دەڕوات، بەڵام لە پێناوی خوا گوێی پێ نادات و گەورەترین قوربانی (تەضحیە) ئەدات، تەواو دەیەوێت بازرگانی لەگەڵ خودا بکات، تاکە بازاڕێکە کە خەڵکی هەرگیز زەرەرمەند نابێت بەڵکو هەمیشە یەک بە حەوتە و قازانج دەکات.

ئەمەش هەمیشە توانای ئوممەتی ئیسلامیمان بۆ دەردەخات کە دەتوانێت گەمارۆی ئابووری بخاتە سەر دوژمنانی، جا لە ئێستادا لە ڕێگەی میوە و خواردن و نەوت و گاز ..هتد.

ئەمەش سروشتی جەنگە سەرکەوتن نایەت، مەگەر مرۆڤ هەوڵی بۆ نەدات، سەرکەوتن هەروا ئاسان و سادە نییە، بەڵکو دەبێت لە پێناویدا پارە و ماددەی زۆر ببەخشێت.



ئەوەی بەو سەروەت و سامانە تەنانەت ڕۆحی خۆت دەیگریت بەهەشتە ئەویش هەروا هەرزان و ئاسان نییە، لە پێناو بەهەشت دەبێت زۆر ببەخشیت بەهەشت کەرەستەیەکی زۆر گران بەهایە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (کەرەستەی خوای گەورە گرانە، ئەویش بەهەشتەکەیەتی ( الا إن سلعة الله غالية ألا إن سلعة الله الجنة).

بەڵێ بۆماوەی چەند مانگێک گەمارۆی ئابووری خستە سەر شاری مەککە، کاریگەری زۆری خستە سەرشاری مەککە و بەتەواوەتی خەریک بوون بەرەو هەلاکەت بڕۆن، چەند جار هەوڵیان دا قسە و گفتوگۆ لەگەڵ سومامە بکەن، بەڵام هەموو هەوڵەکانیان شکستی خوارد ئەویش مەرجی لابردنی گەمارۆکەی ئەوەبوو تا ئەوکاتەی پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبێت گەمارۆ لاناچێت، قوڕەیش هیچ چارەیەکی تری نەما بە زەلیلی ناچار بوون بڕۆنە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ وازیان لە هەموو لوتبەرزی و فیرعەونی خۆیان هێنا و شاندێکیان پێکهێنا کە داوا لە پێغەمبەر ﷺ بکەن سومامە گەمارۆکەیان لەسەر لابەرێت وا خەڵکی شاری مەککە هەموو لە ناو دەچن، تەنها ڕێگەیان بدات کە ئارد و گەنم لە سومامە بکڕن، نامەیەک یاخود پەیامێک بنێرن بۆ سومامە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیتوانی بڵێت نەخێر لەسەر ئەو هەموو ئازارەی جەنابیان و موسڵمانیان داوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نارد بۆ سومامە ڕێگایان بۆ بکاتەوە بۆ فرۆشتنی ئارد و گەنم.

ئەم هەڵوێستەی زیاتر توانا و هێزی موسڵمانی بەرز کردەوە هێزێکی تایبەتی پێ بەخشین کە لەمەودوا توانای ئەوەیان هەیە گەمارۆ بخەنە سەر دوژمن.

بەڵێ ڕاستە مەفرەزەکەی محەمەد کوڕی مەسلەمە بچووک بوو تەنها (٣٠) سوار چاک بوو.

بەڵام خێرێکی زۆر گەورەی تێدابوو بۆ ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جار خێر و دیاری خوا لە جێگایەکەوە دێت کە موسڵمان هەر بەخەیاڵیشیان دا نەهاتووە، بەڵام لە ئەنجامی کارکردن خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ...﴿٣﴾﴾ [الطلاق]

بۆخۆی سەرکەوتن جۆرێکە لە ڕۆزی و ڕزق کە خوای پەروەردگار دەیبەخشێت.

لە دوای مەفرەزەکەی محەمەد کوڕی مەسلەمە و کە چەندە کاریگەری هەبوو، پاشان لە دوای بەرز بوونەوەی مەعنەویاتی موسڵمان و ترسی عەرەب و شکستی قوڕەیش و ئیسلام بوونی سومامەی کوڕی ئوسەیل، دوای ڕزگاربوون لە سەرکردە تاوانبارەکانی جەنگی یەهوود و



لەسەرووی هەموویانەوە حوییەی کوڕی ئەختەب و سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیقە و هەموو ئەو سەرکەوتنانە پێغەمبەری خوا ﷺ بە کاری هێناوە، بۆ ئەوەی هێرشی سەربازی زیاتر بکەنە سەر ئەحزاب، ئەوانەی هێرشیان هێنایە سەر مەدینە پێغەمبەر ﷺ باش دەیزانی کەس هاوکاری قورەیش ناکات بۆ جەنگ و سەرقاڵن بەناوخۆی خۆیانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار بوو بە نەخشە و جوگرافیای ناوچەکە بە گشتی، زۆر بە ڕێکخستنێکی ناوازە سوپای نارد بۆ هەموو ناوچەکانی نیوەدوورگەی عەرەبی لە شێوەی تۆڕی ماسی، کە توانی هەموو ڕێگا و بانەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کۆنترۆڵ کرد.

دروشمی ئەم قۆناغە ئەوەبوو (الآنَ نَغْزُوهُم وَلا يَغْزونَنا، نَحْن نَسيرُ اليْهِم)

ئێمە هێرش دەبەین و ئەوان توانای هێرشیان نەماوە.



# غەزوەی بەنی لەحیان، بە سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ

یەکەم هێرش کە خۆی بەشدار بوو پێغەمبەری خوا ﷺ هێرش بوو بۆ سەر بەنی لەحیان, ئەو تیرە و هۆزەکە (٧٠) هاوەڵ لە مەعوونە و (١٠) لە ڕەجیع غەدریان لێ کردن و هەموویان شەهید کرد کە ناسرابوون بە تیرەی (عەضەل و قارە) بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو موسیبەتەی هێنایان بەسەر موسڵماندا، زۆر کاریگەربوو تاماوەی مانگێک پێغەمبەر ﷺ لە هەموو نوێژەکانیدا قونووتی دەخوێند، ئەم سوپایەی پێغەمبەر ﷺ لە مانگی ڕەبیعول ئەوەلی ساڵی ٦ کۆچی بوو، ئەم هۆزە کە دوو تیرەی عەضەل و قارە لە خۆ گرتبوو زۆر ترسناک بوون، هەمیشە خەریکی چەتەیی و ڕێگری بوون. ئەم هۆزە نزیکەی (٤٠٠) کم لە شاری مەدینەوە دوورە، لە خوارووی شاری مەدینە دایە واتا (٩٠) کم لە شاری مەککەوە دوورە بە هەموو پێوەرێک جەنگێکی زۆر ترسناکە، لەوانەیە هەر لەبەر ئەو هۆکارە بووبێت کە خودی جەنابی پێغەمبەر ﷺ بەشدار بوو، هەر لەدوای گەڕانەوەی مەفرەزەکەی محەمەد کوڕی مەسلەمە لە (قرضاء) پێغەمبەری خوا ﷺ بەخۆی و ٢٠٠ سوارەوە دەرچوون بۆ جەنگی بەنی لەحیان، سەرەتا بۆ چەواشەکاری ئەو چاو و موخابەرەتانەی کە هەواڵی ئەوانیان دەگواستەوە سوپاکە ڕووە و شام کەوتە ڕێ، پاشان پێغەمبەر ﷺ ئاڕاستەکەی گۆڕی بۆ باشووری مەدینە، تا گەیشتە ناو ماڵەکانی بەنی لەحیان، هەستیان بە سوپاکە نەکرد، هەموو هەڵاتن بۆ سەر شاخەکان و ماڵ و کەرەستەکەیان بە جێهێشت، هەر چەندە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی نیاز نەبوو کە بەنی لەحیان هەڵبێن، بەڵام هەڵهاتن کە لە ناو عەرەب زۆر عەیب و نەنگییە، ترسنۆکی لە ناو عەرەبدا و لەناوچەکەدا شتێکی قێزەون و نەنگی بوو زۆر پێی شکان، زۆر لە ناو خەڵکیدا سەرزەنشت کران. خوای گەورە ترسێکی وای خستە دڵیان کە ئەژنۆیان شکابوو، لە ناو هەموو هۆزەکانی عەرەب سەرزەنشت دەکران، هەر بیریان لە بەرگری و جەنگ نەکردەوە، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕۆژ لەناو ماڵەکەیان مایەوە وەکو سوپای سەرکەوتوو، مەفرەزەی بچوکی دەنارد بۆ ڕاوەدوونانیان، پێغەمبەری خوا ﷺ مەفرەزەیەکی ١٠ کەسی نارد بۆ سەر سنوورەکانی شاری مەککە، فەرمانی پێکردن کە خۆیان نیشان بدەن و تا خەڵکی مەککە هەموو پێیان بزانن، ئەو مەفرەزەیە گەیشتە جێگایەک ٦٤ کم دوور بوو لە شاری مەککە بە ناوی (کوراع غەمیم)[١٩] خەڵکی شاری مەککە ئەژنۆیان شکا لەو ١٠ سوارەی موسڵمانان، قورەیش ئەژنۆی شکا و هاواریان لێ هەڵسا محەمەد هاتووە بۆ فەتحی شاری مەککە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دوای دوو ڕۆژ بۆ شاری مەدینە گەڕایەوە،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٩] ـ كراع الغميم.



قورەیش لە خۆشیدا هەناسەی خۆشی هەڵکێشا، چونکە قورەیش هەموو دەستیان دایە چەکەکانیان.

ئەم هێزە بەسەرپەرشتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەوەندەی تر ترس و برینی خستە دڵی عەرەبی موشریکی ناوچەکە.



## غەزوەی (ذي قرد) بەسەر پەرشتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دوو هەفتەی پێچوو لە جەنگی بەنی لەحیان و تا گەڕاوە شاری مەدینە، لەو ماوەیەدا کەسێکی بەناوی (عویینەی کوڕی سەحنی فەزاری) کە لەتیرەیەکە لە هۆزی غەتەفان، خۆی لەگەڵ چەند کەسێک دا وەکو ڕێگر و چەتە چوونە جێگایەک کە ناوچەیەکی بچووک بوو سەر بە شاری مەدینە بوو لە ژێر دەستی موسڵماندا بوو بەناوی (غاية) لە موڵکی موسڵمان چەند سەر مەڕێک و وشترێکی لەگەڵ خۆی دزی و پاشان کوڕەکەی ئەبو ذەڕی غیفاری کوشت، ژنەکەی ئەبو زەڕی ڕفاند، پاشان بەرەو باکووری مەدینە مەنزڵگای غەتەفان هەڵهات، هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەگەڕانەوەی بوو نزیک شاری مەدینە، خێرا وەستا و بەرەو ناوچەی (غاية) کەوتە ڕێ و ئەوەی هەواڵەکەی بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هێنا هاوەڵی بەڕێز (سەلمەی کوڕی ئەکوع)[20] بوو لە تیرهاوێژەکانی ڕووداوی ئوحود هەر ئەو مابوو، لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خێرا هاتن بۆ ناوچەی (غایە) شەڕێکی ناوازەیان کرد، هەروەکو پیشەی هەمیشەی تیری هاویشت بۆ چەتەکانی (عویینەی کوڕی حوصەن) چەند کەسێکی لێکوشتن، خێرا کۆمەڵێک لە سوارچاکە خێراکانی بەشوێنیان دا نارد لەوانە (سەعدی کوڕی زەیدی ئەنساری، میقدادی کوڕی عەمر، عەبادی کوڕی بشیر، ئەبو قەتادە و عوکاشەی کوڕی موحسەن) و کۆمەڵێکی تر لە سوارچاکەکانی هاوەڵان -ڕەزامەندی خوا لە هەموویانبێت- پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: شوێنیان بکەون تاوەکو دەیان گرن.[21]

خێرا ئەو کۆمەڵە هاوەڵە چاپووکانە بە شوێنیاندا دەرچوون، تا گەیشتنە جێگایەک بەناوی (ذي قرد) ٥٣کم لە باکووری شاری مەدینەوەیە، ئەبو قەتادە کەسێکی لێکوشتن و هەروەها عوکاشە دوانی لێ کوشتن، هەندێک لە مەڕ و ماڵات و وشترەکانیان گەڕاندەوە و خێزانەکەی ئەبو زەڕی غیفاری لە دەستیان ڕایکرد بۆ شاری مەدینە و خۆی ڕزگار کردبوو لە دەستیان شڵەژابوو.

هاوەڵان ١٥ بۆ ٢٠ کەس دەبوون، چوونە ناو جەرگەی غەتەفان، گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، سەلمەی کوڕی ئەکوەع وتی ئەی پێغەمبەری خوا ١٠٠ کەسم بدەرێ هەموو هۆزی غەتەفان دەگرم و شتەکانیش دەهێنمەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[20] ـ سلمة بن الأكوع.

[21] ـ أخرج في طلب القوم الحقك بالناس.



پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی نەبوو فەرمووی کاتی ئەوەمان نییە وشترەکان بۆ ئەوان، دەیزانی لە ئێستادا کاتی جەنگی غەتەفان نییە بە ١٠٠ کەس ئەوان ناگیرێن، دووریشە لە شاری مەدینەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەویست ببێتە ململانێ و جەنگ لە ئێستادا لەگەڵ غەتەفاندا، چونکە هێزت بە گوێرەی پێویست بۆ کۆنەکردوونەتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی واقعی بوو، لەسەر بنەمای هەست و سۆز کاری نەدەکرد بەڵکو ئەوەندەی توانی لە وشتر و ماڵ و سامان ڕزگاری کرد، ئەویش لە نزیک سنووری شاری مەدینە بوو زیاتر دوور نەکەوتەوە بۆ ناو غەتەفان و خۆی تەشریفی برد بۆ ناو بەنی لەحیان، چونکە هێزی غەتەفان و بەنی لەحیان زۆر جیاوازە غەتەفان چەندین جار هێزی لە قوڕەیش بەهێزترە.

جا لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو شتێکدا حەقی خۆی ئەدات، پێغەمبەر ﷺ پارسەنگی ڕاگرتبوو لە نێوانی هەموو سەنتەرەکانی هێزدا لە ناو نیوەدوورگەی عەرەبدا.

ئەوەش یەکێک بوو لەو غەزایانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە خۆی ئەنجامی دابێت لە ساڵی ٦ کۆچی دا بەڵام چەندین سریە و مەفرەزە و سوپای ڕێکخست بۆ ناوچەکە.



## مەفرەزەی عوكاشەی كوڕی مەحصەن

ڕاغیب: ئەم مەفرەزەیە دەرچوو بەرەو جێگایەک بەناوی (غەمر مەرزووق) لەوێدا كۆمەڵێک لە هۆز و تیرەی بەنی ئەسەد خۆیان ڕێكدەخست بۆ لێدانی موسڵمان، هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر لەو مانگەدا ئەم سوپایەی ڕێكخست كە جەنابیان گەڕابوونەوە لە جەنگی بەنی لەحیان و زی قرد، كەواتە ئەمیش لە ڕەبیعی ئەوەلی ساڵی ٦ كۆچی دابوو.

## مەفرەزەی محەمەد كوڕی مەسلەمە

ڕاغیب: ئەم مەفرەزەیە ڕێكخرا بۆ ناوچەی (ذی قصة) بۆ جەنگ كردن لەگەڵ هۆزی (بەنی ثعلبە) كە ٥٥ كم دوورە لە باكووری شاری مەدینە، ئەمیش لەمانگی (ڕەبیعی دووەم) ساڵی ٦ كۆچی.

## مەفرەزەی ئەبو عوبێدەی جەڕاح

ڕاغیب: ئەم مەفرەزەیە هەر لە دوای گەڕانەوەی محەمەد كوڕی مەسلەمە، خۆی ڕێكخست بۆ هەمان مەبەست كە لێدانی بەنی ثەعلەبە بوو لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی٦ كۆچی.

## مەفرەزەی (١)ی زەیدی كوڕی حارس

ڕاغیب: هەر لە هەمان مانگدا بۆ سەر هۆزی بەنی سولەیم بۆ ناوچەیەک ناسراوە بە (جموح) كە نزیكەی ١٠٠ كم لە شاری مەدینەوە دوورە، خۆیان ئامادە كرد بۆ جەنگ بەرامبەر بە موسڵمان كە لە نزیک شاری مەدینە دابوون.

## مەفرەزەی (٢)ی زەیدی كوڕی حارس

ڕاغیب: دوای چەند ڕۆژێک لە گەڕانەوەی مەفرەزەی یەكەمی زەیدی كوڕی حارس لە مانگی (جەمادی یەكەم)ی ساڵی ٦ كۆچی پێغەمەری خوا ﷺ ناردیەوە بۆ ناوچەیەک بەناوی (عیص) لە باكووری ڕۆژئاوای شاری مەدینە بۆ سەر ڕێگای شام، كە قافڵەیەكی قورەیش پێیدا تێپەڕ دەبوو، هێرشیان كردە سەر قافڵەكە و هەموو قافڵەكە دەست بەسەركرا و هێندرایەوە بۆ شاری مەدینە.



## مەفرەزەی (٣)ی زەیدی کوڕی حارس

ڕاغیب: لە مانگی (جەمادی کۆتایی) جارێکی تر زەید دەرچوو بۆ ناوچەی (طەرف) کە نزیکەی ٦٠ کم دوورە لە سەر ڕێگای عێراق، بۆ هۆزی (بەنی سەعلەبە) پێشتر هێزێکی چەتە و دڕبوون، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەوەندەی مەفرەزە و هێزی کردە سەریان تا تەمێی کردن، وازیان لە چەتەیی و ڕێگری و هێرش کردن هێنا.

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەیەوێت زەید زیاتر لە مەیدانی جەنگ زیاتر شارەزا بێت و چونکە ئامادەی دەکات بۆ جەنگێکی زۆر گەورە ئەویش جەنگی ڕۆمە کە موئتەیە.

## مەفرەزەی (٤)ی زەیدی کوڕی حارس

ڕاغیب: لەهەمان مانگی جەمادی کۆتایی لە ساڵی ٦ کۆچی زەید خۆی و هێزەکەی چوونە ناوچەی (عیص) لە باکووری نیوەدوورگەی عەرەبی، ئەم هێزە زۆر دوورکەوتەوە بەڵام ناردنی ئەو هێزە زۆر کاریگەری هەبوو بۆ ناوچەی شام، پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نامەیەکی بە دەحیە کەلبیی دا ناردبوو بۆ ڕۆم و قەیسەرەکەی هیرەقل، قەیسەری ڕۆم نامەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەرگرت و دوای خوێندنەوەی دیارییەکی زۆری لە زێڕ و خشڵ و زیوو نارد بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

لە کاتی گەڕانەوەی دەحیە کەلبی بۆ شاری مەدینە، لە ڕێگادا یەکێک لە سەرۆک هۆزەکانی (جوزام) هێرشی کردە سەر (دحیەی کەلب) هەموو دیارییەکانی لە دەحیە سەند و دەحیە و هێزەکەی شەڕیان لەگەڵ کردن تا هۆزی (بەنی زەبیب) بەدەمیانەوە چوون و هەموو دیاری و کەرەستەکانیان وەرگرتەوە لە سەرۆک هۆزی جوزام بەناوی (جونەیدی کوڕی عەوس)[٢٢] کە کوڕەکەی و کۆمەڵێکی لەو ڕێگرییە دا بەشداربوون، دەحیە و کەرەستەکان گەیشتنەوە شاری مەدینە و هەمووی بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باسکرد کەچی ڕووی داوە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ تەمێکردنی ئەو هۆزە ئەم مەفرەزەیەی ڕێکخست، ئەگەر چی هۆزی زەبیب، کە هۆزێکی موسڵمان بوون و بەدەم دەحیەوە چوون بەڵام سەرووەری دەوڵەت لە کەداربووە، کێشە لێرەدا دیاری و ئاڵتون نییە، کێشەکە ئەوەیە نابێت کەس جورئەتی ئەوەی هەبێت دەستدرێژی بکاتە سەر حورمەتی و هێز و دەوڵەت و سەرووەت و شان و شەوکەتی موسڵمان.

---

[٢٢] ـ جنید بن عوص.



بۆ ئەوەی هەموو لایەک بزانێت کە دەوڵەتی ئیسلامی خاوەنی هەیبەتی خۆیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ حورمەتی پیاوێکی موسڵمان، یاخود ئافرەتێکی موسڵمان وەکو حورمەتی دەوڵەتەکەی تەماشا دەکرد، هەربۆیە سوپای ڕێکخست بۆ تەمێکردنیان بەتایبەت جونەیدی کوڕی عەوس.

بەڕاستی ئەم جەنگ و هەڵوێستەی پێغەمبەر ﷺ پێویستە بە ئاوی ئاڵتون بنووسرێتەوە لەهەموو ماڵێکی موسڵماندا هەبێت، بزانن عیزەت و کەرامەتی موسڵمانان و پێغەمبەرەکەیان چەندە بەرز و پیرۆزە، پێشتر بینیمان بۆ حورمەتی ئافرەتێکی موسڵمان هەموو بەنو قەینوقاعی دەرکرد، وا ئێستا هۆزێکی گەورە لە باکووری مەدینە هێرشی کردۆتە سەر شاندێکی موسڵمان، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ تۆڵە سەندنەوە سوپای ڕێکخستووە، خەڵکی ناو دەوڵەتی ئیسلامی هەست بە ئەمن و ئاسایش دەکەن لە ناو دەوڵەتەکە و دەرەوەی دەوڵەتەکە دەزانن هێزێک هەیە بەرگریان لێ دەکات و دەیان پارێزێت، یەقینیان هەیە دەوڵەتێک پشتگیری هاوەڵانی خۆی دەکات، ئیتر چۆن خەڵکی ناو ئەو دەوڵەتە بەگیان و خوێن و سامانی بەرگری ناکات لە دەوڵەت، کە پارێزگاری کەرامەتیانە.

ئەو هۆزەی کە دەستدرێژی کرد ٨٠٠کم دوورە لە شاری مەدینەوە بیابانێکی دوور لە نێوانیاندا هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ کەرامەتی دەوڵەت و خەڵکەکەی بەلاوە گرنگە، بۆیە ٥٠٠ سوارچاکی ئامادەکرد لەگەڵ زەیدی کوڕی حارس دا و ناردنی بۆ ناوچەی هۆزی جوزام، زەید بە شەودا ڕێگای دەکرد و بە ڕۆژدا پشووی ئەدا، لە دوای ١٠ ڕۆژ ڕێگا بڕین لە بەیانی یەکەمی زوودا زەید دای بەسەر هۆزی جوزام دا و جونەید کوڕی عەوس و کوڕەکەی و چەندین کەسی لێ کوشتن، پاشان زیاد لە ١٠٠ دیلی لێ گرتن و ١٠٠٠ وشتری بە غەنیمەت گرت و زیاد لە ٥ هەزار سەر مەڕی لێگرتن زیاد لە ١٠٠ منداڵ و ئافرەتی عەشیرەتەکەی دەست بەسەر کرد و لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە بۆ شاری مەدینە.

بە هەموو پێوەرێک سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بوو، بۆ ئەوەی هەموو کەس بزانێت حورمەتی موسڵمان و دەوڵەتی ئیسلامی هەروا ئاسان نییە، دەبێت خەڵکی نیوەدوورگەی عەرەبی ئەوە باش بزانێت، دەبێت بزانن دەوڵەتی ئیسلام واتە جەنگ و جیهاد و هەیبەت.

لەگەڵ ئەوەی کە موسڵمانان لە قەیرانێکی ئابووری سەخت دان، بەڵام لەهەڵوێستێکی ناوازەی (رسول الله) هەموو دیل و مەڕ و ماڵات و وشترەکانی ناردەوە بۆ جوزام، ماڵ و منداڵی ئازاد کرد.

بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم کارەی کرد؟!



لەبەر ئەوەی وەفدێکی ئەو هۆزە بەناوی (زەیدی کوڕی ڕەفاعەی جوزامی) پێشتر موسڵمان ببوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ داوای لێکرد کە ئەمانی وەرگرتووە لە دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ، هیچی نەداوە لە ناوچەوانی بڵێت هۆزەکەی پەیمانەکەیان شکاندووە، ئەو سەرپێچی ئەوان وایکرد کە ئەو شەڕ و شۆرە تاوقەی خۆتان و ئێمەش بکەن، بەڵکو هەمووی دایەوە دەستی، بۆ ئەوەی هەموو لایەک بزانێت کە دەوڵەتی ئیسلامی خواناسی و ڕاستگۆیی و حورمەتی خەڵکەکەی لا مەبەستە نەک سەروەت سامان، ئەمان چەتە و ڕێگر نین، بەڵکو دەوڵەتێکی خاوەن ڕێز و هەیبەتن، سبحان الله! ئەو کارەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بووە هۆکاری ئەوەی کە ئەوەشی لە ناو هۆزی جوزام موسڵمان نەبوو، لە دوای هەڵوێستی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کە هەموو گیرا و سەروەت و سامانی بۆ گەڕاندنەوە هەموو موسڵمان بوون.

ئەمەش کردار و تەحەروکێکی زۆر سیاسی و حەکیمانەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو کە خەڵکی هەموو زانیان، دەوڵەتی ئیسلامی بەدوای خۆشی خەڵکەوەیە نەک کۆکردنەوەی سامان و سەروەتی دەوڵەتەکەوە.



## مەفرەزەی (٥)ی زەیدی کوڕی حارس

ڕاغیب: لە دوای گەڕانەوەی لە ناوچەی هۆزی جوزام، چەند ڕۆژێک لە شاری مەدینە مایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هێزێکی تری دایەوە، ڕاستەوخۆ دەرچوو بۆ جێگایەک بەناوی (دۆڵی قوڕا)کە هۆزی فەزارەی لێ بوو ئەو هۆزە پێش سێ مانگ لەمەوبەر هێرشیان هێنا بۆ شاری مەدینە بە سەرکردایەتی (عویینەی کوڕی حوسن)، چووە سەریان و هەموویان ڕایان کرد ئەمیش لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٦ کۆچی دا بوو.

## غەزوەی بەنی موستەڵەق بەسەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی بۆهات لەلایەن چاو و دەزگاکانی سەربازی خۆیەوە کە هۆزی بەنی موستەڵەق کۆبوونەتەوە بەنیازی هێرشکردنە سەر شاری مەدینەن.

بەزووترین کات پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای ئامادە کرد، ویستی پێش ئەوەی ئەوان بدەن بەسەر شاری مەدینەدا، ئەم هەڵکوتێتە سەریان، دەرچوونی ئەم سوپایەی پێغەمبەر ﷺ کە خۆی سەرپەرشتی دەکرد لە مانگی ٢ شەعبانی ساڵی ٦ کۆچی دا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ناوچەکەیان و کە ناسرا بوو بە (ئاو مەرسیع) و پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکەوت بەسەریان دا، غەنیمەتی زۆری لێ گرتن و هەموو ئافرەتانی هۆزەکە کەوتنە ژێر دەستی موسڵمان، لە ناویان دا (جوەیریەی کچی حارس) کە کچی سەرۆک هۆزەکە بوو، باوکی ناوی (حارس کوڕی زیرار) بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ لێدانێکی سەربازی زۆر باشی لێدان، هەموو پیاوەکانی ڕایان کرد لە ناوچەکە دا و پەرشوبڵاو بوونەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد کە کچی سەرۆک هۆزەکە هاوسەرگیری لەگەڵ بکات و ئازادی بکات، ئەویش ڕازی بوو، خاتوو (جوەیریەی کچی حارس) بوو بە دایکی ئیمانداران، لە یەکەم ڕۆژی هاوسەرگیری پێغەمبەری خوا ﷺ، هاوەڵان هەموو دیل و ئافرەتەکانی ئەو هۆزەیان ئازاد کرد لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ زاوایانە و بۆ خاتری ڕێز و حورمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەمەش هۆکاری سەرەکی بوو ئەو هۆزە هەموو هاتن بۆ ناو ئیسلام و خۆشحاڵ بوون بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووەتە زاوایان.

لەناو ئەم هۆزە دوو جار سەرکەوتن بەدەست هات، جاری یەکەم سەرکەوتنی جەنگ، جاری دووەم موسڵمان بوونیان.



لە پاشاندا باوکی هات بۆ شاری مەدینە بۆ فیدای کچەکەی، پێغەمبەری خوا داوای موسڵمان بوونی لێ کرد، ئەویش موسڵمان بوو لەگەڵ ئەوەی غەزوەی بەنی موستەلەق، کاریگەری سیاسی و بانگەوازی زۆر گرنگی بەدەست هێنا" بەڵام بەداخەوە موناقیقەکان زۆر بوون لەناو ئەم سوپایەدا، چەند جار فیتنە و ئاشووبیان گێڕا و هەندێک موسڵمانی ڕاستگۆش تووشی فیتنەکەیان بوون لە نەزانی و لاوازی و گوێ شلکردن بۆیان، لەناو ئەم سوپایە دا (عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەلوولی) تێدا بوو، هۆکاری بەشدار بوونیشیان لەبەر دەستکەوت و سەروەت و سامان بوو، دەیانزانی موسڵمان چالاکی سەربازیان زۆرە و بەهێزن، ئیتر ئەوانیش تەماع گرتنی بۆ دەست کەوت هاتن، بەڵام فیتنەی زۆریان تێدا گێڕا کە کاریگەری زۆر خراپی کردە سەر موسڵمان، ئەوەندەی نەمابوو جەنگی ناوخۆ درووست بکەن خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [التوبة]

ئەوانە ئەگەر دەرچووونایە و لەناوتاندا بوونایە هیچیان بۆ ئێوە زیاد نەدەکرد بێجگە لە سستی نەبێت (لە ئاشووب و گێرە شێوێنی زیاتریان لە دەست نەدەهات) و دەستیان دەکرد بە چرپ و چاپ لەناوتاندا و دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی کەلێنێک بەئاواتی ئاشووب هەڵگیرساندن لە نێوانتاندا، کەسانێکیش هەن لەنێو ئێوەدا گوێیان بۆ دەگرن، خوایش چاک ئاگادارە بە کاروکردەوەی ستەمکاران.

هۆکاری فیتنەکە ئەوەبوو کە زەیدی کوڕی ئەرقەم گوێبیستی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەلوولی موناقیق بوو، وتی هیچ کەس هاوکاری محەمەد ناکات تا خەڵکی لەدەور نەمێنێت، زۆر دڵتەنگ بوون بەسەرکەوتنەکانی موسڵمانان، ئەگەر هاوکاری ماددی و مەعنەوی نەکەن کە گەڕانەوە بە زەلیلی دەیانکەینە دەرەوەی شاری مەدینە، ئینجا وتی (ئەگەر خواردن بدەیتە سەگەکەت قەڵەو بوو پاشان گازت لێدەگرێت) دەیویست فیتنە درووست بکات لە نێوانی موهاجیر و ئەنساردا، لە دواییدا ویستم ئەوە بۆ مامم سەعدی کوڕی عەبادە بگێڕمەوە، بەڵام چووم بۆ پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ گێڕایەوە ئەویش عەبدوڵڵای بانگ کرد و وتی شتی وات بۆ وتووە؟

عەبدوڵڵای موناقیق و هاوڕێکانی هاتن و سوێندی درۆیان بۆ پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ خوارد و منیان بە درۆخستەوە، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بڕوای بەوان کرد، ئیتر ناخۆشترین کاتی من بوو، مەرگم ئاواتە خواز بوو، ماوەیەک لە داخا لەماڵەوە دانیشتم و مامم هات بانگی کردم و وتی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بانگت ئەکات، چوومە خزمەتی

پێغەمبەر ﷺ ئەویش سورەتی مونافیقین-ی بۆ خوێندمەوە، فەرمووی: خوای گەورە بە ڕاستگۆی داناویت ئەی زەید.

﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ۝١﴾

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ کاتێک ناپاک و دووڕووەکان دێن بۆلات و دەڵێن: ئێمە شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوایت! لە حاڵێکدا کە خوا خۆی چاکدەزانێت کە پێغەمبەر و فرستادەی ئەویت، لە هەمانکاتدا خوا شایەتی دەدات کە ئەو ناپاک و دووڕووانە درۆزنن.

﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ۝٢﴾

واتە: ئەوانە سوێندی درۆیان کردووە بە قەڵغانی خۆیان و بەو هۆیەوە بەرهەڵستی خەڵکیان کردووە لە ڕێبازی خوا، بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد کارێکی زۆر ناپەسەند و نابەجێ بوو.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ۝٣﴾

واتە: ئەو حاڵەتەشیان بۆیە تێدا درووست بووە چونکە سەرەتا باوەڕیان هێناو لەوەودوا حەقیان پۆشی و پەشیمان بوونەوە، بەهۆی ئەوەوە مۆر نرا بەسەر دڵیاندا (بۆیە تێگەیشتن و بیرووبۆچوونیان شێواوە) و لە ڕاستییەکان تێناگەن.

﴿۞ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْۚ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ۝٤﴾

واتە: کاتێک دەیانبینیت سیما و لەشولاریان سەرسامت دەکات، کاتێکیش دێنە قسە (ئەوەندە دەم باز و قسەزانن) ئەوە گوێ دەگریت بۆ قسەیان دەڵێی داری وشکی هەڵپەسێوراون، ئەوەندە لە ترس و بیم دا دەژین هەر هاوار و بانگێک بکرێت، هەرباسێک بێتە پێشەوە وا ئەزانن دژی ئەوانە. ئەوانە هەر دوژمنن، کەواتە خۆتیان لێ بپارێزن، وریایان بە خوا بیانکوژێت و لەناویان بەرێت، ئاخر بۆچی وادەکەن و بەرەو کوێ لادران (بۆچی باوەڕی دامەزراو ناهێنن و لە ڕێبازی ڕاست لادەدەن).



﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ يَسۡتَغۡفِرۡ لَكُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوۡاْ رُءُوسَهُمۡ وَرَأَيۡتَهُمۡ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ۝٥﴾

واته: کاتێک پێیان بوترێت وەرن پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکات سەر بادەدەن و لوتبەرزی دەکەن، دەیانبینیت ڕووهەڵدەگێڕن و بەرهەڵستی دەکەن لە کاتێدا ئەوانە خۆیان لا گەورە دەبێت و خۆ بەزل زانن.

﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ أَسۡتَغۡفَرۡتَ لَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ لَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ۝٦﴾

واته: چوونیەکە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەیت یان نەکەیت، هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێت، چونکە خوا ڕێنموونی قەومی تاوانبار و لە سنوور دەرچوو نادات.

﴿هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَفۡقَهُونَ۝٧﴾

واته: ئەوانە کەسانێکن دەڵێن بە خەڵکی ماڵ و سامان مەبەخشن بەو کەسانەی کەلە دەوری پێغەمبەری خوادان تا بڵاوەی لێبکەن! (مەبەستیان هەژارانی کۆچبەرانە، ئەی نازانن)، هەرچی گەنجینەکان هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر خوا خاوەنیانە، بەڵام دووڕووەکان ئەم ڕاستییە تێناگەن و لە نهێنییەکان سەردەرناکەن.

﴿يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعۡنَآ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ لَيُخۡرِجَنَّ ٱلۡأَعَزُّ مِنۡهَا ٱلۡأَذَلَّۚ وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَعۡلَمُونَ۝٨﴾

واته: ئەو دووڕووانە دەڵێن سوێند بەخوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە (دیارە بەو حاڵەشەوە بەشداری غەزوەیان کردووە، بەناچاری یان بۆ تەماع و ئاشووب نانەوە).دەبێت ئەوەی کە دەسەڵاتدار و بەهێز و پیاوماقووڵە، ئەوە دەربکات لە شار کە بێ ڕێز و بێدەسەڵاتە، ئەو دووڕووانە نازانن کە: عیزەت و دەسەڵات و پایەداری هەر شایستەی خوا و پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ۝٩﴾

واته: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، هەوڵ بدەن کە نە ماڵ و سامان و نە ڕۆڵەکانتان نەبنە هۆی ئەوەی کە لە یادی خوا و لە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو کەم تەرخەمی و



بێئاگاتان بکەن، جا هەرکەس لەیادی خوا کەمتەرخەمی بکات، ئا ئەوانە هەر خۆیان خەسارەتمەند و زەرەرمەندن.

﴿وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَـٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٠﴾﴾

واتە: لەو ماڵ و سامان و زانست و هێز و دەسەڵاتەی کە پێمانبەخشیوون ئێوەش لێی ببەخشن، دەستی بەسەردا مەگرن و قۆرخی مەکەن، پێش ئەوەی مردن یەخە بەیەکێکتان بگرێت و بڵێت: پەروەردگارا خۆزگە ماوەیەکی کەمی تر مۆڵەتت بدامایە تا خێر و چاکەم بکردایە، ماڵ و سامانم ببەخشییایە و بچوومایەتە ڕیزی چاکانەوە.

﴿وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾﴾ [المنافقون]

واتە: جا ئەو داخوازییە بەجێ نییە، چونکە ڕۆژی هەرکەسێک تەواو بوو کاتی مەرگی هەرکەسێک هات، هەرگیز خوا دوای ناخات و مۆڵەتی بۆ تازە ناکاتەوە، خوایش زۆر ئاگایە بەهەموو ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

پاشان بەوە نەوەستان فیتنەیەکی گەورەتریان بڵاو کردەوە، ئەویش بوختان کردن بوو بە خاتوو عائیشە، کە ناسراوە بە ڕووداوی ئیفک.



# ڕووداووی ئیفک چییە؟

ڕاغیب: بە کورتی باسێکی ئەم ڕووداووە و بوختانەکەی بۆ خاتوو عایشەیان درووست کرد دەکەم.

**کاتێك** دەڵێن گومان یاخود شووبهە واتا بەرامبەرەکەت بخەیتە گومانەوە لە کارێك یان **ڕووداوێک** کە ئەسڵی ڕووداوەکە وانەبێت یان شێوێنرابێت، ڕوداوی ئیفکیش وەک باقی گومانەکانی تری موشریک و بێدینەکان دەیکەنە گومان لەسەر ئیسلام و دەیانەوێت شێواندن لەباسەکەدا بکەن.

سەرەتا بچینەوە بەو مێژووەدا هەتاوەکو گومان و ناڕاستی دژە ئیسلام بزانین لەو مەسەلە کاتی ڕوودانی ئەوڕووداوە دەگەڕێتەوە بۆ کاتی (غزوة بني المصطلق )، پێویستە ئەوە بزانین کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی ڕۆیشتنی بۆ هەرجەنگێک یەکێک لە خێزانەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد بە ڕاکێشانی قورعە لەنێوانیاندا و بۆ ئەم غەزوة دایکمان عائیشە -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- ناوی دەرچوو هەتا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بچێت بۆ(غەزوەی بەنی موستەلەق لە ٢ شەعبانی ساڵی ٦ کۆچیدا، هەندێك دەڵێن پێنجی کۆچی) سەرەتای ڕووداوەکە دەگەڕێتەوە بۆ دوای کۆتای هاتنی جەنگەکە کە بە هەڵهاتنی بەنی موستەڵەق کۆتای هات، دوای ئەوەی بەنی موستەڵەق هەڵهاتن پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی لە جێگایەک لادەدەن بۆ پشوودان لەکاتی وەستانی کاروانی هێزەکەدا دایکمان عائیشە لە کەژاوەکەی دادەبەزێت کە بەسەر وشترەوە بووە، پێویستی بە قەزای حاجەت یان بەدەستاو دەبێت و بەهۆی زۆری قافڵەکەوە دووردەکەوێتەوە لە قافڵەکە، دوای گەڕانەوەی بۆ نێو کەژاوەکەی دەبینێت ئەو ملوانکەیەی ﷺ خوشکەکەی بۆی درووست کردووە لە ملیا نەماوە و لێی کەوتووە، بەو هۆکارە بە هەمان ڕێگادا دەگەڕێتەوە کە لێوەی ڕۆیشتبوو هەتاکو ئەو ملوانکە بدۆزێتەوە، بەڵام لە قافڵەکە بەجێدەمێنێت بەهۆی ئەوەی ئەوانەی کەژاوەکەیان هەڵگرتبوو هەر وایان زانیبوو لەنێو کەژاوەکەدایە، چونکە یەکەم جار بینیبوویان کە گەڕاوتەوە، دایکمان عائیشە لەو کەسانە بووە کە کێشی کەم بووە بەو هۆیە کەژاوە دەکەوێتە ڕێ و هەستیان نەکردووە کە خاتوو عائشەی تێدانییە، دوابەدوای ڕۆیشتنی قافڵەکە و جێهێشتنی خاتوو عائیشە هەر لە شوێنی خۆی ماوە هەتا ماندوبوو و خەوی لێکەوت. پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە لە هەموو غەزوەیەکدا کەسێکی لە پێش قافڵەکە دادەنا بۆ ئاگادارکردنەوە لە پێشهاتەکان و کەمینی سەرێگا بە هەمان شێوە لە پشتی قافڵەکە و کاروانی هێزەکەیەوە کەسێکی دادەنا بۆ هەڵگرتنەوەی ئەو کەلوپەلانەی کە لە قافڵەکە بەجێ دەما. ئەو هاوەڵەی لەو غەزوە دا کرابووە بە (مؤخرة) واتا کۆتایی قافڵەکە کەسێك بووە بەناوی



سەفوان بن مەعتەڵ[٢٣] -ڕەزامەندی خوای لێبێت- دوای گەیشتنی سەفوان بە شوێنی وەستانی قافڵەکە دەبینێت دایکمان عائیشە بەجێماوە، لەگەڵ بینینی دەڵێت: (إنا لله و إنا إليه راجعون) و بەدایکمان عائیشە دەڵێت: کە سواری وشترەکەی ئەو بێت تا دەگەنەوە نێو مەدینە. ئەم ڕووداوە زۆر شتێکی ئاسایی دەبێت لەلای خەڵکی مەدینە ئەسڵەن ئەگەر نییەتیان خراپ بوایە و کاری خراپیان کردایە (نعوذبالله) قەت پێکەوە نەدەگەڕانەوە بەوشێوەیە.

ڕاستە لەلای موسڵمانان تەنانەت لای خودی پێغەمبەری صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ شتێکی ئاسایی بوو، بەڵام لەنێو موسڵمانان مونافیق بوونی هەبووە، ئەوکەسەی ئەم تانە و تەشەر و بوختانەی جوڵاند و یەکێک بوو لەوانەی کە دەستی گەورەی هەبوو لە ئەو بوختانە دا (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول) بوو کە دەیگوت عائیشە بەسەلامەت لەدەستی سەفوان دەرنەچووە.

کاتێک ئەم باسە لەنێو مەدینەدا بڵاوەوە وای لێهات پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ی زۆر بێتاقەت کرد، بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕۆیشت بۆلای عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و ئوسامەی کوڕی زەید -ڕەزامەندی خوا لە هەردووکیان بێت- تا ڕاوێژیان پێبکات، عەلی ڕەزای خوای لەسەر بێت- ڕەئی وابوو کە لە جارییەکەی خاتوو عائیشە بپرسێت تا بزانێت کە هیچی لە دایکمان عائیشە بینیووە پێشتر؟

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دواتر لە خزمەتکارەکەی عائیشە دەپرسێت: کە عائیشەت چۆن بینیووە و ناسیووە، ئەو خزمەتکارە شاهێدی پاکی دایکمان دەدات و دەڵێت: کە دوورە لە هەموو بوختانێکەوە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەچێتە لای ئەبو بەکری باوکی عائیشە -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی لێکۆڵینەوە لەو مەسەلەیە دەکات و بۆی دەردەکەوێت کە خاتوو عائیشە پاکە و ئەوە تەنها بوختانێکە، دواتر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەچێتە سەر مینبەر و دەفەرمووێت کە ئەمە بوختانە و عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول دروستی کردووە، هەر بەهۆی ئەم باسەوە مقۆمقۆ لەنێو مزگەوتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دروست دەبێت لەنێوان ئەوس وخەزرەج بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر بەداناییانە ئەو شەڕ و دەمەقاڵەیە دادەمرکێنێتەوە و ناهێڵێت شەڕ بکەوێتە نێوانی ئوسەیدی کوڕی حوزەیر و سەعدی کوڕی عەبادە.

دوای ئەوەی مانگێک تێپەڕی بەسەر ئەو قسە و قسەڵۆکانەدا دایکمان عائیشە ئاگاداری ئەم باسە نەبووە و نییە بەهیچ شێوەیەك، ڕۆژێک دایکمان عائیشە دەچێتە دەرەوە لەگەڵ ئافرەتێکدا، خاتوو عائیشە لەکاتی ڕۆیشتندا دەکەوێت ئەو ئافرەتەی کە لەگەڵیدایە وەکو تەعن پێی دەڵێت ناشێت کارەکە کاریگەری لێکردبێت؟ دایکمان عائیشە داوای لێدەکات

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٣] ـ صفوان بن المعطل.



مەوزووعەکەی بۆ شیبکاتەوە، دوابەدوای ئەم قسە ئەوجا دایکمان عائیشە بە باسەکە دەزانێت و تووشی بارێکی دەروونی ناخۆش دەبێت و بەگریانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و داوا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات کە ئیزنی بدات بگەڕێتەوە ماڵی باوکی، لەکاتی بردنەوەی دا بۆ ماڵی باوکی، پێغەمبەری خوا ﷺ بە خاتوو عائیشە دەفەرمووێت: ئەگەر ئەو کارەت کردووە ئەوا تەوبەی لەسەر بکە، چونکە داننان بەتاواندا دەبێتە هۆکاری لێخۆشبوون، خوا پەروەدگار و میهرەبانە لێت خۆشدەبێت و ئەگەر ئەوکارەیشت نەکردووە ئەوا خودا بەرائەتت دەردەخات.

ئەمەش ئەوەمان بۆدەردەخات کە پێغەمبەری خوا ﷺ عیلمی غەیبی نەزانیووە، دوابەدوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو قسە بە خاتوو عائیشە دەڵێت زۆر بێتاقەت دەبێت و دەگریەت لە حاڵەتێکی دەروونی زۆر قورس دا دەژی دەڵێت: باوکە، دایکە گوێتان لێیە پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەڵێت؟ ئێوە دەڵێن چی؟ ئەوانیش بێدەنگ دەبن، چونکە فیتنەکە زۆر گەورە بوو هەموویانی نارەحەت کردبوو. لەوکاتەدا خوای گەورە وەحی دەنێرێت و بەرائەتی خاتوو عائیشە دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی کە بوختانەکەیان درووست کردبوو هەریەکەیان ٨٠ جەڵدەیان لێدرا، ژمارەیان سێ کەس بوون لە ناسراوترینیان حەسانی کوڕی سابت بوو، بەڵام مونافقەکان ئەو جەڵدەیان لێنەدرا، چونکە ئینکاریان لەتاوانی خۆیان دەکرد.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١﴾ [النور]

ئەگەر چی کاریگەری ئەرێنی زۆر باشی دانا لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا، کە ئاماژە بوو بۆ هێز و توانای دەوڵەتی ئیسلامی، ئەگەر چی ئەو فیتنانە لە غەزوەی بەنی موستەلەقدا ڕوویدا، بەڵام جیهادی ئیسلام بەردەوام بوو.



## مەفرەزەی عەبدووڕەحمانی کوڕی عەوف

ڕاغیب: هەر لەهەمان مانگی شەعبانی ساڵی ٦ کۆچی بۆ ناوچەی (بەنی کەلب) لە ناوچەی دەومەتول جەندەل، ئەو هۆزە بەگەیشتنی ئەم هێزەی عەبدووڕەحمانی کوڕی عەوف ترسیان لێ نیشت و هیچ بەرگریان بۆ نەکرا، لە ڕاستی دەومەتول جەندەل زۆر دووره لە شاری مەدینەوە، بەڵام موسڵمانان کۆنترۆڵی تەواوی ناوچەکەیان کرد.

## مەفرەزەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب

ڕاغیب: هاوکات بوو لەگەڵ دەرچوونی مەفرەزەکە (عەبدووڕەحمانی کوڕی عەوف) هەر لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦ کۆچی بۆ ناوچەی فەدەک، کۆمەڵێک لە عەرەب و یەهوود خۆیان ئامادە کردبوو بۆ هەڵکووتانە سەر موسڵمانان، یەهوودی خەیبەر لەگەڵ عەرەبی ناوچەکانی تردا هێزیان پێکهێنابوو، پلانیان ئامادە کردبوو بۆ چوونە سەر شاری مەدینە، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب توانی ڕاوویان بنێت و پارچە پارچەیی بخاتە ناو هێزەکانیان و هەموو کشانەوە.

## مەفرەزەی ئەبوبەکری سدیق

ڕاغیب: لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦ کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هۆزەی ناردە سەر ناوچەی بەنی فەزارەی (عویینەی کوڕی حوسن) لەناو سوپاکەدا زەیدی کوڕی حارسی تێدابوو، ٣٠ کەسیان ئامادە کردبوو هۆزی فەزالە بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام ئەم هێزە هەمووانی کوشت و ئەوەی سەرکردایەتی دەکرد کوژرا کە بریتی بوو لە ئافرەتێکی جادووباز ناسرابوو بە ( ئوم قەرفە) واتا (دایکی دارچین) هەموو لەناو چوون، دوای مانگی ڕەمەزان پێغەمبەری خوا ﷺ هێز و هێرشەکان و چالاکیە سەربازییەکانی زیاتر چڕکردەوە، لە مانگی شەوال دا ٣ سوپای ڕێکخست.



## مەفرەزەی کەرزی کوڕی جابری فەهری

ڕاغیب: کۆمەڵێک لە هۆزی (عەکل و عەرینە) موشریک بوون، بە درۆوە وتیان موسڵمان بووین غەدریان کرد لە موسڵمانان و هاوەڵێکیان شەهید کرد و چەند سەرە وشترێکیان دزی لە موسڵمانان، هێزەکەی (کەرزی کوڕی جابر)[٢٤] توانی ئەوانەی کە خیانەتەکەیان کردبوو هەموویان بکوژێت، هەموو وشترەکانی گەڕاندەوە بۆ شاری مەدینە.

## مەفرەزەی عەبدوڵڵای کوڕی ڕاوەحە

ئەم هێزە یەک کاری پێ سپێردرا ئەویش کوشتنی سەرۆکی یەهوودی خەیبەر بوو کە هێزی کۆکردبووەوە لە دژی موسڵمانان، لە هەمان مانگی شەوال و ساڵی ٦ی کۆچی بەناوی (بوسەیری کوڕی ڕزام)[٢٥] دەیویست لە دۆڵی قوڕا جارێکی تر سوپای عەرەب بۆ موسڵمانان کۆبکاتەوە، تەنانەت هەوڵیدا جارێکی تر غەتەفان و قورەیش کۆبکاتەوە، بەهەمان کار و فەرمانی حوییەی کوڕی ئەختەب هەڵسێت لەگەڵ سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیق بۆ ئەوەی جارێکی تر تراژیدیای خەندەق دووبارە نەکرێتەوە، پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ جەختی لەسەر کوشتنی کردەوە کە دەبێت ئەم تاغوتەش لەناو بچێت، بەوەش موسڵمانان لەو فیتنەیە ڕزگاریان بوو .

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٤] ـ كرز بن جابر.

[٢٥] ـ بوصير ابن رزام.






چالاکییە سەربازییەکانی موسڵمانان لە نێوان فەتحی خەیبەر و فەتحی مەککە

ئەم هێزە پێکهاتبوو لە ٣٠ کەس، بە شێوەیەکی کاتی لە شەڕی خەیبەر پارێزراو بوون یان بڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی خەیبەر دووری خستنەوە بۆ چەند ساڵێکی تر، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەویست لەم کاتەدا جەنگی درێژ خایەن ئەنجام بدات و پشتی چۆڵ بێت، چونکە قوڕەیش لە کەمین دابوون بۆ موسڵمان، هێرش بردن بۆ سەر خەیبەر

زیاد لە چەند مانگێکی پێ چوو، بە کوشتنی سەرۆکی ئەم هۆزە پێغەمبەری خوا ﷺ وازی هێنا، تەفسیری ئەم ڕووداوە زیاتر لە پەیمانێکی تردا ڕوون دەبێتەوە کە ناوی (حودەیبییە) یە.

## مەفرەزەی عەمری کوڕی ئومەییەی زەمری

ڕاغیب: ئەم هێزە هەر لەهەمان مانگدا بوو لە ساڵی ٦ی کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم سوپایەی ڕێکخست بۆ کوشتنی (ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب) لە ناو شاری مەککە، هێزێکی زۆر چاونەترس کارەکەی پێیان سپێردرابوو، زۆر ترسناک بوو کە خودی ئەبو سوفیان لەناو شاری مەککەدا بکوژن.

ئەمەش وەڵامی ئەو چوار هەزار سەربازە بوو کە ئەبو سوفیان کۆی کردەوە دژی شاری مەدینە و دەوڵەت و خەڵکەکەی.

پێشتر ئەبو سوفیان ئەعرابیەکی ناردبوو بۆ ئیغتیال کردنی پێغەمبەر ﷺ و تیرۆر کردنی، بێگومان ئەعرابییەکە فەشەلی هێنا و نەیتوانی، هەروەها هێزەکەی عەمری کوڕی ئوممیەی زەمریش نەیتوانی ئەبو سوفیان بکوژێت، سوپاس بۆخوا ئەویش فەشەلی هێنا، چونکە دوایی ئەبو سوفیان موسڵمان دەبێت و نەوەکانی هەموو جیهان دەخەنە ژێر دەسەڵاتیان، نەک نیوەدوورگەی عەرەب یان نیشتیمانی عەرەب، بەڵکو لەمسەری دەریا بۆ ئەو سەری دەریا فەتحی دەکەن، بەڵام بەو هێزە قوڕەیش زۆر ترسا، ئەژنۆیان شکا بەتایبەتی سەرکردەکانی قوڕەیش ئاسایشیان لەو کاتەوە ئیتر بە جێگیری نەما، زانیان کەرامەت و کورسی و هێزی شار و وڵاتیان بەرەو داڕووخان بەدەستی موسڵمانان دەڕوات.

کافرانیش هەموو خەم و خەفەت و تاوان و ئومێد و ئامانجیان کورسییەکانیانە کە لە دەستییان دا ئیتر ئەوە بۆ ئەوان قیامەتە و ڕۆژی مردنی ئەوانە.

بەمەش ساڵێک تێپەڕی بەسەر غەزوەی ئەحزاب کە لە شەوال دا کۆتایی هات لە ساڵی ٥ کۆچی، ساڵی ٦ی کۆچی لە مانگی شەوال دا بە هێزەکەی عەمری کوڕی ئوممیە زەمری کۆتایی هات.



# چالاكییه سەربازییەكانی موسڵمانان لە ساڵی ٦ی كۆچی و كاریگەرییەكانی

ڕاغیب: ئەم ساڵە بەوە جیادەكرێتەوە كە ساڵێكی جیهادی گەورە و موبارەک بوو لە پلەی یەكەمدا هەژمار دەكرێت، پێویستی بە هەڵوێستەیەک هەیە لەسەری بكەین لەم ساڵە دا سوپای ئیسلامی بە تەواوەتی بڵاو بوویەوە لە هەموو نیوەدوروگەی عەرەبیدا، لەماوەی ئەم ساڵە دا (٢٠) چالاكی سەربازی ئەنجام درا، واتە هەر بیست ڕۆژ جارێک چالاكییەكی سەربازی ئەنجام دراوە، كە بریتیبوون لە ١٧ مەفرەزە و هێزی هاوەڵان و سێ غەزوەی پێغەمبەر ﷺ كە جەنابیان سەرپەرشتیان كردووە، لەو ماوەیەدا جەنگێكی قورس و سەخت ڕووی نەداوە یاخود خەڵكێكی زۆر نەكوژراوە، هەموو جەنگەكانی پێغەمبەر ﷺ تاوەفاتی (١٠٧٠) كوژرا و شەهید هەیە كە (١٧٢) لە موسڵمان شەهید بوون، ئەوەی تری كافران بوون، لەگەڵ ئەوەی كە جەنگی گەورە ڕووی نەدا، بەڵام كاریگەری یەكجار گەورەی هەبوو لەسەر ناوچەكە بە گشتی لە عەرەب و موسڵمانان و موشریک و یەهوود و مونافیق و ئەعەرابییەكان، كاریگەرییان لە ١٠ خاڵدا كۆدەكەمەوە:

كاریگەری یەكەم: باشبوونی ڕەوشی ئاسایشی موسڵمانان لە نیوەدوورگەی عەرەبدا جا لەناو شاری مەدینە بێت یاخود چواردەوری، كە موسڵمانان تێیدا دەژین، یاخود ئەو موسڵمانەی كە وەكو كاروانچی لە جێگاكاندا تێپەڕ دەبوون، هەیبەت و عیزەتی موسڵمان لەناوچەكەدا پەرەی سەندبوو.

كاریگەری دووەم: باشبوونی ئاستی سەربازی موسڵمانان لە پیادەكردنی جەنگ دا زۆر باش و لە ئاستێكی بەرز دابوو، ئەو هەموو مەفرەزە و سریانەی كە دەردەچوون بە مەشق و ڕاهێنانی مەیدانی بوو بۆیان، زۆر باشترە لە مەشقی تیۆریی (نظري) كە جیاوازییەكە زۆر فراوانە.

هەمیشە لە مەشقی واقعی دابوون و دوور بوون لە مەشقی دوور لە ڕاستی و نا واقعی، هەموو ئەمانە كاریگەری خۆی دەبێت لە جەنگەكانی داهاتوودا.

كاریگەری سێیەم: باشبوونی ڕەوشی ئابووری موسڵمانان و بەتایبەت دەوڵەتی ئیسلامی، ئەویش بە هۆكاری چەند كارێكی گرنگ، ئارامی و ئاسایش كەهانی ڕەوشی ئابووری ئەدان بۆ نمو و بەرزی.



هەروەها پەیوەندی موسڵمان بە هەموو ناوچەیەکەوە، دەستکەوتی زۆر لەجەنگدا لە هەمووی گرنگتر لەسەر پێ خۆ وەستان و بڕوابوون بەخۆ لەبازرگانی و دابڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ یەهوود دا.

کاریگەری چوارەم: بونیادنانی پەیوەندی دبلۆماسی لەگەڵ هێز و توانا و سەنتەر و هێزی هۆزەکان و عەشیرەتەکان، یاخود لەگەڵ سەرۆک عەشیرەت و کەسایەتی ناسراوی ناوچەکان، نمونەی هۆزی بەنی موستەڵەق، بەنی کەلب لە دومەتول جەندەل و لەگەڵ سەرکردەکانی هۆزەکانی وەکو سومامەی کوڕی ئوسەیل.

کاریگەری پێنجەم: لە بەرامبەردا، ئەو پەیوەندییانەی کە هەبوون پێشتر هەموو لەناوچوون پارچە پارچە بوون کە دژی موسڵمانان بوو، یاخود لەگەڵ قورەیش درووست ببوو هەموو کۆتایی هات، زۆرێک لەو هۆزانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ قورەیش هەبوو هەموو پەیوەندییەکان هات بۆلای موسڵمانان و پەیوەندییان لەگەڵ قورەیش بە تەواوەتی پچڕاند، هەندێک لەو هۆزانە وەکو بێلایەن لەو نێوەندە دا مانەوە، ئەمەش سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بوو بۆ موسڵمان، لە کاتێکدا قورەیش خاوەنی مێژووی چەندین ساڵەیە، جێگای بڕوای هۆزەکانی عەرەب نەماوە.

کاریگەری شەشەم: قورەیش هەستی پێ کرد لە ئەنجامی بەهێزی دەوڵەتی ئیسلامی و توانای موسڵمان لە جەنگدا، هەڕەشەیە بۆ سەر ئەوان، هەستیان بەوە کردبوو کە مەفرەزەی موسڵمان لە نزیک شاری مەککە بینراون و مەفرەزەی تایبەت هاتووە بۆ کوشتنی ئەبو سوفیان و زۆری تر کە قورەیش بە تەواوەتی هەستی بەوە کردووە کە بەرەکە لە ژێر پێیدا خەریکە ڕادەکێشرێت.

ڕۆژانی داهاتوو لە بەرژەوەندییان نییە، ئەوەش لە داهاتوودا زیاتر دەردەکەوێت.

کاریگەری حەوتەم: لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنە یەک لە دوای یەکانەی موسڵمانان بووە هۆکاری دواکەوتوویی قورەیش، بە پێچەوانەوە موسڵمانان زیاتر بڕوایان بە خۆیان و دینەکەیان پتەوتر دەبوو و توانای بڕیاری زۆر ناوازە و جورئەت و ئازایەتیان بۆ درووست بوو، هیچ شتێک توانای نەبوو لەبەردەم خەونەکانیان و هیواکانیان دا بوەستێت، زۆر شت ڕووی دا کە بە خەیاڵی موسڵماندا نەهاتبوو.

کاریگەری هەشتەم: ئەنجامی بە هێزی و توانای ئیمانداران بەتەواوەتی مونافیقەکانی بێهێز کرد و خۆیان شاردبووەوە وەکو شەمشەمەکوێرە، ئەوانەی کاتی جەنگی خەندەق دەنگیان بەرز دەکردەوە ئەهلی قسە و دەمکردنەوە بوون ئێستا سەرکز و مل شۆڕن ئەمەش مانای وانییە کە بێدەنگ دەبن نا، هەمیشە لە کەمیندان بۆ موسڵمانان، چونکە بەدوای فیتنەکاری و خراپەوەن کە زۆریشت بۆ هێنان درۆزن و سوێندی درۆ دەخۆن بۆ چەواشەکاری ئیمانداران،



دوای سێ ساڵی تر دەردەکەونەوە وەکو ماری ژەهراوی کوشندە کە تەنها بە شەوی تاریکدا دەردەچێت.

کاریگەری نۆیەم: لاوازی هێزی یەهوود لە ناوچەکەدا کە پێشتر هێزێکی زۆر گەورە بوو چی لە ڕووی سەربازی و ئابووریشەوە، لە دوای دەرکردنیان لە شاری مەدینە و کوشتنی سەرکردەکانیان بە تەواوەتی لاواز بوون، بە تایبەتی کاتێک دوو سەرکردەیان لێکوژرا ئەویش (سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیق و یوسیری کوڕی ڕەزام) لەگەڵ ئەوەش دا زۆرێک لە هاوپەیمانیان لەدەست دا لە نیوەدوورگەی عەرەب دا، لە دوای چالاکییە سەربازییەکانی موسڵمانان یەک لە دوای یەک، ئەمەش بووە هۆکاری ئەو پچڕانەی نێوان فیتنەی یەهوودی خەیبەر و ناوچەکانی تر.

کاریگەری دەیەم: ئەنجامی هێرش و چالاکییە سەربازییەکان، هەموو جیهان و هێزەکانی دونیا دەنگۆی موسڵمانان و هێزی نوێ لە ناوچەکەدا بوون، لەسەرووی هەموویانەوە گوێبیستی ئایینێکی نوێ و پێغەمبەرێکی نوێ بوون کە بۆ جیهان نوێ بوو، بەتاسەوە بوون بزانن ڕووداوەکان دەگاتە کوێ.

ئەو کاریگەرییانەی کە ئاماژەم پێدا بە دڵنیاییەوە موسڵمانان لە قۆناغێکی ترەوە دەگۆڕێت بۆ قۆناغێکی بەهێز تر.

ماکوان: بەڕاستی ساڵێکی پڕ جیهاد و چالاکی سەربازی بوو.[٣٦]

لەگەڵ ڕاغیب لە شاری مەدینە دەگەڕاین، دەنگۆی ئەوە بڵاو بوویەوە کە پێغەمبەر ﷺ خەوی بینیووە، هاوەڵان هەموویان خۆیان ئامادەکرد بۆ چوونیان بۆ عومرە!

ڕاغیب: چۆن لە سوڵحی حودەیبییە تێگەیشتووی ماکوان؟!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٦] ـ منیش لەو ڕووداوانە دا دەگەڕامەوە بۆ زیندانەکە، بەڵام لەبەر ئەوەی شتێکی ئەو تۆ ڕووی نەدەدا، گەڕانەوەشم بۆ ناو ڕووداوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا بوو، ڕووداوەکانی ساڵی ٥ و ٦ کۆچی زۆر چڕ و پڕ بوون، بۆیە حەزم کرد بۆ خوێندنەوەی ئەم کتێبە، تەنها یاساکان تەواو بکەم کە گرنگە لە مەملەکەتی نوور، خۆ ئەگەر بێت بە ئارەزووی دڵی خۆم بنووسم لە ڕووداوی درووستی ژیان و باری گوزەرانی ئەو سەردەمە بڕۆم بڕوا بکەن ئەبێتە سەرووی ٣٠ بەرگ کتێب، نووسینی بۆ من سەخت نییە، لە توانام دایە بنووسم، بەڵام نابێتە کتێبێکی کارا و هەموو لایەک سوودی لێ وەرناگرن، بۆیە ناچارم ڕووداوەکان لەگەڵ ڕاغیب ڕووماڵ بکەم، تادەگەمە ئەنجامی کتێب وکۆتایی مەبەست.

بۆیە لەگەڵ ڕاغیب دا زۆر گفتوگۆم ئەکرد، بۆ ئەوەی بتوانین تەنها ڕووماڵی ڕووداوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین، مەگەر باسێک زۆر گرنگ بێت، چونکە هەموو ڕووداوە ڕاستییەکانمان لەبەر چاو دا بوو.



ماکوان: بە بڕوای من گەورەترین ڕووداوە کە لە ژیانی سەروەرماندا ڕووی دابێت ئەگەر دوای جەنگی ئەحزاب قۆناغێکی نوێ دەستی پێ کردبێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە دوای سوڵحی حودەیبییەیە، قۆناغێکی بەهێزتر دەست پێ دەکات، قۆناغەکە ئەوەندە گەورە و بەهێز و جیاکەرەوەیە لە قۆناغەکانی تری ژیانی پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە ناوی ناوە (فەتحی گەورە و فراوان):

﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ١﴾ [الفتح]

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت (مەبەست ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەیە کە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و قوڕەیشدا مۆر کرا، بەندەکانی ئەو پەیمانە لە ڕواڵەتدا زەرەری ئیمانداران بوو، بەڵام هەر هەمووی گەڕا بەخێرو سەربەرزیی بۆیان).

هەندێک لە موفەسیرەکان پێیان وایە ئەوە باسی فەتحی مەککەیە، بەڵام لە ڕاستی دا هیچ پەیوەندی بە فەتحی مەککەوە نییە، بەڵکو باسی سوڵح و پەیماننامەی حودەیبییەیە، چونکە خوای پەروەردگار باسی ئەو هاوەڵانە دەکات کە لەگەڵیدا تەشریفیان برد بۆ عومرە یان بڵێم بە نیازی عومرەکە دەرچوون لە شاری مەدینە خوای گەورە دەفەرموێت: (الفتح ١٨)

بەڕاستی خوا ڕازیی و خۆشنوودە لەو باوەڕدارانەی کە پەیمانیان دایتێ (ئەی پێغەمبەر ﷺ) لە ژێر درەختەکەدا، خۆی ئاگادارە بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە (لە نیازپاکیی و دڵسۆزیی) بەو هۆیەوە ئارامیی و هێمنی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەریان و پاداشتی بە (مژدەی) سەرکەوتنێکی نزیك داناوە.

ئەم فەرموودەی پەروەردگار لەسەر ١٤٠٠ هاوەڵ دابەزیوە کە لە خزمەت پێغەمبەردا بوون لەو سوڵحەدا.

لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بۆ ئەم ڕووداوە زۆر گرنگە، بەڕاستی چۆن کۆتایی ساڵی ٥ی کۆچیمان کرد بۆ سەرەتای ساڵی ٦ کۆچی، ئەم ڕووداوە لەم ساڵەدا ڕووی داوە واتا ٦ی کۆچی دوای ئەوە ئەستێرەی موسڵمانان لە ئاسماندا بەرز بوویەوە و جریوەی دەهات، دەوڵەتی ئیسلامی خاوەن هەیبەت و هێز و توانای گەورە بوو، هەموو لاکان سڵیان لێ دەکردەوە، زیاتر ئەو فەرموودەی پێغەمبەریان ﷺ بۆ تەفسیر دەکات ئەو وا قیعە کە لەمەودوا



ئێمە هێرش دەکەینە سەر دوژمنان، ئیتر دوژمن ناتوانێت هێرش بکاتە سەرمان و ئێمە بۆیان دەڕۆینە ناو ماڵەکانیان.[٣٧]

---

[٣٧]، صحيح البخاري، رقم ٤١٠٩ قالَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يَومَ الأَحْزَابِ: نَغْزُوهُمْ، ولَا يَغْزُونَنَا



## خەونی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

ماکوان: ئەم ڕووداوە بە شتێکی زۆر سەرسووڕهێنەر دەست پێ دەکات، ئەویش خەونی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وا لە ناو ڕووداوەکەدا دەژین، من حەز دەکەم بیکەمە پرسیارێک بۆ ڕاغیبی برام، بۆ بەخەون و حیکمەت و باسەکان خۆمان بەدوایدا بڕۆین و جەنابت بۆم شیتەڵ بکە؟

ڕاغیب: بەڵێ بە دڵنیاییەوە ڕووداوەکە بە خەون دەست پێ دەکات، لە مانگی شەوالی ساڵی ٦ی کۆچی، یەک ساڵ تەواو بوو بەسەر غەزوەی ئەحزاب دا، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خەونی بینی لە خەونەکەیدا بۆ عومرە کردن خۆی و هاوەڵەکانی چوونە ناو مزگەوتی کەعبە، خەونی پێغەمبەریش حەق و وەحییە، پێویست دەکات لەسەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کە خۆی و هاوەڵانی بڕۆن بۆ عومرە بۆ ماڵی خوا لە شاری مەککە.

خوای گەورە لە بارەی خەونەکەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت:

﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾﴾ [الفتح].

بێگومان خوا خەونی پێغەمبەرەکەی بەڕاستیی و وەك خۆی هێناوەتەدی کە دەفەرموێت: بەم زوانە ئێوە بە هەموو نائارامیی و ئاسوودەییەکەوە بەویستی خوا دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە، ( عومرە بەجێدێنن) سەرتان دەتاشن یا کورت دەکەنەوە بێئەوەی ترس و بیمتان هەبێت، جا ئەوەی ئێوە نایزانن خوا دەیزانێت، کە جگە لە سەرکەوتنی (مەککە) سەرکەوتنێکی نزیکی (کە گرتنی خەیبەرە) بۆ بڕیار داون و پێتان دەبەخشێت.

ئەم کارە زۆر سەخت و ترسناکە، دەبێت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی و هاوڕێکانی بڕۆن بۆ شاری مەککە کە جێگای قوڕەیشە، پێش ساڵێک لەمەوبەر ١٠ هەزار کەسیان هێنابوو بۆ جەنگی موسڵمانان و قوڕەیش خۆی بەتەنها ٤ هەزار سەربازی هێنابوو بۆ گەمارۆی مەدینە و لە ناوبردنی هەموو موسڵمان، ئێستا وا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە ئازایەتییەکی بێ وێنەدا فەرمان بە هاوەڵان دەکات کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەجێهێنانی عومرە لە شاری مەککەدا.



کێشەکە لێرەدا ئەوەیە لەنێوان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و قورەیش دا هیچ جۆرە پەیوەندی و پەیمان و نووسراوێک لە نێوانیاندا نییە، ئەمەش بەڕاستی جێگای سەرنجە! لە هەمووی گرنگتر هاوەڵان بێ دوودڵی و پرسیار کردن دەست بەجێ ڕازیبوون و خۆیان ئامادە کرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆر بە زەوق و شەوقەوە خۆیان ئامادە کرد.

لە ڕاستی دا هەر سەفەر و کۆچ کردن بۆ مەککە و بێجگە لە مەککە ئەو ڕێگاوبانە هەمووی خەتەرناک بوو، پڕ بوو لە دوژمن و لە کەمیندابوون بۆ موسڵمانان، دەرچوونی قورەیش بۆیان زۆر ئاسان بوو، پێشتر قورەیش هەرچی یاسا و عورف و عاداتی خۆیان بوو لە بەرامبەر موسڵمانان دا شکاندبوویان گوێیان بە هیچ نەئەدا و لە ناو حەوشەی کەعبەدا موسڵمانانیان ئازار ئەدا و بگرە دەیان کوشتن!.

لەگەڵ ئەو هەموو پێشێل کردنەی قورەیش هاوەڵان ڕازی بوون بۆ چوون بۆ عومرە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەوڵی تەواوی دا کە سوود لە یاساکانی موشریکەکان وەربگرێت کەلەو سەردەمەدا لەسەری دەڕۆیشتن و پیادەیان دەکرد.

یاسا نێودەوڵەتییەکانی ئەو سەردەمە و عورف و ئادابی خەڵکی لە نیوەدوورگەی عەرەبی دا هەر کەس دەیەوێت بڕوات بۆ حەج و عومرە لە ناو شاری مەککەوە دەبێت ئاسایش بپارێزێت، ئەگەرچی جیاوازی و ناکۆکی لە نێوانیان دا هەبێت لەگەڵ قورەیش دا، یاساکان بەم شێوەیە بوو هەموو کۆمەڵگای عەرەب و ناوچەکانی تر ئەو یاسایەیان دەزانی.

بەڵام ئایا قورەیش ڕێز لە یاساکانی خۆی دەگرێت کە ناسراوە بە پاراستنی گیانی میوانانی حەرەم، ئەوانەی کە دێن بۆ ئەنجامدانی حەج و عومرە یان دەوەستنەوە لەبەرامبەر موسڵمانان دا ناهێڵن عومرەکەیان بەجێ بهێنن؟!

وا کاروانی عومرەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئامادەیە، با بڕۆین لە گەڵیان دا و بزانین چی ڕوودەدات.



# دەرچوونی موسڵمانان بۆ بەجێهێنانی عومرە

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵان بە خۆشحاڵی و دڵ خۆشییەوە دەرچوون بۆ عومرە لە مانگی (ذی القعدة) ساڵی ٦ی کۆچی لەگەڵ ئەوەی کە ئەم کۆچ و کاروانە بۆ مەککە زۆر ترسناک و سەختە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک زۆرەملێ نەبوو لە ڕۆیشتنی هاوەڵان بۆ ئەم سەفەرە، بەڵکو بە هەڵبژاردنی خۆیان بوو هەموو بەتامەزرۆیی خۆیان دەرچوون.

لەلایەکی تر کۆمەڵەی مونافیقەکان هیچیان لەگەڵی دەرنەچوون، چونکە دەرچوونیان پێخۆش نەبوو و دەیانزانی کە ئەم کارە زۆر سەختە و ئاسان نییە، زۆر بیریان کردەوە لە کۆتاییدا بڕیاریان دا کە لەگەڵیان دا دەرنەچن، دەیانزانی کارەکە لە ڕووی سەربازییەوە ترسناکە، قورەیش دەتوانێت بە تەواوی لە ناویان بەرێت، تەنها یەک مونافیق لەگەڵ ئەو کاروانە دەرچوو بەناوی (جەدی کوڕی قیس) پێ دەچێت هەر خودی مونافیقەکان بۆ بەدەستهێنانی زانیاری و ئاگادار بوون، ئەو کەسە دووڕووەیان ناردبێت، هەروەها لە دەشتەکییەکان (ئەعراب) داواکرا کە دەرچن لەگەڵیدا، ئەوانیش هیچیان ڕازی نەبوون بەدەرچوون، کەواتە ئەو کاروانەی کە دەرچوو بۆ مەککە کاروانێکی ئیمانی و پڕ لە خەڵکی خواناس و ئیمانداری ڕاستەقینە بوون، بریتیبوون لە (١٤٠٠) کەس بەنیازی عومرە کردن کەوتنە ڕێ یان دەڵێن (١٥٠٠) کەس بوون بەڵام بە گشتی ڕیزی ئەم هاوەڵانە پاک و بێگەرد بوو، هەرکاتێک هاوەڵان بڕۆشتنایە بۆ جەنگ ڕیزەکانیان خاڵی بووایە لە دووڕوو ئەوا سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خێزانی بەڕێزی (دایکی سەلەمەی) لەگەڵ خۆیدا برد و کەوتنە ڕێ تا گەیشتنە جێگایەک بەناوی (بیری ئاوەکانی عەلی) پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەوێدا ئیحرامی بەست و قوربانییەکانیان ئامادەکرد، بریتیبوو لە کۆمەڵێکی زۆر لە وشتر بۆ سەربڕین ئامادەکرا و هاوەڵان هەموو ئیحرامیان بەست، هەندێک نەبێت کە پاسەوان بوون، ئەم قوربانیانە هەمووی نەوافل و سوننەت بوو، واتا لە عومرەدا فەرز نییە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵان کە ئیحرامیان بەست بەنیەتی عومرە، هەموو دەستیان کرد بە تەکبیر و تەلبیە، (لَبَّيْكَ اللهم لَبَّيْكَ) هەموو بۆ عومرە کەوتنە ڕێ بەرەو شاری مەککەی پیرۆز، هەر بۆیە موسڵمانان تەنها چەکی خۆیان پێ بوو، واتا چەکی جەنگیان نەبردبوو وەکو دەڵێن چەکی موسافیر.



# ڕێگری قورەیش لە موسڵمانان بۆ ناو ماڵی خوا

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵان گەیشتنە جێگایەک بەناوی (کەراعی غەمیم) کە نزیکەی ٦٠کم لە شاری مەککەوە دوورە، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ تووشی سوپای پڕچەکی قورەیش بوو کە بریتیبوون لە عەشیرەتەکانی قورەیش و هۆزی ئەحابیش کە هاوپەیمانی قورەیش بوون، هەموو کۆبوونەوە لە نزیک شاخی (حەبەش) کە لەوێدا خۆیان بۆ موسڵمان مەڵاس دابوو، پەیمانیان دابوو کە بەرگری هاوبەش بکەن لەگەڵ قورەیش بۆ ڕێگری موسڵمانان لە چوونە ناو مەککەی پیرۆز.

هەروەکو دیار بوو دەبوو قورەیش ڕێگا بدات بە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵانی و ڕیزی یاساکانی خۆی بگرێت، ئاو بدات بە حاجییەکان و یان ئەوانەی بۆ عومرە دەچن، بەڵام یاساکانی خۆی کێشا بە چوار چێوەی دیواردا و سەرپێچی هەرچی یاسا و عورف و عادات بوو کردی، ڕەوشەکە ترسناکە، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی و١٤٠٠ هاوەڵ کە تەنها چەکی موسافیریان پێیە لە ناوچەی کەراعی غەمیم سوپای قورەیش و هاوپەیمانەکانی لە بەرامبەر کاروانی موسڵمان بۆ عومرە وەستاون و نەیاندەهێشت بڕۆنە ناو شاری مەککە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ خێرا مەجلیسی شوورا و ڕاوێژی پێکهێنا، هەمیشە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ کاری بە شوورا کردووە، تەنها لە یەک کاتدا نەبێت، ئەویش ئەگەر فەرمان بێت لای خوای گەورەوە.

لێرەدا بۆ ئەوەی ڕاوێژی نەکرد پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەوەی بڕۆن بۆ عومرە یاخود نەڕۆن و بگەڕێنەوە، بەڵکو بۆ ئەوە کۆیکردنەوە ڕاوێژی پێکردن چۆن مامەڵە لەگەڵ ڕەوشەکەدا بکەن.

چونکە فەرمان بە عومرە دراوە، مەگەر خوای گەورە خۆی بیوەستێنێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ [الأحزاب]

بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نییە کاتێک کە خوا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن ئەوان سەرپشک بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە) ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە.



چونکە لەو کاتەدا هیچ وەحییەک نەهاتبوو کە موسڵمانان چۆن مامەڵە لەگەڵ قورەیش دا بکەن.

ڕایەک لە نێو ڕاوێژکاران دەرچوو کە موسڵمانان پشتیان لێ بگرن و بڕۆنە ناو هۆزی ئەحابیشەکان و بڕۆنە سەر ماڵ و منداڵ و پشتیان لێ بگرن بە دیل بیانگرن چونکە هاوپەیمانی قورەیشن و بەمەش عیزەت و سەربەرزی دەگەڕێتەوە بۆ موسڵمانان، بەڵام ڕای ئیمامی ئەبوبەکر جیاواز بوو لەناو شوورا دا.

ئەو فەرمووی: خوا و پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باشتر دەزانن، من وای دەبینم ئێمە بۆ عومرە هاتووین، بەڵکو نامانەوێت جەنگ بکەین و لەگەڵ کەسدا دەستە و یەخە بگرین، کاری ئێمە تەنها بۆ عومرەیە و بۆ ماڵی خوا، لە سوپای ئەحابیشەکان لا ئەدەین بۆ ئەوەی بزانن کە بۆ جەنگ نەهاتووین، ڕێگا دەبڕین بەرەو شاری مەککە. ئیمامی ئەبوبەکر پێی وابوو ئەو سوپایەی کە دانرابوو لە بەردەم موسڵمانان دا لە کەراعی غەمیم تەنها بۆ ترساندنی موسڵمانان بوو، بەڵکو نایانەوێت جەنگ بکەن، ئێمە بەردەوام ڕێگا بەرەو مەککە دەبڕین، ئەگەر جەنگیان کرد لەگەڵمان ئێمەش لەگەڵیان دەجەنگین، هەموو کەس دەزانێت ئێمە لەجەنگ ناترسین، بەڵام هەوڵیش بۆ جەنگ نادەین و شەڕەنگێز نین.

ئەمە بەگشتی ڕای ئیمامی ئەبو بەکر بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و هەموو هاوەڵان ڕاکەی ئیمامی ئەبو بەکریان بە چاک زانی و بەردەوام بوون لە ڕێگا بڕین تا دەچنە ناو شاری مەککەی پیرۆز بۆ عومرە، بەڵام تووشی خالیدی کوڕی وەلید بوون لەگەڵ (٢٠٠) سوار کە لە سەرەتاوە دەرکەوتن و سوپای قورەیش لە دوایانەوە ئامادە بوو بۆ جەنگ.



## نەرم بوونی دڵی خالیدی کوڕی وەلید و دابەزینی نوێژی ترس

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەبەردەم ئەم کۆمەڵە سوارە چەکدارە دا وەستا، لە کاتی وەستانەکە دا کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو، موسڵمانان نوێژیان دابەست و نوێژیان کرد، چونکە لەهەموو حاڵەتێک دا موسڵمانان هەرگیز واز لە نوێژکردن ناهێنن، ئەگەر چی لەناو جیهادیشدابن دەبێت کاتی بۆ تەرخان بکەن، مەگەر زۆر لە کاتی تایبەت و سەخت دا وەکو ڕۆژی ئەحزاب موسڵمانان نوێژی عەسریان فەوتا، ئەوەش یەکجار ڕووی داوە، دەنا هەمیشە موسڵمانان نوێژیان بەجێ هێناوە، بانگدرا و پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نوێژی دابەست و موسڵمان هەموو بەدوایدا ڕیز بوون بۆ نوێژ کردن.

خالید وەکو بینی موسڵمانان چەند جار چوونە ڕکوع و سجوود، کەسێکی بانگ کرد لەوانەی کە شارەزابوون لە حاڵی موسڵمانان و بەندایەتی و درووشمەکانی، وتی بێجگە لەم نوێژە نوێژی تریان هەیە؟

وتی: بەڵی کاتی نوێژی تریان عەسرە هەمان کردار دووبارە دەکەنەوە.

خالیدی کوڕی وەلید زانی کە فرسەتە لەوکاتەدا موسڵمانان دەچنە ڕکوع و سوجدە لە نوێژی عەسردا هێرش بکاتە سەریان، ئەم هەواڵەی بەکەس نەوت تەنها لە دڵی خۆیدا هێشتییەوە.

کاتێک نوێژی عەسر کاتی خۆی هات لەو کاتەدا بە فەرمانی خوای گەورە دابەزی بە حوکمی نوێژی ترس (صلاة الخوف).

ئەم نوێژە زۆر تایبەتە و لەکاتی ئەوەی کە دوژمن هێرش دەهێنن بەشێک لە موسڵمان نیەتی نوێژی ترس دەهێنن و ئیمام کە نوێژ دادەبەستێ نوێشی قەسر واتا کورت دەکرێتەوە، نیوەکەی لەگەڵ ئیمامدا نوێژ دادەبەستێت و نیوەکەی تر لە دواوە پاسەوانی دەکات، کە ئەوان تەواو بوون، ئیمام چوار ڕکعەت دەکات و نیوەکەی تر دوو ڕکعەت نوێژ لە دوای ئیمامەوە دەکات، ئەوەی نویژەکەی تەواو کردبوو ئەوان دەبن بە پاسەوان، هەرچەندە جۆری زۆری هەیە، بەڵام لەوێدا بەم شێوەیە ڕووی دا، کۆمەڵێک لەگەڵ پێغەمبەر نوێژیان دابەست و کۆمەڵێکی تر مانەوە پاسەوان بوون، کە ئەوان تەواو بوون نیوەکەی تر لە دوای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نوێژیان کرد، بەمەش خالید کوڕی وەلید هەستی کرد ئەم خەڵکە هەروا ئاسایی نین، خوا بەڕاستی دەیانپارێزێت، بۆیە خێرا بە سەرسامییەوە وتی: بەڕاستی ئەم خەڵکە پارێزراون لای خوا (إن القوم ممنوعون)



هەر ئەم ڕووداوە بوو هەڵوێستی خالیدی گۆڕی و هۆکارێک بوو بۆ دڵنەرم بوونی بۆ ئیسلام، لە دوای چەند مانگێک لەم ڕووداوە موسڵمان دەبێت، خالید نەیتوانی بدات بەسەریان دا و گەڕاوە بۆ شاری مەککە، پێغەمبەری خواش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نەیدەویست جەنگ بکات.

خوای گەورە لە بارەی ئەو ڕەوشە و دابەزینی نوێژی ترس دەفەرموویت:

﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ ۖ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾﴾ [النساء]

واتە: هەرکاتێ بەسەفەر ڕۆشتن بەسەر زەویدا قەیناکا نوێژ کورت بکەنەوە ئەگەر ترسان خوانەناسان پیلان و بەڵایەکتان بەسەر بێنن، چونکە بەڕاستی کافران دوژمنانی ئاشکرای ئێوەن.

کاتێ کە تۆ (ئەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) لەناو هاوەڵاندایت و پێش نوێژیان بۆ دەکەیت (لەکاتی جەنگدا)، با دەستەیەکیان بوەستن لەگەڵ تۆدا بۆ نوێژ چەکەکانیان پێ بێت، کاتێك کە ئەم دەستەیەی کە نوێژ دەکات چوونە سوژدە با ئەوانی تر پشتیان بگرن (ئەوجا کە لێ بوونەوە لەو دوو ڕکاتە) ئەو دەستەیەی تر کە پاسەوانیان دەکرد و نوێژیان نەکردووە با لەگەڵ تۆدا نوێژەکەیان بکەن، با هۆشیار و چەکدار بن چونکە کافران ئاواتە خوازن کە ئێوە غافڵ بن لە چەکەکانتان و لە کەلوپەلتان تا یەك هێرش بکەنە سەرتان و تەفرو توونات‌ان بکەن. بۆتان هەیە و قەیناکا چەکەکانتان دانێن ئەگەر بێزار بوون یا نەخۆش کەوتن، بەڵام هەمیشە وریا بن بەڕاستی خوا سزای خەجاڵەت ئاوەری بۆ خوانەناسان ئامادە کردووە.



هەرکاتێ لە نوێژ بونەوە یادی خوا بکەن بە پێوە، بە دانیشتنەوە، بە ڕاکشانەوە (بە هەر جۆرێك کە بۆتان گونجا) هەروەها هەرکاتێ ئارامی باڵی کێشا بە سەرتانا نوێژەکانتان بە چاکی و بەتەواوی ئەنجام بدەن، چونکە بەڕاستی نوێژ لەسەر ئیمانداران فەرزە لە کاتی دیاری کراودا دەبێ ئەنجام بدرێ.

لە بەرانبەر (لەشکری کوفرەوە کە شەڕتان پێ دەفرۆشن یان بەربەستن لە ڕێگەی پێگەیاندنی بانگەوازی خوادا) سستی و کەمتەرخەمی مەکەن و بکەونە دوایان چونکە ئەگەر ئێوە ئێش و ئازار و ماندوویێتی و بریندارتان بۆ پێش بێت، بۆ ئەوانیش هەر پێش دێت. بەڵام ئەوەی ئێوە بەتەمان لەلایەن خواوە دەستان بکەوێت (لە بەهەشتدا) ئەوان بەتەمای نین، خوا هەمیشە و بەردەوام زانا و دانایە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە دوای لاچوونی سوپاکەی خالید و ئەوانی بە جێ هێشت ڕووە و مەککە بەردەوام بوو لە ڕێگا بڕین بۆ بەجێ هێنانی عومرە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ گەیشتە جێگایەک بەناوی حودەیبییە، خالید کە چووە شاری مەدینە وتی ئەو موسڵمانە پارێزراون، ئەو لە دوای ئەو ڕووداوە کە نوێژی ترس دابەزی، زۆر دوو دڵ بوو لە جەنگ بڕیاریدا جەنگ نەکات.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆری نەمابوو بگاتە شاری مەککە هەموو ٥کم مابوو بۆ مەککە بەردەوام بوو لە ڕێگا بڕین، بەڵام ئەوەی کە ڕوویدا نە جەنگی قوڕەیش نە جەنگی موسڵمانان بوو، بەڵکو  وشترەکەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەجێگای خۆی وەستا، هەرچی هاوەڵان هەوڵیان لەگەڵی داو پاڵیان پێوە دەنا بەرەو مەککە بڕوات نەدەڕۆیشت و بەرەو هەموو جێگاکانی تر دەڕۆیشت، هاوەڵان هەموو لایان سەیر بوو لێرەدا کە وشترەکە وەستا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەوە ڕەوشتی وشترەکەم نییە ئاوا ڕقی گرتووە و ناڕوات، بەڵام ئەوەی کە لە جێگای خۆیدا چەقاندوویێتی هەر ئەوەیە فیلی ئەبرەهەی وەستاند، چونکە لێرەدا کە فیلی ئەبرەهە گەڕاوە بە ئەمری خوای پەروەردگار بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی، قوڕەیش داوای هەرچیم لێ بکات بۆ بەرزڕاگرتنی ماڵی خوا و درووشمەکانی، سوێند بەو کەسەی منی درووست کردووە پێیان دەبەخشم.

دیارە فەرمانەکە فەرمانی خوایە، خوای گەورە موسڵمانانی ڕاوەستاند، بەهۆکاری (قەسوا) کە ناوی وشترەکەی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ، بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وشەی فیلەکەی ئەبرەهەی بەکار هێنا واتە چوونە ناو خاکی مەککە ئەستەمە چونکە توانای چوونە ناو ئەو شارە، هەڵبەت لەو کاتەدا زۆربەی هاوەڵان لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باش حاڵی نەبوون بۆیە چەند جار دووبارەیان کردەوە.



بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوە تێگەیشت کە ویستی خوای گەورەیە لەگەڵ قورەیش دا سوڵح بۆ ماوەیەکی کاتی بکات، ڕاستە فەرمانێکی ڕاستەوخۆ نەبوو لە وەحی، چونکە هەردەبێت بڕۆن عومرە بکەن، بەڵام کاتەکەی دەست نیشان کراو نییە.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە وردی فەرمووی قورەیش هەرچی بڵێیت بۆ بەرز ڕاگرتنی درووشم و ماڵی خوا قبووڵی دەکەم پێتان دەبەخشم.

دەیزانی کە وشترەکەی فەرمانی پێکراوە بە وەستانی لە ناوچەی حودەیبییە.[٢٨]

بەهەموو شێوەیەک خوای پەروەردگار ویستی لەسەر نییە جەنگ لە نێوان قورەیش و موسڵمانان ڕوو بدات.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٨] ـ قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا خَلَأَتْ ، وَمَا ذَلِكَ لَهَا بِخَلْقٍ ، وَلَكِنَّ حَبَسَهَا حَابِسُ ٱلْفِيلَ . ثُمَّ قَالَ : وَٱلَّذِي نَفْسِيٌّ بِيَدِهِ، لَا يَسْأَلُونِي ٱلْيَوْمَ خُطَّةً يُعَظِّمُونَ بِهَا حُرُمَاتُ ٱللَّهِ إِلَّا أُعْطِيَّتُهُمْ إِيَّاهَا).



## ناردنی نێوەندگیر بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەلایەن قورەیش

ڕاغیب: لە دوای ئەوەی قەسوا نەڕۆیشت، موسڵمانان لە حودەیبییە و بیرەکانی ئەو ناوچانە مانەوە, قورەیش چەند ناوەندگیرێکی نارد بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ لەوانە بریتیبوون لە:

## شاندی یەکەم: بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی[٢٩]

بۆ گەڕاندنەوەی موسڵمان بۆ مەدینە لە دوای مانەوەیەکی کەم لە ناوچەی حودەیبییە، موسڵمانان هەرگیز چاوەڕێیان نەدەکرد. قورەیش وەفدێکی نارد ئەو کەسەی کە ناردی لە هۆزی خوزاعە بوو ناوی (بودەیلی کوڕی رەقائی خوزای) بوو، هۆزی بودەیل خوزاعە زۆر نزیکن لە پێغەمبەری خوا ﷺ و چونکە هەمیشە هاوپەیمانی عەشیرەتی بەنی هاشم بوون، لە نێوان هەردوو لادا پەیوەندییەکی زۆر باش هەبوو، ئەمەش مانای ئەوە نیشان ئەدات کە قورەیش جەنگی ناوێت، چونکە قورەیش مەوقیف و هێزی زۆر لاوازە، سەرکردەیەکی قورەیشی نەنارد، تا هەڕەشە و قسەی بەرز و نزم ڕوو بدات، قورەیش دەیەوێت بە جۆرێک لە ئاشتەوایی مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەردا بکات ﷺ ، هەر چۆن بووە کوشتن و کوشتار وەلابنێن و بە گفتوگۆ چارەسەری کێشەکەیان بکەن، ئەمەش بۆخۆی سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە، لە کاتێکدا قورەیشییەک لە ناو هەموو هۆزە عەرەبەکاندا عەزیز و قسە ڕۆشتوبوو، لە ئێستادا وا لەسەر کێشەکانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دا دادەنیشن، ئەی چۆن ئاوا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دادەنیشت؟

لەبەر ئەوەی ڕاستەوخۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فشاری خستۆتە سەریان و ناچاری کردوون، وەستانی وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە ستراتیژی قەزاوقەدەرە، خوای پەروەردگار ئەم گەردوونەی پێ دەبات بەڕێوە.

لەلایەکی ترەوە کاریگەری ئەو هەموو چالاکیە سەربازییە لە نێوانی ساڵی ٥و٦ی کۆچی کە زۆر بە چڕوپڕی ئەو ناوچانەی گرتووە، چەند کاریگەری هەبوو لەسەر دوژمنیان، ئەوەندەش کاریگەری هەبوو لەسەر شکۆی موسڵمانان و باری دەروونی موسڵمانان لە ئاسماندا بوو.

وا موسڵمان ٦ کم دوورن لە شاری مەککەوە بەو عیزەت و سەر بەرزییانەوە قورەیش خەڵک دەنێرێت بۆ لێکنزیک بوونەوە، قورەیش ناتوانێت سەرکردەی خۆی بنێرێت بۆ نزیک بوونەوە،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٩] ـ بديل بن ورقاء الخزاعي.



بەڵکو بودەیلی ناردووە بە هێمنی و لەسەر خۆیی داوا لە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەکەن نەچێتە ناو شاری مەککە، قورەیش تاکە شتێک کە دەیەوێت ئەوەیە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ نەڕواتە شاری مەککەی پیرۆز، لەهەمان کات دا قورەیش جەنگی ناوێت ئەگەر موسڵمانان بە چەکی موسافیر لاوازن لە ڕووی چەکەوە، بەڵام قورەیش لەناو ماڵی خۆیدا کەپڕ چەکە لە موسڵمان لاوازترە.

ئینجا بودەیل کوڕی وەرقا دەستی کرد بە قسەکرد، ویستی هەڕەشەیەکی نەرم بکات لە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ وتی: من ئەوانم جێهێشت خۆیان پڕ چەک کردبوو کەعبی کوڕی لوئەی، عامری کوڕی لوئەی، خۆیان ئامادە کردووە بۆئەوەی بێنە سەرتان و دێنە لای ئاوەکانی حودەیبییە، بە هەموو چەک و توانایانەوە دەیانەویت ڕێگات لێ بگرن بۆ ئەوەی نەچیتە ناو شاری مەککە!

ئینجا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ وەڵامی دایەوە و فەرمووی: ئێمە نەهاتووین بۆ جەنگ لەگەڵ هیچ کەسێکدا، بەڵکو هاتووین بۆ بەجێهێنانی عومرە و ئیحرامامان بۆ عومرە بەستووە، قورەیش توانای جەنگی نییە و لەجەنگدا بەهێز نییە و خەسارمەند بووە لەجەنگ، ئەگەر ئارەزوویان بوو پێیان خۆش بوو ماوەیەک دادەنیشین بۆ گرێبەستی جەنگ بۆ ماوەیەکی درێژخایەن واز لە بانگەوازی ئێمە بهێنن بۆ خەڵک و ئەگەر موسڵمان بن ئەوا وەکو ئەو خەڵکە و چۆن هاتوونەتە ناو ئیسلامەوە، ئازادن و سەربەرز دەبن، خۆ ئەگەر هەر ڕێگربوون و حەزیان بە جەنگ بوو، سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر ئەم بانگەواز و دینە تا گیانم لە لاشە دەردەچێت و تا ئەمڕۆ فەرمانی خوای گەورە بەسەریاندا دەسەپێنم.[٣٠]

ئەگەر بە چاوی شیکاری و شیتەڵکردنی وتەی بودەیل وەڵامی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بکەین، دەبینین چ غیرەت و هێزێک لە فەرموودەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دا هەیە.

[٣٠] ـ فقال بديل بن ورقاء. جئناك من عند قومك ، كعب بن لؤي ، وعامر بن لؤي ، قد استنفروا لك الأحابيش ومن أطاعهم ، قد نزلوا أعداد مياه الحديبية ، معهم العوذ المطافيل والنساء والصبيان ، يقسمون بالله لا يخلون بينك وبين البيت حتى تبيد خضراؤهم، فقال رسول الله - صلى الله عليه وسلم إنا لم نأت لقتال أحد ، إنما جئنا لنطوف بهذا البيت ، فمن صدنا عنه قاتلناه ، إن قريشا قد أضرت بهم الحرب ونهكتهم فن شاءوا ماددتهم مدة يأمنون فيها ، ويخلون فيما بيننا وبين الناس ، - والناس أكثر منهم - فن أصابوني فذلك الذي أرادوا وإن ظهر أمري على الناس كانوا بين أن يدخلوا فيما دخل فيه الناس أو يقاتلوا وقد جموا ، وإن هم أبوا فوالله لأجهدن على أمري هذا حتى تنفرد سالفتي ولينفذن الله تعالى أمره، صحيح البخاري ٢٣٧.



بودەیل دەڵێت، هەموو قورەیش گەورە و بچووکی چەکیان هەڵگرتووە دژتان و جەنگی ئەوانیش ئاسان نییە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە سەرەتاوە دڵنیایی بەخشی کە بۆ جەنگ نەهاتووە، بەڵکو بۆ بەجێهێنانی عومرە هاتووە.

چونکە لە ڕووی یاسای عورف و عادەتی نیوەدوورگەی عەرەبی، بۆی هەیە ئەو کارە ئەنجام بدات، ئەوان بەگوێرەی یاسای نیوەدوورگەی عەرەبی لە ئێستادا کار دەکەن ئەوە قورەیشە یاساکانی بەزاندووە و سەرپێچی لە هەرچی یاسا و عورف و عاداتێکە دەیکات، بەڵکو دەبێت قورەیش بە شمشێرەکانی بمانپارێزن نەک جەنگمان لەگەڵدا بکات, چونکە کاری ئێمە جەنگ نییە بۆ عومرە هاتووین.

پاشان قورەیش وەکو تۆ دەڵێیت خۆی ئامادە کردووە بۆ جەنگ، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دڵنیای دەکاتەوە و دەفەرمووێت: قورەیش جەنگی موسڵمانان ناکات، لەبەر ئەوەی زۆر لەوە لاوازترە ئەو هەوڵە بدات ئەو لە جەنگی ئەحزاب دا بەسەر شۆڕی گەڕایەوە بە ١٠ هەزار سەرباز ئەو کارەی بۆ نەکرا, شکستی خوارد بوو لە بەرامبەر هێزی موسڵمانان لە شاری مەدینەدا.

لەماوەی ٦ی کۆچی قورەیش یەک سەربازی نەجووڵاند بۆ جەنگی موسڵمانان، بەڵکو لەبەرامبەردا موسڵمانان چەند جار نزیک بوونەوە لە سنووری شاری مەککەی پیرۆز، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەو شێوە بەهێزە موفاوەزات و دانوستان ئەنجام ئەدات، چونکە قسەکانی گوێی بۆ دەگیرێت و خەڵکی ترسی لە دڵدا هەیە بەتایبەت بودەیلی کوڕی وەرقا دوای ئەوەی کە لاوازی قورەیشی دەرخست، پاشان داواکانی دەخاتە بەردەم قورەیش، ئەگەر قورەیش ڕازییە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن با ئاگر بەست ئەنجام بدەین، با هەردوولا بانگەوازی خۆیان بکەن، بە ئازادانە و بێ فشار خستنە سەر یەکتری، بەبێ ئەوەی کەس لەو دوو تەرەفە جەنگ ئەنجام بدەن، ئەوەی کە داوای کرد پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو داوای ئیسلام بوو، چونکە لە ژینگەیەکی هێمن و پڕ لە ئاسایشدا بانگەوازی ئیسلام زیاتر بڵاو دەبێتەوە، خۆ لە ڕووی ئاگربەست لەگەڵ قورەیش موسڵمانان دەتوانن دوژمنەکانی تریان تەمێ بکەن و سەرقاڵ بن, خەمی پشتی خۆیان نەبێت قورەیش لە دواوە هێرش بکاتە سەریان.

داوای تری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کە بانگیان دەکات بۆ ئیسلام ئەو پەڕی هێز و توانای دەوڵەتی ئیسلامی دەردەخات، دەفەرمووێت وەرن موسڵمان بن وەکو ئەو خەڵکە هیچم لێتان ناوێت و بە ئارەزووی خۆتان بژین، ئەم قسانەی جەنابیان ئەنجامی ئەدات هەموو چەند کیلۆمەترێک دوورە لە شاری مەککە، بەو پەڕی هێز و عیزەتەوە فەرموودەکانی بە وەفدی



قورەیش دەگەیەنێت، پاشان لە کۆتایی بێمنەتی و ئازایەتی و جورئەتی موسڵمانان و دەوڵەتەکەی دەردەخات.

ئەگەر قورەیش بەو رەوشەی کە هەیەتی داوای جەنگ و رووبەڕووبوونەوە دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند دەخوات تاکۆتایی جەنگیان لەگەڵ دەکات، پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان لە جەنگی تا مردن ناترسێن! بەڵکو لە پێناوی خودایە.

ئەم سێ خاڵەی پێغەمبەر ﷺ زۆر گرنگ بوو.

١- ئاگر بەست و ئاشتەوایی بۆ ماوەیەک.

٢- موسڵمانبوون و ئازادبوونیان.

٣- جەنگ و رووبەڕووبوونەوە.

لە ئێستادا بەدواوە (تۆپەکە لە گۆڕەپانی قورەیشدایە) زۆر بە جوانی روونی کردەوە بۆ وەفدی قورەیش.

بودەیل وتی: پەیامەکەت دەگەیەنمەوە قورەیش.

بەزووترین کات گەڕایەوە شاری مەککە و پەیامی پێغەمبەری خوا ﷺ پێگەیاندن، هەموو واماندەزانی قورەیش بەو سێ خاڵەی پێغەمبەر ﷺ تورە دەبێت خێرا چەک هەڵدەگرن، بەڵام قورەیش لەبەر لاوازی خۆیان زۆر بە سادەیی وەریانگرت بەڵکو ترس و بیم لە دڵیاندا درووست بوو..

کە ئەم سێ خاڵە کەوتە بەردەم سەرکردایەتی قورەیش، هەوڵیاندا بەهیچ شێوەیەک دانەنیشن لەگەڵیدا و هیچ پەیماننامەیەک لە نێوانیاندا نەبێت و لە هەمان کاتدا قورەیش جەنگی ناوێت، بۆیە ناچار کەسی دووەمیان نارد وەکو نێوەندگیر و شاندی قورەیش بەڵام لە قورەیش نییە لە هۆزەکانی دەرەوەی قورەیشە.



# شاندی دووەم: حەلیسی کوڕی عەلقەمە

قوڕەیش وەفدێکی تری نارد، بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەشیرەتی بەنی (حارسی کوڕی عەبدولمەناتی کوڕی کینانە)[٣١] کە یەکێک بوو لە سەرکردە و پیاوە گەورەکانی هۆزی ئەحابیش، ئەمیش لە قوڕەیش نییە، بۆ جاری دووەمە قوڕەیش وەفدی جیاواز دەنێرێت لە خۆیان نییە، هەر لەبەر ئەوەشە لە هۆزی قوڕەیش کەس نانێرێت بۆ ئەوەی لەکاتی دانوستانەکاندا ململانێ و دووبەرەکی دروست نەبێت، قوڕەیش لە ئێستادا توانای تووڕەبوونی نییە و نایەوێت جەنگ بکات.

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ حەلیسی بینی فەرمووی: ئەو کەسە لەوانەن لە درووشمەکانی کەعبە و عەج و عومرە زۆر بەرز ڕادەگرن و ڕێزی هەموو بنەماکانی ماڵی خوا دەگرن، ئەوانەش بە گەورە ڕادەگرن کە دێن بۆ حەج و عومرە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوانەی وت کە لەگەڵی دا بوون فەرمووی: بڕۆن لەبەر چاویان قوربانییەکان بهێنن و سەری ببڕن بۆ ئەوەی بزانێت مەبەستی ئێمە تەنها عومرە و بەرزڕاگرتنی ماڵی خوایە.

هاوەڵان پێشوازییان لێکرد، لەگەڵیدا تەلەبییەیان دەکرد و هاواریان دەکرد (لبیک اللّهم لبّیک).

کاتێک حەلیس ئەوەی بینی تورەبوونی پێوە دیاربوو وتی: چۆن ڕێگا لەو خەڵکە دەگرن هاتوون بۆ ماڵی خوا؟! بەو شێوە پێغەمبەری خوا ﷺ توانی دڵی حەلیس بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، ڕاستە حەلیس کوڕی عەلقەمە کافرە لە هەمان کاتدا ئەبو سوفیانی کوڕی حەربیش هەر کافرە، بەڵام مامەڵەکردن لەگەڵ دوو کەسی کافردا بە جیاوازی دەکات، لەگەڵ هەریەک لەوانە ڕێگای تایبەت هەیە بۆ مامەڵەکردن، ئەویش بریتییە لە هونەر و جۆری مامەڵە کردن، کافری بەڕێز و حورمەت هەیە و کافری غەوار و خیانەتکاریش هەیە، کافر هەیە مولحیدە و هیچ ڕێزێک لە ئایین ناگرێت، کافر هەیە ديندارە و ڕێز و حورمەتی ئایینی لایە.

کەواتە بەم شێوەیە مرۆڤەکان جیاوازن، دەبێت بە جیاواز مامەڵە لەگەڵ هەر کەسە بە گوێرەی ئەقڵ و تێگەیشتن و یاخود ئەو ڕەوشەی تێیدا بکەی، ئەوەش حیکمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەو ڕەوشەی بینی حەلیسی کوڕی عەلقەمە بۆ لای موشریکەکانی مەککە وتی: چۆن ڕێگایان لێ دەگرن بۆ عومرە هاتوون وازیان لێ بهێنن بێنە ناو مەککە و بۆ ماڵی خوا هاتوون، بەڵام قوڕەیش قسەی حەلیسیان شکاند و حەلیس بوو بە بەرگریکەری موسڵمانان.

---

[٣١] ـ حارث بن كنانة.



ئەوەندەی تر لەسەر قورەیش قورستر بوو، گفتوگۆکان بۆ قورەیش هیچ ئەنجامی نەبوو، دیسان قورەیش بیری لەوە کردەوە ئەم جارە کێ بنێرێت بۆلای پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

تا لە کۆتاییدا بیریان لەوە کردەوە کە گەورەترین و دەوڵەمەنترین پیاوی عەرەب بنێرێت بۆ لای پێغەمبەری خوا ئەویش (عروەی کوڕی مەسعوودی سەقەفی).[٣٢]

## شاندی سێیەم: عروەی کوڕی مەسعوود

سێیەم شاندی قورەیش بۆ لای پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ قورەیش بەو پەڕی سەرشۆڕی و زەلیلی لە حاڵەتێکی زۆر دژواردا دەژیا. ئەمجارەش نێوەندگیرەکە لە قورەیش نییە بەڵکو خەڵکی شاری تائیفە، قورەیش پێیان وابوو کە موسڵمانان ئیحترامی سەقەفی دەگرن گوێ بۆ قسە و ڕاوبۆچوونەکانی دەگرن، چونکە یەکێک لە پیاوە گەورەکانی قورەیش و سەروەتدارترین کەسی عەرەبە.

قیاسی ئەوان بە پارە و نفوزە، تەنانەت کاتێك پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە مەککە بوو گلەیی ئەوەیان دەکرد دەبوو قورئان بۆ دوو کەسی گەورەی وەکو ئەم کەسە عروەی کوڕی مەسعوودی سەقەفی و وەلیدی کوڕی موغیرە کە لە بەدر کوژرا دابەزێت، خوای پەروەردگار بۆمان تۆماری قسە ناماقوڵەکەیانی کردووە لە سورەتی الزخرف و دەفەرموێت:

﴿وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ٣١﴾ [الزخرف]

واتە: (هەروەها بیانوویان گرت و) وتیان: چی دەبوو ئەگەر ئەم قورئانە بهاتایە بۆ یەکێك لەو دوو پیاوەی کە گەورەی هەردوو شاری (مەککە و طائف)ن؟!

خەڵکێک کە خاوەنی ئیمان نین گەورەیی دەدەنە پاڵ مرۆڤەکان بە پارە و سەروەت و سامان و یان هێزی سەربازی، هەرگیز بیر لە ڕەوشت و خواناسی ناکەنەوە بەهەرحاڵ خەڵکی شاری مەککە و هەموو ناوچەکانی تر و نیوەدوورگەی عەرەبی ئەو پیاوەیان نارد بۆ گفتوگۆ و دانوستان لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەڵام بەو پێیەی ئەم کەسێکی گەورەیە و هەمیشە هاوڕێی کیسرا و قەیسەر و پادشاکانە، هەر یەکەم جار لەبەردەم پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دا زمانی زبر و هەڕەشەی بەکار هێنا، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ وەڵامی بداتەوە هیچ کاریگەری نییە بۆ قورەیش، چونکە ئەو لە سەقیفە و خەڵکی تائیفە پاشان ویستی هەموو هاوکێشەکە پێچەوانە کاتەوە، دەیویست پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ پیشان بدات کە

---

[٣٢] ـ عروة بن مسعود الثقفي.



هاتۆتە سەر قوڕەیش و زوڵمیان لێ دەکات و قوڕەیش داماوە لە ماڵی خۆیدایە و بێدەنگ و بێ دەردەسەری دانیشتووە حەقی هیچی نییە.

بە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وت: باشە ئەگەر هاتوو چوویتە خاکی مەککە و هەموو خەڵکەکەیت کوشت؟!

تەمەشاکە چۆن ڕاستە هەڵدەگەڕێتەوە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ عومرە هاتووە نەک بۆ جەنگ و کوشتن، ئەوە قوڕەیشە جەنگ دەکات و هەموو عورف و عاداتی تێکداوە بەسەریەکدا، ئەوانەی کە لەوێدان زۆربەی خەڵکی مەککەن و دەرکراون، جا هەروەکو شێوەکاری فیرعەون ئەویش دەیوت دەترسم موسا تووشی خراپە و فەسادتان بکات خوای گەورە لە سورەتی غافر دا دەفەرموونێت:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾﴾ [غافر]

واتە: ئینجا فیرعەون وتی: وازم لێ بهێنن با موسا بکوژم، با هەر هاوار لە پەروەردگاری بکات، چونکە بەڕاستی من دەترسم کە دین و ئاینتان بگۆڕێت! یاخود دووبەرەکی و خراپە و شەڕوشۆڕ لە وڵات و سرزەوی بەرپابکات!!

هاتنی پیاوێکی بەناو گەورە و ئاوا قسە بکات، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەر وەڵامی نەداوە، چونکە ئەوەی تۆزێک خاوەنی ئەقڵ و کەرامەت بێت چۆن وا قسە دەکات، دەڵێت ئەگەر هاتوو چوویتە شاری مەککە هەموو خەڵکەکەیت کوشت، خەڵکەکەی هەموو کەسوکاری خۆتن سەرکەوتی بەسەریاندا، ئایا لەناو عەرەب دا بیستووتە کەس وابکات لەگەڵ قەوم و هۆزی خۆیدا.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەڵامی نەداوە، هیچ وەڵامێکی نەبوو وەکو ئەوەی کە هەر ئاماژە بۆ قسەکانی نەکات بەهەند وەری نەگرێت.

چونکە لە ڕاستییەوە دوورە، ئەم بۆ عومرە هاتووە بە چەکی موسافیری، قوڕەیش خەڵک ئەنێرن کە نەڕواتە مەککە بۆ عومرە، خۆی یەکێکە لەوانە.

پاشان کە زانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەڵامی ناداتەوە، قسەکەی گۆڕی بۆ هەڕەشە و تووڕەبوون و سووکایەتیکردن بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

وتی: سوێند بەخوا محەمەد ئەوانەی لە دەور و پشتی تۆن هەموو خەڵکی بوودەڵە و منداڵ و هەرزەن و پیاوی جەنگ نین.



پێغەمبەری خوا ﷺ هەر وەڵامی نەداوە، چونکە زۆر بێئەدەبی کرد بەرامبەر بە هاوەڵان، ئەو وای ڕاگەیاند لەبەر چاوی هاوەڵاندا کە گوایە جەنگ ڕووبدات هاوەڵەکانی پێغەمبەر هەڵدێن.

خۆ پێغەمبەر ﷺ دەیتوانی وەڵامی بداتەوە، بفەرموویێت جەنگی بەدر و حەمرا ئولئەسد و ئەحزاب مانەوە لەگەڵمدا لە ئوحودا، هەموو قسەکانت بەدرۆ دەخەنەوە، بەڵام وەکو بێئەرزشی وەڵامی نەداوە.

لەوکاتەدا هاوەڵێک خۆی بۆ نەگیرا و وەڵامی داوە لە کاتێکدا زۆر جێگای سەرنجە ئەو هاتە گۆ وەڵامی بداتەوە، ئەویش ئەبو بەکری سدیقە -ڕەزای خوای لێبێت- لە ڕاستیدا ئەبو بەکر پیاوێکی زۆر نەرم و نیان و لەسەر خۆ زۆر درەنگ تورە دەبێت، بەڵام ئەم کابرایە کەرامەتی هەموو هاوەڵانی ڕووشاند، بۆیە پێویستی بەوەڵامە لەدوای ئەوەی کە عروەی کوڕی مەسعوود جنێوەکەی دا بە هاوەڵان و سووکایەتی کرد، ئەبو بەکر وتی: ئێمە لە دەوری پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ڕاناکەین ئەگەر تۆ پێتوایە ئێمە بوودەڵەین و هەڵدێین برۆ دەم بخە ناوگەڵی لات، کە دووجار سووکایەتی پێکرد ئەبو بەکر جارێک بە کەرامەت و جارێک بە خوای تائیفەکە (لاتە) واتا (ڤینۆس) یان (عشتار) هەموو ئەمانە یەک واتایان هەیە. لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا کەرامەتی شکاند، چونکە قسەکەی ئەبو بەکر زۆر کاریگەر بوو، بۆ پیاوێکی وا گەورە قسەی پێوت وەک ئەوە وابوو سوپای بۆ بجووڵێنێت، بەڵام عروە پاساوی هێنایەوە وتی ئەبو بەکر تۆ چاکەت زۆرە بەسەرمەوە لەبەر ئەو چاکانەت وەڵامت نادەمەوە.

پاشان دووجار سەر شۆڕ بوو جاری یەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەداوە، جاری دووەم ئەبو بەکری سدیق وەڵامی ڕەق و توندی داوە، بەڵام هەر هەوڵی ئەوەی ئەدا کە جەنگی دەروونی لەگەڵ هاوەڵان و پێغەمبەردا بکات.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان ئەو سێ خاڵەی کە بە حەلیسی فەرموو بوو بۆ ئەویشی باس کرد داوای چییە.

لە عورفی دانوستانی عەرەبدا کە دوو سەرکردە قسە دەکەن دەست بۆ ڕیشی یەکتر دەبەن، ئەمەش پیشەیەکی جاهیلی عەرەب بوو.

لەدوای تەواوبوونی قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ عروەی کوڕی مەسعوود، دەستی ئەبرد بۆ ڕیشی پێغەمبەر و پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی بۆ ڕیشی نەدەبرد یەکێک لە هاوەڵان کە پاسەوانی پێغەمبەر بوو ﷺ دەمامکی بەستبوو نەدەناسرایەوە، لە تەنیشت پێغەمبەرەوە ﷺ وەستابوو دەستی گرت و بە عروەی وت ئەم جارە دەست بەری بۆ ڕیشی پێغەمبەر ﷺ دەستت دەبڕم، شمشێری



لێدەرهێنا، عروەش بینی شمشێرەکەی لە ڕادە بەدەر تیژە، ترسا لەوەی دەستی ببڕێت وازی هێنا بەسەر سوڕمانەوە وتی ئەمە کێیە؟ دیارە بە جورئەتی موعجیب بووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی ئەوە برازاکەتە بە پێکەنینەوە، برازاکەی سوێندی خواردووە ئەگەر جارێکیتر دەست بەرێت بۆ ڕیشی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ دەستی دەپەڕێنێت، دەستی مامی دەپەڕێنێت و گوێی بۆ ناگرێت و خۆشەویستی بۆ ڕەسولی هاشمی هەیە و هیچ گرنگی نادات بە مامە سەقەفییەکەی، کاتێک پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەوە برازاکەتە، ئەویش دەمامکەکەی لادا و وتی بەڵی تۆ مامی منی و منیش (موغیرەی کوڕی شوعبەی کوڕی مەسعوودی سەقەفیم).

جارێکی تر عروە کەرامەتی درایەوە لە زەوی، بۆ برازاکەی ئەو وەلائو خۆشەویستییەی هەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ کەچی لە بەرامبەردا هیچ وەلائو خۆشەویستی بۆ ئەو نییە، بگرە وەکو دوژمن تەماشای دەکات؟!

پەیامەکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باش گەیشت بە گەورە پیاوی عەرەب، خۆی چەندە بەگەورە دەزانی ئەوەندە موسڵمانان بچووکیان کردەوە تا بەناچاری گەڕایەوە بۆ لای قوڕەیش.

ئەوەی کە بینیبووی بۆ قوڕەیشی گێڕایەوە، بێگومان کاریگەری لە دڵی قوڕەیش درووست کردووە، پیاوێکی وەکو عروە ناتوانێت درۆ بکات و چەواشەکاری لەگەڵ قوڕەیشدا بکات، لە قسەکانیدا دەردەکەوێت کە چەند کاریگەری لەسەر دڵ و دەروونی داناوە چەند شکۆی هاتۆتە خوار لەکاتێکدا خۆی بە شکۆمەندترین مرۆڤی عەرەب دەزانی، بەڵام بابزانێت چۆن ڕووداوەکان بۆ قوڕەیش ڕووماڵ دەکات.

جارێ دەیەوێت ئەوەی کە لە هاوەڵەکانی محەمەد بینیوویەتی ئەوە باس بکات، چونکە هاوەڵان شکۆیان خستە ناو خاک، لە کاتێک دا شکۆی لە ئاسماندا بوو!

دەڵێت: ئەی هۆزی قوڕەیش، سوێند بەخوا شاند بووم بۆ لای پادشا و قەیسەر و کیسرا و نەجاشی، ئەم جارەش سوێند بەخوا، هیچ کەس لە هاوەڵانی ئەوانم نەدیوە ئەوەندەی هاوەڵانی محەمەد، محەمەد بەبەرز و پیرۆز و گەورە ڕابگرن کاتێک دەستی دەشۆرد و دەستنوێژی دەگرت هاوەڵان بۆ خواردنەوەی ئاوی دەستنوێژەکەی وەکو تەبەڕوک و موبارەک خەریک بوو یەکتریان لەسەر دەکوشت، کاتێک لەلایدا قسەیان دەکرد دەنگیان نزم دەکردەوە و هەرگیز دەنگیان لە دەنگی بەرزتر نەبوو، عروەی کوڕی مەسعوود، کاریگەری پێغەمبەری لەسەر دڵ و دەروون درووست بوو بوو، پاشان کاریگەریەکەشی گواستنەوە بۆ قوڕەیش، ئەوەندەی تر قوڕەیشی ترساند، پاشان وتی: محەمەد بەڕاستی داوایەکی پێگەیشتوو و باشی لێ کردوون، بەقسەم بکەن



و قبووڵی بکەن و زیاتر مەبەستی عروە نەکردنی جەنگ و ئاگربەست بوو، ڕایگەیاند کە محەمەد تەنها بۆ بەجێ هێنانی عومرە هاتووە، وازی لێ بهێنن با عومرەکەی ئەنجام بدات.

ئەگەر تەماشا بکەین هەموو ئەوانەی گەڕانەوە، بوونە بەرگریکار لە پێغەمبەر و هاوەڵان، داواکانی ئەوانیان بەسەر قوڕەیش دەسەپاند، قوڕەیش نەیدەزانی چ هەنگاوێک هەڵبنێت.

تەماشای هەڵوێستی هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەر خوا، ﷺ لەو پەڕی هێز و توانا و عیزەت و سەربەرزی بوو، قوڕەیش بەتەواوەتی لە داڕووخانی دەروونیدا بوو، لەبیری ئەوەدایە کە چۆن سوڵحی لەگەڵدا بکات و داوای بەخشین وەرگرتنیان چی بێت و لەناو خۆیاندا کەوتنە گفتوگۆ، تا ئەم چرکەساتە قوڕەیش نایەوێت لەگەڵ پێغەمبەر دابنیشێت بۆ دانوستان و دان بەبوونی پێغەمبەر و دەوڵەتەکەیدا نانێت، بەڵام بەدوای سوڵحەوەن.

## بەدیل گرتنی ٥٠ سەربازی قوڕەیش

ڕاغیب: کۆمەڵێک لە لاوەکانی قوڕەیش ئەوانەی کە خوێن گەرم و هەرزەکار بوون بێگەڕانەوە بۆلای قیادەیان بڕیاری جەنگیان دا، بەسەرپەرشتی عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، ئەم گەنجانە زۆربەیان باوک و برا و کەسوکاریان لە شەڕی بەدردا کوژرابوون، خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگی موسڵمانان، بۆ ئەوەی لە مەیدانی کار و واقیعدا جەنگ بەسەر هەردوولادا بسەپێنن!

ئەوان پلانیان وابوو کە لەم ٥٠ کەسە کۆمەڵێک لە موسڵمانان شەهید بکەن، بۆ ئەوەی جەنگەکە لە نێوان هەردوولادا هەڵبگیرسێت.

لەشەوێکی درەنگدا ئەم ٥٠ کەسە چوونە ناو سەربازگەی موسڵمانان و (محەمەدی کوڕی مەسلەمە) لەکەمیندا بوو، هەر ٥٠ کەسەکەی بەدیل گرتن، شەوان کۆمەڵێک لە هاوەڵان هەمیشە پاسەوان بوون،

دەنگۆ بڵاوبوویەوە کە ٥٠ کەس بەدیل گیراوە، قوڕەیش ئەوەندەی تر نارەحەت بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستگۆیە ئەگەر چی ئەوە ڕاوێکی زۆر باش بوو نێچیرەکان قەڵەو بوون، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بۆ جەنگ نەهاتووە! هاتووە بۆ عومرە، هەموویانی بەسەر شۆڕی ڕادەستی قوڕەیش کردەوە، نیازپاکی خۆی دەربڕی بۆ قوڕەیش کە جەنگ ناکات.

دەیتوانی وەکو کاری سیاسی و فشار بەکاریان بهێنێت، بەڵام ئەوە لەبەر بەرز ڕاگرتنی حورمەتی کەعبە کە ماڵی خوای پەروەردگارە.



له هەمان کاتدا سوڵح و ئاشتەوایی دەوێت، دەیەوێت بانگەوازی ئیسلامی بڵاوبکاتەوە له ڕەوشێکی هێمن و ئارام و پڕ ئاسایشدا.

خوای گەورە لەبارەی ئەو هەڵوێستەوە لە سورەتی الفتح دا دەفەرمووێت:

﴿وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾﴾ [الفتح]

واتە: هەر ئەو زاتە بوو کە دەستی بێ باوەڕانی لە ئێوە بەستەوە (نەیهێشت بەگژتانا بێن) دەستی ئێوەشی گرتەوە دژیان و (نەیهێشت جەنگ ببێت)، وێڕای سەرکەوتنی ئێوە بەسەریاندا لەناو جەرگەی مەککە دا، خوا هەمیشە و بەردەوام بە کار و کردەوەتان بینایە.

## شاندی چوارەم: میکرەزەی کوڕی حەفس

ڕاغیب: چوارەم شاند کە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ زۆر گرنگی پێنەدا، چونکە هەر هاتە ناو موسڵمانان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە (میکرەزەی کوڕی حەفسە)[٣٣] فاجری ناو قورەیشە، واتا خراپەکاری ناو قورەیشە دیارە زۆر گرینگی پێنەداوە، بۆیە ئەمە چوارەم شاندە کە قورەیش دەنێرێت، هەر چوار جارەکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان قسە دووبارە دەکاتەوە، قورەیش سەرگەردان بووە نازانێت داوای چی بکات، لەڕاستیدا گوێی نەداوە بە پەیامی نێردراوەکانی.

بە پێچەوانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دڵنیایی ویستی نێردراوی خۆی بنێرێت بۆ ئەوەی دڵنیا بێت کە وتە و فەرمایشتەکانی گەیشتووە بۆ قورەیش زۆر گرنگە داواکاری موسڵمانان و ڕوونکردنەوەیان لە ڕێگای خۆیانەوە بێت، نەوەکو خەڵکی تر توانای گەیاندنی نەبێت، یاخود خیانەت لە وشە و لە ڕاستییەکان بکات.

هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ بیری لەوە کردەوە کە خۆی نێردراوی تایبەتی خۆی بنێرێت و داواکاری موسڵمانان و دەوڵەتەکەی ڕابگەیێنێت و بەڕاشکاوانە بانگەوازی ئیسلامی بخاتە بەردەمیان، قورەیش بەڕوونی پەیامەکانی پێ بگات.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٣] ـ مكرز بن حفص.



## ناردنی شاندی موسڵمانان بۆلای قورەیش

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لەوە کردەوە کە عومەری کوڕی خەطاب بنێرێت بۆ دانوستاندن و پەیامی خۆی بەودا بگەیەنێت، لەبەر ئەوەی لە ڕابردوودا عومەر سەفیری قورەیش بووە بۆ هەموو جێگاکان عومەر ڕۆیشتووە، لە هەمان کاتدا زۆر جار ئایەتی قورئان یەکانگیر بوو لەگەڵ ڕاوبۆچوونی عومەردا، تەنانەت لە کتێبی زانایاندا بەشێکیان داناوە لە مێژوو بەناوی (موافقات عمر)، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ عومەری هەڵبژارد، ئەمەش ڕەهەندێکی ستراتیژی قووڵی تێدا بەدی دەکرا، بەڵام عومەر داوای لێبوردنی کرد لە پێغەمبەر و کارەکەی ئەنجام نەدا، هۆکارەکە پێدەچێت بگەڕێتەوە بۆ سەفیری یەکەمی پێغەمبەر ﷺ بەناوی (خیراشی کوڕی ئومەییە خوزاعی)[٣٤] پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ شاری مەککە، قورەیش لێی کۆبوویەوە بۆ ئەوەی بیکوژن، بەڵام ئەحابیشەکان نەیانهێشت، بۆیە لە قسەکانی عومەردا دەردەکەوێت کە هۆکارەکە چی بووە.

فەرمووی بە پێغەمبەر: یا رسول الله ﷺ من لەناو قورەیشدا کەسێکی وام نییە کە تووڕەبێت لەسەرم یان بمپارێزت، ئەگەر عومەر کوژرا یەک کەس لە عەشیرەتی بەنی عودەی ناجووڵێت، چونکە عەشیرەتێکی لاواز و کەمن، عومەریش دەیەوێت بەهەر شێوەیەک بووە سوڵحەکە ئەنجام بدرێت و عومرە بکات!

بۆیە ئاماژەی بۆ عوسمانی کوڕی عەفان کرد ئەو لەعەشیرەتی بەنی ئومەییە بوو، عەشیرەتەکەیان لەناو هەموو قورەیشدا زۆر بەهێزە و خاوەنی مێژوو و چەک و سەربازە، خەڵکی حیسابی زۆری لەسەر دەکەن، هۆزی ئەبو سوفیانە و ئێستا گەورە و سەرۆکی مەککەیە.

گومان لەوەدا نییە کە عومەر ترسی لە مردن نەبووە لە پێش ئەو ڕووداوە، لە دوای ئەو ڕووداوەش ئەو هەموو کات ئامادەیی گیانفیدایی و بەخشینی ڕۆح بوو لە پێناوی خودا، بەڵام لێرەدا کێشەکە ڕووبەڕووبوونەوەی بە چەک و مەیدانی جەنگ نییە، بەڵکو ویستیان بە سوڵح کارەکە ئەنجام بدەن.

خۆ دەیتوانی ئەبو بەکر هەڵبژێرێت، بەڵام ئەویش خاوەنی عەشیرەتێکی بەهێز نییە بۆیە عوسمانی کوڕی عەفان زۆر شیاوە بۆ ئەو سەفارەتە و ئەو دانوستانە، عوسمان بەناوبانگە لە هونەری گفتوگۆ و هێمن و خاوەن حیکمەتە، لەناو شاری مەککە کەسێکی خۆشەویست بوو لە زەمەنی جاهیلی و ئیسلامدا، لەبەر ئەوەی لە ژیانیدا پیاوێکی خاوەن کەرەم و بەخشندەبووە

---

[٣٤] ـ خراش بن امية الخزاعي.



و بەخشینی بێسنوور بووە، هەموو خەڵکی مەککە سوودیان لێبینیووە، هەروەها زاوای پێغەمبەری خوایە صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ. ناردنی عوسمانیش مانای ئەوەیە کە پێغەمبەریش صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ سوڵحی دەوێت و ئارەزووی ئاگر بەست و کۆتایی هێنانی هەیە بە جەنگ.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ عوسمانی نارد و ئەو کارەی پێ سپارد.



# ناردنی عوسمان بۆ مەککە و داواکاری موسڵمانان

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ عوسمانی نارد و ئاگاداری کردەوە کە کاری ئەو سێ ئەرکە.

ئەرکی یەکەم: قورەیش ئاگادار بکاتەوە ئێمە تەنها بۆ بەجێهێنانی عومرە هاتووین لەم قۆناغەدا جەنگمان ناوێت، ئەگەر قورەیش ڕازییە بەهەر هەنگاوێک بۆ بەرز ڕاگرتنی ماڵی خوا ئەوا ئێمەش ئامادەین.

ئەرکی دووەم: بانگەوازی قورەیش بکە بۆ ئیسلام، ئەگەر ئیسلامیان وەرگرت ئەوا لەهەردوو دونیا سەربەرز دەبن، لەوکاتەشدا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جەخت لەسەر هیدایەت و ئیسلام بوونیان دەکاتەوە.

ئەرکی سێیەم: لەناو شاری مەککەدا بەنهێنی بڕواتە لای هەندێک لە موسڵمانە هەژار و لاوازەکان کە ماونەتەوە و بۆ شاری مەدینە توانای هیجرەتیان نەبووە کە مژدەیان بداتێ خوای گەورە دینی خۆی سەردەخات و ئەوانیش عەرزی دەکات، ڕۆژێک دێت لەشاری مەککەدا کەس ئیسلام بوونی خۆی ناشارێتەوە، ئەمە مژدەی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەدڵنیاییەوە ڕاستە و دێتەدی. بۆ ئەوەی ئەو موسڵمانانەش بزانن کە ڕۆژێک بوو قورەیش لەگەڵ ئەحزاب دا هێرشیان هێنا بۆ شاری مەدینە، بەڵام وا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەبەردەم دەرگای مەککەدا وەستاوە بۆ چوونە ناوەوەی.

پێغەمبەر گرنگی زۆری ئەدا بە خەڵکەکەی لەناو دەوڵەتەکەی و دەرەوەی دەوڵەتەکەی، هەرکەسە و بە گوێرەی بارودۆخ (زروف) و جێگا و شوێنەکەی.

ئەم سێ خاڵە کار و ئەرکی گرنگی عوسمان بوو -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-.

بەڵام عوسمان ئەزمونی (خیراسی کوڕی ئومەییەی) خوارزای لەبەر چاو بوو، دەیویست ئەو ئەزموونەی ئەو دووبارە نەبێتەوە، هۆکاری ئەمنیەتی ئاسایشی خۆی لەبەر چاو گرت و پێش ئەوەی بڕواتە ناو شاری مەککەی پیرۆز، یەکەم کار کردی داوای کرد لە (ئەبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاسی ئەمەوی)[٣٥] کە بڕواتە ناو ماڵی ئەو داڵدەی بدات، لەناو عەرەبدا (جار) هەبوو لەواتای داڵدەدانە، کەسێک بوو لە پیاوانی ناوداری ئەمەویی، پەیوەندییەکی بەهێز و پتەوی هەبوو لەگەڵ عوسماندا بۆ ئەوەی ئەگەر هەرشتێکی نەخوازراو ڕوویدا ئەبان عوسمان

---

[٣٥] ـ ابان بن سعيد ابن العاص الأموي.



بپارێزێت، بە هۆکاری ئەو پەیوەندی و خزمایەتیی و لێک نزیکبوونەوەیان عوسمان تەوەکولی بەخوای خۆی بەست و چووە ناو شاری مەککە، لە ڕێگای داڵدەدانی ئەبانی کوڕی سەعید.

ئەبان پیاوێکی دەوڵەمەندی شاری مەککە بوو، پێش ڕۆشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کاری بازرگانی چووبووەوە وڵاتی شام، لە سەفەرەکەیدا چاوی دەکەوێت بە ڕاهیبێکی نەسارا و بۆی باس دەکات کە لەوڵاتی ئەودا واتا خاکی مەککە لەم کاتەدا پێغەمبەرێک دێت.

(سبحان الله) ئەبان لە ڕووی دەروونییەوە ئامادە بوو بۆ ئەوەی بڕوا بەو پێغەبەرە بکات، وا ئەو پێغەمبەرەش لەبەردەم دەرگای مەککە دایە، عوسمانی کوڕی عەفان نوێنەری ئەو پێغەمبەرەیە، ئەم هەست و سۆز و درووست بوونی ئیحساسەی ئەبان وای کرد کە بەرگرییەکی زۆر باش و چاک و بێوێنە لە عوسمان بکات، عوسمانیش توانی ئەو کارەی پێ سپێردرابوو بە باشترین شێوە ئەنجامی بدات، بەم شێوەیە عوسمان توانی بڕواتە ناو شاری مەککە و بەو پەڕی عیزەتی نەفسەوە، لەهەمانکاتدا نوێنەر و سەفیری پێغەمبەری خوایە ﷺ و نوێنەری ١٤٠٠ هاوەڵی بەڕێزە کە بۆ ئەنجامدانی عومرە هاتوونەتە شاری مەککە و لە دەرەوەی شاردا وەستاوون بۆ چوونە ناوەوەی بۆ بەجێهێنانی عومرەکەیان، کاتێک عوسمان گەیشتە ناو شار و قوڕەیش پێشوازی سەفیری لێ کرد و زۆر بەڕێزەوە گوێی بۆ گیرا و داوای لێ کرا کە داواکارییەکەیان بخاتە ڕوو لەبەردەم هەموو مەجلیسی قوڕەیشدا، ئەویش هەموو داواکارییەکانی خستە ڕوو.

ڕێگا درا بە عوسمان کە ئەو دەتوانێت عومرە بکات و بە دەوری کەعبەدا تەواف بکات، لەگەڵ ئەوەی عوسمان زۆر موشتاق بوو بۆ بۆ ئەنجامدانی ئەو درووشمە کە ماوەی چەند ساڵێک بوو دوور بوو لەشاری مەککە و لەگەڵ دەستکەوتنی ئەجر و پاداشتی زۆر، بەڵام عوسمان زۆر بەڕاشکاوانە بەقوڕەیشی وت ئەو عومرە ئەنجام نادات تا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا نەبێت، ئەمەش ئەو پەڕی وەلائو گوێڕایەڵی موسڵمانانە بۆ سەرکردە و ئەمیرەکەیان.

قوڕەیش زۆر بەو قسەیەی عوسمان شکستی هێنا و تێگەیشتن کە موسڵمانان بەهیچ شێوەیەک لەقسەی مامۆستا و پێغەمبەرەکەیان دەرناچن.

قوڕەیش هەرگیز ناتوانێت درز و کەلێن بخاتە ناو ڕیزی موسڵمانان.

ئینجا قوڕەیش بیریان لەوە کردەوە کە بەتەواوەتی سوڵح بکەن لەگەڵ پێغەمبەردا و داوای کاتیان کرد لە عوسمان.



قورەیش توانای بڕیاردانی نەبوو عوسمانیش لەشاری مەککە چاوەڕوان بوو، لەو ماوەیەی کە قورەیش بڕیاری بۆ نەدەدرا چەند ڕۆژی پێچوو، لەناو موسڵمانان پڕوپاگەندە بڵاو بوویەوە کە عوسمانی کوڕی عەفان لە شاری مەککەدا کوژراوە.



# کاردانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەواڵی کوشتنی عوسمان

ڕاغیب: لەماوەی چاوەڕوانی عوسمانی کوڕی عەفاندا بۆ گەڕاندنەوەی بڕیاری قورەیش، لەناو موسڵماناندا بڵاوبوویەوە هۆکاری دواکەوتنی عوسمان لەشاری مەککە کوشتوویانە، ئەمەش کاریگەری زۆر خراپی بەدوای خۆیدا دەهێنێت، لەهەمانکاتدا دژی هەرچی عورف و یاسایە لە جیهاندا، هەروەها ئیهانە و پێشێلکارییەکی زۆر گەورەیە بۆ دەوڵەتی ئیسلامیٚ کە سەفیرەکەی بکوژرێت.

تەنها بەبیستنی ئەو هەواڵە بەگوێی پێغەمبەردا، زۆر بەجددی هەڵسا مامەڵەی لەگەڵ ڕەوشەکەدا کرد، داخۆ دەبێت چی بکات کە دەوڵەتی عەزیز و قسە ڕۆیشتووە بەرگری لە هاوڵاتییەکانی دەکات، ئێستا سەفیرەکەی کوژراوە؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا هەموویانی کۆکردەوە، لەگەڵیاندا پەیمانی بەست و بەیعەتی لێوەرگرتن کە لەمێژووی ئیسلامیدا بەگەورەترین و گرنگترین بەیعەت داندراوە، لە مێژوودا بەناوی بەیعەتی (دار یان ڕیزوان)[٣٦] هاتووە، بۆچی ناونراوە بە بەیعەتی دار لەبەر ئەوەی لەژێردارێکدا هەموو بەیعەتی مردنیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ یاخود بەیعەتی ڕیزوان بۆ ئەم ناوەی لێنراوە چونکە خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بوو، خوای پەروەردگار لە سورەتی الفتح دا دەفەرمووێت:

﴿۞ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴿١٨﴾﴾ [الفتح]

واتە: هبەڕاستی خوا ڕازیی و خۆشنوودە لەو باوەڕدارانەی کە پەیمانیان دایتێ (ئەی پێغەمبەر ﷺ) لە ژێر درەختەکەدا، خۆی ئاگادارە بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە (لە نیازپاکیی و دڵسۆزیی) بەو هۆیەوە ئارامیی و هێمنیی و ئاسودەیی دابەزاندە سەریان و پاداشتی بە (مژدەی) سەرکەوتنێکی نزیك داناوە.

هەموو بەیعەتیان دا لەسەر ئەوەی کە ڕا نەکەن تا مردن، هەموو بەیعەتی مردنیان دایە پێغەمبەری خوا ﷺ.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٦] ـ بیعة الشجرة/ بیعة الرضوان.



لەناو هاوەڵاندا هەبوو سێ جار بەیعەتی دا لەسەر مردن وەکو (سەلەمەی کوڕی ئەکوەع) ئەم بەیعەتە زۆر ترسناک و خەتەر بوو بۆ قورەیش، جەنگ لەگەڵ قورەیش دەکەن تاکو دەمرن. هیچ کەس لەجەنگ ڕا ناکات لەگەڵ ئەوەی کە چەکی تەواویان پێ نییە و هەموو چەکی موسافیریان پێیە، بەڵام بەیعەتی مردن دراوە.

تەنها مونافیقێک بەیعەتی نەدا ئەویش (جەددی کوڕی قەیس)[٣٧] بوو ئەوکاتە لەوێدا ئامادە نەبوو.

لەهەمووی سەیرتر ئەوە بوو، هەر لەدوای ئەو بەیعەتە عوسمانی کوڕی عەففان بەسەلامەتی گەڕایەوە و تووشی هیچ نەبووبوو.

وەڵامی لە لای قورەیش هێنا کە قورەیش ڕازی بووە بە سوڵح، یەکێک لە قیاداتی خۆی بەزووترین کات دەنێرێت بۆ دانوستان و لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ سوڵح.

خوای پەروەردگار لەبارەی بەیعەتی موسڵمانان لە سورەتی الفتح دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾﴾ [الفتح]

واتە: ئەوانەی پەیمان دەدەن بە تۆ (ئەی محەمەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) لە ڕاستیدا پەیمانیان بە خوا خۆی داوە، دەستی پیرۆز و بەتوانای خوا لەسەر دەستیانەوەیە (بە پشتگیری و یارمەتی) جا ئەوەی پەیمانەکە بشکێنێ و لێی پاشگەز بێتەوە، ئەوە لەسەر خۆی دەکەوێت، ئەوەش کە پەیمانەکە دەباتە سەر و پاشگەز نابێتەوە لێی، خوای باڵادەست ئەجرو پاداشتی گەورەی پێدەبەخشێت.

تا ئێرە من زۆرم قسە کرد ماکوان، پێم خۆشە تۆش سەرنج و بۆچوونت لەمەڕ ئەم ڕووداوانەی سوڵحی حودەیبییە بزانم، تۆش لەناو ڕووداوەکاندا پێم بلێ خوێندنەوەت چییە بۆ ئەم ڕووداوانە.

ماکوان: سوپاس ڕاغیبی برام، ماشاءالله وا ڕووماڵی باسەکان دەکەیت مرۆڤ حەز دەکات هەر گوێت بۆ بگرێت.

سەرەتا من وای دەبینم هەموو ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ تەرتیبی ئیلاهییە، باشتر بڵێم هەموو ویست و ئیرادەی خوای موتەعالی لەپشتە، چونکە هەروا بە ئاسانی

---

[٣٧] ـ الجد ابن قیس.



بۆ ئێمە باس نەکراوە کە خوای گەورە دەفەرموویّت لە سورەتی الأحزاب دا پێغەمبەرەکەتان باشترین نیشانەیە شوێنی بکەون:

﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾ [الأحزاب]

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو ڕێك پێك هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

کەواتە لە ژیانی هەموو موسڵمانێکدا دووبارە دەبێتەوە، بەومەرجەی شوێنکەوتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بێت.

ئەم بەیعەتی ڕزوانە یاخود ڕازیبوونەی خوای پەروەردگار لە هاوەڵان زۆر مانا و مەدلولاتی هەیە بۆ ئێمە و بۆ گشت موسڵمانان ئەویش بریتییە:

یەکەم: دڵسۆزی و ئیخلاس بەرامبەر بەدینی خوا و ئیمانداران، لە دونیا دا واتا تەواو خۆ تەسلیم کردن بە خوای پەروەردگار لەهەموو کار و بارێکدا، خوای پەروەردگار لە سوورەتی الأنعام دا دەفەرموویّت:

﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾﴾ [الأنعام]

(ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەی ئیماندار) بڵێ: بەڕاستی نوێژ و حەج و درووشمەکانی و (سەرجەم چاکە و بەندایەتیم) هەروەها ژیان و مردنم پەیوەستە بە پەروەردگاری جیهانیانەوە.

هەموو شتێک لە ژیانی ئیمانداراندا واتا لەهەموو هەڵسوکەوتێکدا لەپێناوی خوادا بێت لەو ڕۆژەی کە لە خزمەتی ئەم ئایینە دایە تا کۆتا چرکەساتی ژیانی کە دەمرێت لەپێناوی خوادا بێت، ئەم بیروباوەڕە خۆی لەخۆیدا زۆر سەختە، بەڵام لەڕووی جێبەجێکردن و پراکتیزە کردن خوای پەروەردگار بۆ مرۆڤی خواناس و خاوەن ئیمان ئاسانی دەکات.

با بگەڕێینەوە ناو باسەکە و لە واقیع و مەیداندا شیکاری بۆ بکەین.

ئەم کۆمەڵە موسڵمانە لەشاری مەدینەوە بۆ بەجێهێنانی عومرە کەوتونەتە ڕێ بەبێ چەکی جەنگ، بەچەکی سادەی خۆپارێزی کە مرۆڤ دەڕوات بۆ سەفەر یان جێگایەک، هیچ هاوکارییەک دوور و نزیک بەو کۆمەڵە ناگات لەناوچەی بیرەکانی حودەیبییە ٥٠٠کم دوورن لەناو خاک و ماڵی خۆیان، زۆر ئاسایی و سروشتییە مرۆڤ لەڕووی سەربازییەوە بیربکاتەوە ئەم



(١٤٠٠) مرۆڤە ئەگەر لەگەڵ موشریک جەنگ بکا بەدڵنیاییەوە دەکوژرێن و لەناو دەچن، چونکە ڕووبەڕووی سوپایەک دەبنەوە بەهێز و پڕ لە توانایە، نزیکە لەناو لەماڵی خۆی زوو هاوکاری پێدەگات، بێجگە لەهاوپەیمانەکانی قورەیش وەکو ئەحابیش و هۆزەکانی دەوروبەری.

لەم بەیعەتی مردنەدا یەک هاوەڵ بیری لە منداڵ و ژن و خێزان و تەنانەت بیریان لە پارە و سەروەت و بازرگانی نەکردەوە، لەهەمووی گرنگتر بیریان لە ژیانیان نەدەکردەوە، کەس نەیووت بەخوا زروفم (باردۆخم) ناسکە و ڕێگا نادات لە ئێستادا بەیعەتی مردن بدەم، یاخود کەسیان ئیعترازیان نەبوو لەڕوودا دامێنن و لەبەر سومعە و ڕیا بەیعەت بدەن، هەموو بەڕاستگۆیی و سەرڕاستانە بەیعەتیان دایە پێغەمبەرەکەیان بەبەڵگەی ئەوەی خوای پەروەردگار لە سوورەتی الفتح دا دەفەرمووێت:

﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ [الفتح]

واتە: بەڕاستی خوا ڕازیی و خۆشنوودە لەو باوەڕدارانەی کە پەیمانیان دایتێ (ئەی پێغەمبەر ﷺ) لە ژێر درەختەکەدا، خۆی ئاگادارە بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە (لە نیاز پاکیی و دڵسۆزیی) بەو هۆیەوە ئارامیی و هێمنیی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەریان و پاداشتی بە (مژدەی) سەرکەوتنێکی نزیك داناوە.

چونکە خوای گەورە ئاگاداری دڵ و دەروون و مێشك و نییەتە، ئەم کردارەی موسڵمانان لەڕاستیدا بەگەورەترین و فراوانترین فەتح هەژمار دەکرێت کە مرۆڤ بەم شێوەیە بوو فەتح کردنی جێگا و شوێنەکان زۆر ئاسانە، خوای پەروەردگار کە سوورەتی فەتحی دابەزاند ڕێک پەیوەندی بەم ساتەوە هەبوو کە موسڵمانان ڕاستگۆیانە بەیعەتی مردنیان دا، ئەم کردارەی هاوەڵان بووە فەتحی موبین و خوای گەورە لەسەرەتای سوورەتی فەتح ئایەتی (١) باسی ئەوە کراوە:

﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ [الفتح]

ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت (مەبەست ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەیە کە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و قورەیشدا مۆرکرا، بەندەکانی ئەو پەیمانە لە ڕواڵەتدا زەرەری ئیمانداران بوو، بەڵام هەر هەمووی گەڕا بەخێر و سەربەرزیی بۆیان).

خوای گەورە ڕازی بوو لەو (١٤٠٠) هاوەڵە کە هێشتا لە ژیاندان و لەسەر زەوی دەژین خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیان ئەدات، دەی سوێند بەخوا ئەوە گەورەترین فەتحە.



کۆمەڵێک لە موسڵمانان لەوپەڕی بەرزی ئیماندا گەیشتوونەتە ئەو ئاستەی لە باوەڕ و تێگەیشتوون و بیر و کرداریاندا، خوای گەورە ڕازی بێت لێیان و قورئان باسیان بکات تا ڕۆژی قیامەت، دەی ئەوە گەورەترین فەتحی موبینە.

لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ڕوویان تێدەکات و دەفەرمووێت بە ١٤٠٠؛ هاوەڵ ئێوە باشترین خەڵکی سەرزەوین لەمێژووی چاکەدا.[٣٨]

ئەمە چ شەهادەت و توانا و عەزەمەتێکە کە ئەم هاوەڵانەی پێگەیشتووە، کەواتە ئەوەی لەم بەیعەتەدا دەرکەوت لەخۆبووردەیی و خۆنەویستی و ئیخلاس بوو، بەخشینی تەواوی توانا و هێزی هاوەڵان بوو، پوختەی ئەم قسەم ئەوەیە؛ یەکەم داوای ئیخلاسە لە موسڵمانان لەدونیا دا.

دووەم: لەرزاندنی شاری مەککە و دەوروپشتی، بەهەواڵی بەیعەتی مردن بە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ و موسڵمانان لەوێدا ڕایانگەیاند کە ئامادەی بەخشینن و لەوەش گرنگتر بەخشینی ڕۆح لەپێناوی خودا، ئاوات و ئومێدیان مردنە لەو پێناوەدا ئەمە هەروا کاری ئاسان نییە، بەڵکو شاری مەککە ئەمەی بیست لەناخەوە شڵەژان و ترسیان لێ نیشت، ئاخر کێ دەتوانێت ڕووبەڕووی هێزێک ببێتەوە کەداوای مردن دەکات، بەچی هەڕەشەی لێدەکەیت بەمردن، لەکاتێکدا ئەو ئامانجی مردنە و بەدوای دادەگەڕێت!

هەموو بەیعەتیان لەسەر مردن داوە و بەهیچ شێوەیەک پشت هەڵکردن و ڕاکردن نییە تا مردن، ئەگەر چی چەک و قەڵغانی باش و تەواویان پێ نییە.

ئەمە بووە هۆکاری دانوستاندنی هۆزی قورەیش، ئەیانویست بەهەر شێوەیەک بووە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ بگەڕێتەوە بۆ شاری مەدینە، ئەگەر چی کەرامەتیان لەکەدار بێت.

هەر ئەم مەینەت و پرەنسیپە بوو وای کرد بتوانن دوو ئیمڕاتۆری گەورەی جیهان بدەن لە زەوی و خۆیان شارستانی و ژیان درووست بکەن، لە جەنگی (ئوبەلەدا) خالیدی کوڕی وەلید بەرامبەر بەسەرکردەی گەورەی دوو ملیۆن سەربازی فارس جەخت دەکاتەوە و پێیان دەڵێت:

لەپێناو شتێکەوە هاتووین بۆ جەنگ مردنمان خۆشتر دەوێت بەقەدەر ئەوەی ئێوە دونیاتان خۆش دەوێت.[٣٩]

ئەم وانەیە گەورەترین وانەی ئەو سوڵحی حودەیبییەیە.

---

[٣٨] ـ (أنتم اليوم خير أهل الارض) مسلم.

[٣٩] ـ (جئتكم بقوم يحبون الموت كما تحبون أنتم الحياة) خالد بن وليد.



سێیەم: بڕیاری مەرگیان دا بەڵام خوێن لە پەنجەیان نەهات، کەچی لە ئوحود بڕیاری ڕاکردنیاندا ٧٠ کەسیان لێ شەهید بوو. ٧٠٠ کەس بوون لە جەنگی ئوحود ٧٠ کەسیان لێ شەهیدبوو، ١٤٠٠ کەس بۆ مەرگ بڕیار ئەدەن و بەیعەت بە ئەمیرەکەیان ئەدەن یەك کەسیان تەنانەت برینداریش نەبوو، بۆیە ئەبو بەکری سدیق فەرمووی: هەرکەس بەدوای مەرگدا بگەڕێت خوای گەورە ژیانی پێدەبەخشێت.[٤٠]

هەر سوپا و کۆمەڵ و کۆمەڵگایەک بەدوای مەرگ بوو لە مردن نەترسایە، بە دڵنیاییەوە خوای گەورە سەرکەوتن و جێنشین و دەسەڵات و هێزیان پێدەبەخشێت، پێچەوانەکەشی هەر گەلێک بەدوای خۆشی ژیان و پارە و سەروەت و سامانەوە بوو دڵنیا بێت جۆرێک لەبێ کەرامەتی و زەلیلی و سەرشۆڕی تووشیان دەبێت، ئەم ئەزموونە لە مێژوودا زۆر بەرجەستەیە.

چوارەم: ڕازیبوونی خوای پەروەردگار لێیان و بەردەوام لەژیاندان و دەژین، ئەم کارە جێگای سەرنجە، ئەم خەڵکە خوا لێیان ڕازی دەبێت و بەڵام لە دوایشدا هەڵە دەکەن و تووشی تاوان دەبن.

خوای گەورە خاوەن زانستی پەنهانەیە واتا (عیلم الغیب)ە، بەدڵنیاییەوە دەکەونە هەڵە و تاوان، چونکە مرۆڤ سروشتی وایە هەڵە دەکات و پێغەمبەریش دەفەرمووێت ﷺ هەموو کەسێک هەڵەی زۆر دەکات، بەڵام باشترین کەس ئەو کەسەیە کە هەڵە دەکات و پاشان تەوبە دەکات.[٤١]

ئەمەش واتا یەک هەڵوێستیی ئیماندارانە لە مرۆڤەکاندا، جێگای ئەوەیە کە خوای گەورە لێت ڕازی بێت، بەسە بۆ قیامەتت، بەواتای ئەوەی هاوەڵان کارێکی وا سەنگینیان ئەنجامدا هیچ توانایەک پارسەنگی ناکات.

بەدڵنیاییەوە لێرەدا من هانی کەس نادەم بۆ تاوان، بەڵکو هانی خۆم و هەموو لایەک ئەدەم بۆ کاری چاکە تا تاوانەکانمانی پێ لاسەنگ بکەین، بۆ نموونە کڕینی (بیری ڕوما) لەلایەن عوسمانی کوڕی عەففان، لەگەڵ ڕێکخستنی سوپای تەبووک کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: لەمەودوا عوسمان هەرچی بکات تووشی زەرەر و زیان نابێت لە قیامەتدا.[٤٢]

یەک هەڵوێستی عوسمان گەیاندی بەم ئەنجامە.

---

٤٠ ـ (قال أبي بكر الصديق: احرص على الموت توهب لک الحياة).

٤١ ـ (كل بن آدم خطاء، خير الخطائين التوابون).

٤٢ ـ (ماضرَّ عثمان ما فعل بعد اليوم).



لێرەدا دەبێت هەموو موسڵمانێک لەخۆی بپرسێت چی ئەنجام داوە بۆ ئەوەی بگاتە ئەو دەرئەنجامە لە قیامەت زەرەرمەند نابێت؟!

هەموو نوێژ و ڕۆژوو دەگرین فەرزەکان جێبەجێ دەکەین، بەڵام کارێک ئەنجام ئەدەین لە ژیانماندا بۆ ئەم ئیسلامە کە بیخەینە بندەستمان و لە قیامەت پێ دەرباز ببین.

وەکو ئەوەی هاوەڵان کردیان یەک کاریان ئەنجام دا لە یەک سەعاتدا یان با بڵێین دوو سەعات بووە کارێک کە تا ڕۆژی قیامەت باسی دەکرێت و خوای گەورەی پێ ڕازیکرا، پێویستمان بە چرکەسات و کاتژمێرێکە لە کارکردن هەیە بۆ ئەم ئیسلامە، بەڵکو لە دونیا و قیامەت خوای گەورە لێمان ڕازیبێت.

قورەیش بڕیاری سوڵحی دا

ماکوان: قورەیش بڕیاری سوڵحی دا لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دا، هەربۆ خۆی بڕیاری دانیشتن و سوڵح لەگەڵ موسڵمانان سەرکەوتنێکی گەورە بۆ موسڵمانان دەنووسرێت، بەڵام ئەم جارە قورەیش ناتوانێت، خەڵکی دەرەوەی قورەیش بنێرێت، لە ئەحابیش و سەقیف و خوزاعە، بەڵکو دەبێت لە قورەیش بێت چونکە سوڵح و خاڵ و بەندی تێدایە، دەبێ کێ بنێرێت بۆ سوڵحەکە؟!

داخۆ عیکرمەی کوڕی ئەبو جەهلە یان خالیدی کوڕی وەلید یان ئەبو سوفیان یان سەفوانی کوڕی ئومەیەیە؟!

ڕاغیب: هیچیان لەوانە نانێرێت، چونکە ئەوانە هەموو خەڵکی سەربازی و توورە و توانای گۆڕینەوەی ڕاو بۆچوونیان نییە، دەبێت کەسێک هەڵبژێرن هێمن و لەسەرخۆبێت.

لای قورەیش مەبدەئو پرەنسیپی جەنگ وەلانرابوو، ئەوان زیاتر لە موسڵمان پێویستیان بە سوڵح بوو، ترس لە دڵ و دەروونیاندا پەنگی خوارد بووە و ئیتر قورەیش پیاوێکی نارد، لە ژیانیدا هیچ مێژوویەکی ئەوتۆی نییە بەخراپە دژی موسڵمانان، تەنها لە جەنگی بەدر دژی موسڵمان بەشدار بووە و بەدیل گیراوە، ئەویش (سوهەیلی کوڕی عەمر) هیچ ململانێیەکی ئەوتۆی نەبووە لە شاری مەککەدا بۆیە قورەیش هەڵیبژارد.



تەنانەت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بینی ئەو هات فەرمووی: قورەیش مادام ئەم کەسەی ناردووە خوای گەورە کاری بۆ ئاسان کردین واتای وایە سوڵحی دەوێت.[٤٣]

بەڵام لەهەمانکاتدا قورەیش مەبەستێکی تایبەتی هەبوو لە ناردنی سوهەیل دا، چونکە هەرچی لە بنەماڵەکەیدا بوو موسڵمان بووبوون، هەروەها چوار کوڕیشی موسڵمان بووبوون، هەرچۆن بوو دەیویست زۆرترین سوود بۆ قورەیش بپچڕێت، ئەوە بۆی ببوو بە شتێکی شەخسی و وەکو تۆڵە قورەیش تۆڵەی پێ دەکردەوە لە منداڵەکانی کە موسڵمان بوون: ئوم کەلسوم و سەهلە کە دوو کچی بوون و دوو کوڕەکەی عەبدوڵڵا و لەگەڵ ئەبو جەندەل.

ئەبو جەندەلی لەماڵەوە زیندانی کردبوو هەروەها بەستبوویەوە، بۆ ئەوەی ڕا نەکات بۆ شاری مەدینە لە براکانی کە موسڵمان بووبوون بریتی بوون لە (سەکران و ئەبوحاتب و سەلیتی کوڕی عەمر)، هەموو خانەوادەکەی موسڵمان بووبوو هەر خۆی مابوویەوە، کارەکە بۆئەوە وەکو نموونەی گەڕانەوەی کەرامەت و پۆزش هێنانەوەیە بۆ قورەیش. هەربۆیە زۆر بە حەماس و چالاکانە کەوتە دانوستان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بۆ بەرژەوەندی قورەیش.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٤٣] ـ ثُمَّ أَرْسَلَتْ سُهَيْلَ بْنَ عَمْرٍو لِعَقْدِ اَلِاتِّفَاقِ وَالصُّلْحِ ، فَلَمَّا رَآهُ اَلنَّبِيُّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : « لَقَدْ سَهُلَ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ » ( رَوَاهُ اَلْبُخَارِي ) ، وَفِي رِوَايَةِ اَلْبَيْهَقِي قَالَ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « قَدْ أَرَادَ اَلْقَوْمُ اَلصُّلْحَ حِينَ بَعَثُوا هَذَا اَلرَّجُلِ »



## هەڵوێستەیەک لەسەر چۆنیەتی سوڵحی حودەیبییە

ڕاغیب؛ هەرکاتێک دوو لایەن بۆ دانوستان دادەنیشن، پێویستە لە نێوانیاندا بەخشین و هەندێک داشکاندن هەبێت لەکاتێک هێزێکی بەهێز لەگەڵ لاوازێک دانوستان دەکات، لاوازەکە ئەگەر خاوەنی حەق و ڕاستی تەواو بێت دەبێت هەندێک داشکاندنی هەبێت بۆ شەرەفی بەرامبەر.

ئەم باسەش وایە, قوڕەیش مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە، خاوەنی سەرباز و هاوپەیمانییە لە ناوچەکەدا، موسڵمانان لاواز و بێهێزن، پێشتر لەلایاندا ژیاون دواتر هیجرەتیان کردووە، پاشان لە مەدینەوە هاتوون بۆ بەجێهێنانی عومرە بەچەکی سادە و موسافیر.

دانوستان دەکرێت بۆ بەرژەوەندی لاکان، ئەگەر لاکان پارسەنگ نەبوو بەدڵنیاییەوە دانیشتن و سوڵح و دانوستان ئەنجام نادرێت پێویستە هەردوولا بەقەدەر یەکتر بەرن، هاوسەنگ بن.

چاکی ئەم دانوستانە لەمە دایە کە لایەنی بەهێز دان بەبوونی لایەنی لاواز دا دەنێت، لەکۆتاییدا قوڕەیش هەرچەندە لووتبەرز بوو، بەڵام دانیشتن لەگەڵ موسڵماناندا و دانی بە بوونیان و دەوڵەتەکەیاندا نا.

بەپێچەوانەوە لایەنی موسڵمانان پێویست ناکات دان بە بوونی قوڕەیش دا بنێن، چونکە قوڕەیش خاوەن مێژووی ٦٠٠ ساڵە لەناوچەکەدا لەلایەن هەموو جیهان دانپێدانراوە.

هەر دانیشتنی قوڕەیش لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ مانای وایە دەوڵەتی مەدینە باوەڕ پێکراوە، وجودی ئەم کۆمەڵە موسڵمانانە لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا بوونی هەیە وەکو دەوڵەت و هێز.

ئەرێنی ئەم سوڵحە لەوەدایە دەبێت موسڵمانانیش داشکان و هەندێک تەنازول بۆ قوڕەیش بکەن، هەندێک لە حەقی بێتە خوارەوە، ئەمەش سروشتی هەموو دانوستانێکە.

لەڕاستیدا هەموو هاوەڵان بەگشتی ئەم سوڵحەیان پێ قبوڵ نەبوو، تەنها پێغەمبەر و یەک بۆ دوو هاوەڵان سوڵحەکەیان بە تەواوەتی قبوڵ بوو، هاوەڵان بەگشتی تەماشای تەنها سلبیاتی ئەو سوڵحەیان دەکردن چاویان لە باشە و چاکە و ئیجابیاتی ئەم سوڵحە نەبوو.

لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەر ﷺ بەچاوێکی فراوان و شمولییەوە تەماشای سوڵحەکەی کرد.



ئەمەش خۆی لەخۆیدا عەزیمی سەرکردە دەردەخات، نابێت هەموو کات سەرکردە دابەزێت بۆ ئاستی جەماوەر، دەبێت جەماوەر بەرزبکاتەوە بۆ ئاستی خۆی، هەموو ئەوەی کە بەدڵی هاوەڵان نەبوو لەبەندی چوار خاڵی دووەمی جێگای ڕەزامەندی هاوەڵان نەبوو، بەم بەشە بچووکە هاوەڵان تورەبوون، ئامانج لەهاتنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەناوبردنی قورەیش نەبوو یاخود ئامانجی تەنها عومرەیەک نەبوو دوایی بگەڕێتەوە و لە ژیانی موسڵماناندا تۆمار بکرێت، یان ئامانجی پێغەمبەر زەلیلکردنی قورەیش نەبوو لەو ساتە وەختەدا، ئامانجی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم چوونە ناو شاری مەککە نەبوو، لەمانەی باسم کرد ئامانجی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم گەورەتر بوو کە لەداهاتوودا بۆمان دەردەکەوێت.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئامانجی سەرەکی لەم سوڵحەدا بانگەوازی ئیسلام بوو نەک لە شاری مەککە بەتەنها، بەڵکو لەسەر هەموو زەویدا، ئەگەر موسڵمانبوونی شاری مەککە دوابکەوێت بۆ چەند ساڵێکی تر، بەڵام خاکی خوای پەروەردگار زۆر گەورەترە و خەڵکی زۆر لە شاری مەککە زیاترە بۆ ئەوەی ئیسلامیان پێ بگات، هەر ئەوە دیدە بەرفراوان و شمولییەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بوو. جەنابیان بەتەنها تەماشای مەککەی نەدەکرد بەڵکو هەموو زەوی لەبەرچاو گرتبوو، ئەمەش بۆچوونی واقیعی ئەو پێغەمبەرە بوو کە دەیزانی چۆن هەنگاو هەڵدێنێتەوە بە وەحی و بەستراتیژی گەردوون کە بریتییە لە قەزا و قەدەری خوای پەروەردگار، ئەم کارە لە دید و بۆچوون و زهنی هاوەڵاندا نەبوو لەوکاتەدا، بەڵکو بەگشتی تەنها و تەنها ئەوەیان لەبەر چاو گرتبوو کە بڕۆنە ناو شاری مەککە و عومرە بەجێبهێنین، تەنها پێغەمبەر بوو کە زۆر قووڵتر و پتەوتر بیری دەکردەوە، خۆ مەرج نییە ئەم ساڵ بێت، با ساڵی داهاتوو بێت، هەر لەبەر کەسێک دواکەوتن هاوەڵان ئەو سوڵحەیان بەتەواوی ڕەت کردەوە.

## پێغەمبەر و شوورا و ڕاوێژ ـ ردن

ڕاغیب: لەوانەیە زۆرێک لەخەڵکی بڵێن ئەی هەموو هاوەڵان ناڕازی بوون لەم سوڵحەدا کەچی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دانەبەزی بۆ فەرمانی شوورا و ڕاوێژ، خۆ زۆرینە لە شوورا و خەڵک ئەم سوڵحەیان قبوڵ نەبوو، ئەی کوا مەبدەئی شوورا ؟

ئەم کارەی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم وەحی بوو, هەر بۆیە شوورا هیچ بەهاونرخی(ئەرزشی) نەبوو، قسەی زۆرینەی خەڵکی بەسەر حوکمی خوای گەورە ناسەپێنێت، شوورا زۆر جیاوازترە لە سیستەمی دیموکراتی، چونکە هەموو ئەو سوڵحە فەرمانی خوای پەروەردگار بوو، چەند جار پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئاماژەی پێدا بەڵام هاوەڵان تێنەگەیشتن، فەرمووی ئەمە وەحییە لای خوای پەروەردگار.



کاتێک کە خەونی بینی خەونەکەی وەحی بوو، بۆیە لەشاری مەدینەدا ڕاوێژی بەکەس نەکرد و تەنها وتی خۆتان ئامادە بکەن بۆ بەجێهێنانی عومرە.

پاشان وەستاندنی وشترەکە فەرمووی ئەو کەسەی کە فیلەکەی ئەبرەهەی چەقاند هەر ئەو زاتەیە وشترەکەی پێغەمبەری چەقاند و نەڕۆیشت بەرەو شاری مەککەی پیرۆز، ئەمەش ئاماژەی دووەم بوو کە وەحییە.

پاشان ئاماژەی تر ئەوە بوو کە قوڕەیش بۆ بەرز ڕاگرتنی شاری مەککە و ماڵی خوا هەرچی داوا بکات پێغەمبەر ﷺ ڕازی دەبێت و ئەم ساڵ ناڕواتە ناو شاری مەککە.

لەهەمووی گرنگتر پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەموو هاوەڵەکانی فەرموو کە ئەم سوڵحە ئەمری خوای گەورەیە و من پێغەمبەری خوام، گوێڕایەڵم بۆ فەرمانەکانی و سەرپێچی ناکەم، خوای گەورەش سەرم دەخات و هەرگیز زایەم ناکات.[٤٤]

بەتەواوەتی دەرکەوت کە ئەمە وەحییە و فەرمانی پەروەردگارە، ڕازی بوون بەهەموو خاڵ و بەندەکانی ئەم پەیماننامەی هیچ گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە هەڵناگرێت، ئەمە هەموو فەرمانی خوایە مەبدەئی شوورا و پرەنسیپیەکانی هیچ بەهاونرخی(ئەرزشی) نییە، ئەمە جیاوازی جەوهەری شوورا و دیموکراتییە.

فەرمانی خوای گەورە لە حەڵاڵ و حەرام، شوورا و ڕاوێژی لەسەر ناگیرێت، بەڵکو دەبێت هەموو بۆی ملکەچ بن، شوورا و پرنسیپیەکانی بۆ باسێکە کە لەباسی شوورا و وەحیدا دەقی لەسەر نەهاتووە، هیچ کاتێک زۆرینە بەکار نایەت بەرامبەر بە حوکمی خوا هەر کەس ئەنجامیدا لە ئیسلامدا دەردەچێت و بەکافر هەژمار دەکرێت، شوورا و دیموکراتی لەم شێوەدا زۆر لەیەک دەچن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا زۆر جیاوازن شوورا پشت دەبەستێت بە قورئان و سوننەت، ئەم دووانە سەرچاوەی سەرەکین بەڵام دیموکراتی سەرچاوەکەی زۆرینەی گەلە!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٤٤ ـ (قال ﷺ: إنِّي رَسول الله، ولست أعصيه، وهو ناصري ولن يضيعني أبداً).



## باند و خاڵی سوڵحەکە

ڕاغیب: هەموو پەیماننامەی حودەیبییە ئەگەر بەچاوی شیکاری تەماشای بکەین پێکهاتووە لە چوار بەند، هەر چوار بەندەکە لەبەرژەوەندی موسڵماناندایە، با هەموو بەندەکان وەکو خۆی بخەینە ڕوو، بریتییە لە چی؟!

بەندی یەکەم: گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا و هاوەڵان لەم ساڵدا و لەساڵی داهاتوودا دێنە ناو شاری مەککە، تەنها بەچەکی موسافیر و ماوەی سێ ڕۆژ و شەو تێیدا دەمێننەوە، قوڕەیش هیچ پەیوەندییەکی پێیانەوە نییە و هەموو شاری مەککە دەردەچێتە دەرەوە.

لە ڕووکەش ئەم بەندە لە بەرژەوەندی قوڕەیشە، ئەم ساڵ دەبێت پێغەمبەر بگەڕێتەوە ﷺ، بەڵام خۆ ساڵی داهاتوو پێغەمبەر ﷺ سوڵحی کرد بۆ گەڕانەوەی بێ ترس و هیچ بەرگرییەکی قوڕەیش، بەڵکو شارەکەی بۆ چۆڵ دەکەن بێ ئەوەی موسڵمانان تووشی هیچ کێشەیەک ببن.

سوێند بەخوا ئەمە سەرکەوتنێکی زۆر زۆر گەورەیە بۆ پێغەمبەر و موسڵمانان، باشە بابگەڕێینەوە بۆ ١٣ ساڵی ڕابردوو، لەو ماوەیەدا ئازار و ئەشکەنجە و کوشتن و بڕین و لەناوبردن لەشاری مەککەدا بۆ موسڵمانان بەرقەرار بوو.

موسڵمانان لەپێناوی دینەکەیاندا ماڵ و ژیان و سەروەت و سامانیان بەجێهێشت و هیجرەتیان کرد بۆ شاری مەدینە و پێشتریش حەبەشە، شەش ساڵی ڕابردوو لەشاری مەدینە بەدر و ئوحود و چەندین جەنگی تر ڕوویدا، تا گەیشتە ئەوەی نیوەی عەرەب لێیان کۆبوویەوە ١٠ هەزار سەربازیان بۆ چوو لە شەڕی ئەحزاب دا بۆ جەنگ تەنها پێش یەك ساڵ لەمەوبەر.

ئەو هەموو سوپا و بەرگری قوڕەیش و موشریکانە کۆتایی هات و ساڵی داهاتوو دەرگا بۆ دەوڵەتی ئیسلامی دەکرێتەوە بۆ چوونە ناو شاری مەکەی پیرۆز بۆ بەجێهێنانی عومرە.

ئەمەش لە سەرکەوتن سەرکەوتووترە، سەربەرزی موسڵمانانە لە هەموو نیوەدوورگەی عەرەبدا، تنۆکی عارەقی شەرمەندەی قوڕەیشە دێتە خوار بەناوچەوانیاندا، ئەی کوا شێر و بازەکانی قوڕەیش، کوا چەک و جبەخانەیان، کوا پەیوەندی و پەیماننامەکانیان و هاوپەیمانەکانیان، بێگومان لە بەرامبەر موسڵماناندا هەمووی داڕما، لەم گۆشە نیگایەوە تەماشای ئەو بەندە بکەیت بەدڵنیاییەوە لەبەرژەوەندی ئیماندارانە، ئەمە مانای بەهێزی موسڵمانانە کە هەموو دەرگاکانی شاری مەککەیان بۆ دەخرێتە سەر پشت، لەکاتێکدا لە مێژوودا بۆ هیچ هۆز و عەشیرەت و تیرەیەک ئەمە ڕووی نەداوە.



بەندی دووەم: وەستاندنی جەنگ بۆ ماوەی ١٠ ساڵ لە نێوان قوڕەیش و موسڵماناندا و دەست هەڵگرتن لەیەکتری.

ئەم بەندە کە قوڕەیش داوای دەکات لەبەرژەوەندی کێیە؟! مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ لە بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی داوای نەکرد با ماوەیەک بۆ جەنگ نەکردن دابنرێت؟

لەڕاستیدا ئەمە داوای موسڵمانانە ئەو ماوەیە لە ئەمان و ئاسایشدا بژین و هەوڵ بدەن جێگای پێی خۆیان لەناوچەکەدا قایم بکەن، هەوڵی زیاتر بۆ بانگەوازی ئیسلام و موسڵمان کردنی خەڵکی و لەهەمانکاتدا ئاقڵ کردن و تەمێ کردنی هۆزە شەڕانگێزەکانی چواردەوری مەدینە بکەن، دەوڵەتی قوڕەیش ماوەی چەند ساڵە بوونی هەیە، دەوڵەتی موسڵمانان نوێیە و بۆ ئەوان ئەمن و ئاسایش گرنگە، تابتوانن بنەما و بنەڕەتی دەوڵەتەکەیان بەهێز بکەن.

خەڵکی بەگشتی موحتاجن بە فێربوونی ئیسلام، پێویستە موسڵمانان کاتی بۆ تەرخان بکەن، چونکە بە تێگەیشتنیان لەم ئایینە نوێیە هەموو حەزی لێدەکەن و سروشتیان داوای دەکات.

لەم ماوەیەدا خەڵکانێکی زۆر لە پیاوان و ژنان و منداڵان دێنە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

کەواتە ئەم بەندەش هەر لە سوود و قازانجی موسڵماناندا بوو بەگشتی، بەڵام ئایا موسڵمانان کە دانیشتن لەگەڵ قوڕەیش، هەموو مافەکانیان بۆ گەڕاوە؟ ئەو سەروەت و سامانەی کە زەوتیان کردبوو بۆیان گەڕاندیانەوە؟

بەدڵنیاییەوە نەخێر، چونکە زۆر شت لەناو براوە و داگیر کراوە، ئەم سوڵحە نێوان هەردوولادا کاتییە، هودنە و ئاگربەست کاتییە لەڕووی شەرعەوە کارێکی باشە و داوا کراوە، بەڵام ئەگەر موسڵمانان ڕازی بوون بەحەق و مافەکانیان کە خوراوە سەرکردەکانیان گوێیان پێنەدا ئەمە جائیز نییە و حەرامە و دوورە لە شەرحی خوای پەروەردگار.

هەموو پەیماننامەکانی ئێستا پێچەوانەی پەیماننامەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، دوژمنەکانی موسڵمانان هەرچی حەق و مافی موسڵمانانە دەیبەن و دەیخۆن، سەرکردەکانیش دەڵێن ئاساییە ئاشتی دەپارێزین وەکو جوولەکەی ناو فەلەستین و ڕۆژئاوا بەگشتی کە مافی موسڵمانانیان زەوت کردووە، موسڵمانانیش بەهۆکاری عەلمانییەت سڕ بوون و لە جێگای خۆیان چەقیوون، سوڵح و پەیماننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەکوێ و پەیماننامەکانی ئێستای موسڵمانان لە کوێ، جیاوازییەکە ئاسمان و ڕێسمانە.

بەندی سێیەم: کێ پێیخۆشە بڕواتە ناو هاوپەیمانی محەمەد ئازادە و هەرکەس و لایەک پێیخۆشە بێتە هاوپەیمانی قوڕەیش بەهەمان شێوە ئازادە، واتە هەر هۆزێک چوونە ناو



هاوپەیمانی هەرلایەک وەکو ئەولایە هەژمار دەکرێت و بەچاوی ئەولایەنە سەیر دەکرێت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

واتا هەر هۆزێک چوونە ناو هاوپەیمانی موسڵمانان، باموسڵمانیش نەبێت موسڵمانان لەکاتی دەستدرێژی کردنە سەریان بەرگریان لێ دەکەن و وەکو خۆیان دەیانپارێزن، هەروەها بۆ قورەیشیش هەمان کردارە و هاوپەیمانی تەواوەتین و بەچاوی موسڵمان و قورەیش سەیردەکرێن، داخۆ ئەم بەندە لە بەرژەوەندی کێ بێت قورەیش یان موسڵمانان؟

لەکاتێکدا قورەیش گەورەترین هۆزی عەرەبە، ئەوەی کەدەیەوێت کە هاوپەیمانی هەبێت لە ڕاستیدا موسڵمانانن، ئەوەشی بڕواتە ناو هاوپەیمانی موسڵمانانن، بەدڵنیاییەوە لە قورەیش دەترسێت لە زوڵم و زۆری و هێزی، کەچی وا ئێستا خۆی دان بەوە دەنێت و هانی هۆز و عەشیرەتەکان دەدات کە بڕۆنە هاوپەیمانی موسڵمانان.

لەڕاستیدا ئەم بەندە هیچ سوودێکی بۆ قورەیش نەبوو، بەڵکو سوودی تەواوی بۆ موسڵمانان هەبوو، ئەوەش هاندانێکی زۆر گەورەیە بۆ هاتنە ناوەوەی ئەو هۆزانەی لە نزیک شاری مەدینەن بۆ ئایینی ئیسلام پێشتر لە قورەیش دەترسان، ئەمەش ١٠٠٪ لە سوودی موسڵمانان بوو بە بەڵگەی ئەوەی، هەرگیز خوزاعە بیری نەکردبۆوە بڕواتە ناو هاوپەیمانی موسڵمانان، تەنها لە دوای ئەم سوڵحە نەبێت، تا ئەوەندە نزیک بوونەوە خوزاعە لە موسڵمانان لەناو عەرەبدا پێی دەوترا ئەو هۆزەی کە جێگای نهێنی و پارێزەری نهێنی موسڵمانان و پێغەمبەری خوایە ﷺ چونکە هەمیشە جێگای متمانەی پێغەمبەر ﷺ بوون زۆر بەدڵسۆزانە بۆ ئیسلام کاریان کردووە.

لەکاتێکدا خوزاعە لەمەکەوە نزیکە چووە ناو هاوپەیمانی موسڵمانان، ئەی چی دەڵێیت لەکاتێک هۆزەکانی تری نزیک شاری مەدینە و سنووری دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ لەداهاتووشدا هەر ئەم بەندە دەبێتە هۆکاری فەتح کردنی شاری مەککە!

بەندی چوارەم: هەرکەس لە قورەیش کە لەگەڵ محەممەد ﷺ دایە ڕایکرد لە دەستی محەممەد واتا هەڵگەڕایەوە و وازی لە دینەکەی هێنا، ئەوا قورەیش دەیپارێزێت و ناگەڕێنرێتەوە، بە پێچەوانەوە هەرکەس لە قوورەیش موسڵمان بوو چوو بۆ لای محەممەد ئەگەر کەسوکاری وەلی ئەمرەکەی ڕازی نەبوون دەبێت ڕادەستی قورەیش بکرێتەوە.

لەشیکاری بەشی یەکەمی بەندەکەدا ئەوەی لە ڕیزی موسڵمانان ڕادەکات کافر دەبێتەوە، دەڕواتە ناو قورەیش دەپارێزرێت.

پرسیار ئەوەیە ئایا ئەوەی لەناو موسڵمانان ڕادەکات موسڵمانان پێویستیان پێیەتی؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر، خۆ پابەندی ناکەن کە لەم دینەدا بمێنێتەوە لەڕاستی موسڵمانان هیچ



پێویستیان بەو جۆرە خەڵکانە نییە، هیچ کات ئەو حاڵەتەش ڕووینەداوە ئەوەی کافر بوو بگەڕێتەوە موسڵمان خۆشحاڵ دەبن وەکو دەڵێن مونافیقێک کەمتر دەبێتەوە، ئەم بەندە ڕێگا بەوانە ئەدات کە لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی و نیفاق و گومان هەیە، بگەڕێنەوە بۆلای قوڕەیش زۆر باشترە.

چونکە لەناو موسڵماناندا بن ڕیزی موسڵمانانیش دەشێوێنن، خوای گەورەش لەباسی مونافیق لە ڕیزی موسڵماناندا لە سورەتی التوبة دەفەرمووێت:

﴿لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [التوبة]

واتە: ئەوانە ئەگەر دەرچوونایە و لەناوتاندا بوونایە هیچیان بۆ ئێوە زیاد نەدەکرد بێجگە لە سستی نەبێت (لە ئاشووب و گێرە شێوێنی زیاتریان لە دەست نەدەهات) و دەستیان دەکرد بە چرپ و چاپ لەناوتاندا و دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی کەلێنێک بەئاواتی ئاشووب هەڵگیرساندن لە نێوانتاندا، کەسانێکیش هەن لەنێو ئێوەدا گوێیان بۆ دەگرن، خوایش چاک ئاگادارە بە کاروکردەوەی ستەمکاران.

هەروەها ئەگەر ئەم جۆرانە لەناو موسڵمانان دا بن هەواڵ و نهێنی موسڵمانان دەیگەیننە دوژمن، باشترە بگەڕێنەوە بۆلای کافرەکان.

بەشی یەکەم بەتەواوەتی لەبەرژەوەندی موسڵماناندایە، بەڵام بەشی دووەم زۆر نەرێنییە و لەبەرژەوەندی تەواوی کافرەکانی شاری مەککە دایە چونکە هەر کەس موسڵمان بوو چوونە ناو موسڵمانان لە خەڵکی مەککە دەگەڕێنرێنەوە بۆ شاری مەککە و فشاری دەخەنە سەر بۆ پەشیمان بوونەوە و یاخود ئازار و ئەشکەنجەی ئەدەن تا پەشیمان ئەبێتەوە.

ئەمەش زۆر خراپ بوو بۆ موسڵمانان لە بەرژەوەندی تەواوی قوڕەیش دا بوو کەواتە هەشت یەکی سوڵحەکە یاخود ٨٠٪ ئەم پەیماننامەیە لەبەرژەوەندی موسڵمانان دا بوو لە ٢٠٪ لەبەرژ ـەندی قوڕەیش دا بوو.

هەرچەندە گەورەترین سوود و قازانج لەبەندی کۆتایی بەشی دووەمدایە، جا لەکۆتایی زۆر بەجوانی دەردەکەوێت، بەڵام نامەوێت پێش ڕووداوەکان بکەوم، لەڕاستیدا ئەوەی لەشاری مەککە موسڵمان دەبێت هیجرەت ناکەن بەڵکو دەمێننەوە و زیاتر بانگەوازی ئیسلامی دەکەن و هەواڵ و زانیاری موشریکەکان بۆ موسڵمانان دەگوازنەوە.



هەروەکو وتم باشترین بەند لەم سوڵحەدا ئەم بەندەی کۆتاییە، بەڵام موسڵمانان لەوکاتەدا هیچ هەستیان پێ نەکرد، تەنها بیرکردنەوەی قوڵی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِۦوَسَلَّمَ بوو کەزۆر بەباشی درکی بەم بەندانە کرد و لەسەر هەمووی ڕازی بوو، لەدوای ئەوەی گفتوگۆ بەدەمی لە نێوان پێغەمبەر و سوهەیل کۆتایی هات پێویستە ئەم چواربەندە بخرێتە سەر کاغەز و وەکو دیکۆمێنت بمێنێتەوە، پاشان پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِۦوَسَلَّمَ و سوهەیل دانیشتن بۆ نووسینەوە و ئیمزاکردنی ئەم سوڵح و پەیماننامەیە.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِۦوَسَلَّمَ توانای نووسین و خوێندنەوەی نییە، ئەوەی ئەم کارە ئەنجام ئەدات، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبە، ئەمەش مانای وایە دەستی بەهێز و گەورەی موسڵمانان ئەوان دەینووسنەوە.



# نووسینەوەی پەیماننامەکە

ڕاغیب: پێغەمبەری خوا بە عەلی کوڕی ئەبو تالّبی وت بنووسە لەسەرەتادا (بسم الله الرحمن الرحيم) چونکە ئەمە سەرەتای هەموو کاری موسڵمانانە، لەو کاتەدا سوهەیل ناڕازی بوو وتی تێبینیم هەیە، تێبینییەکەی زۆر لاوەکی بوو وتی: (رحمن) ناناسین؟ سوێند بەخوا نازانین چییە؟ بنووسن (باسمک اللّهم) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە عەلی بنووسە (باسمک اللّهم) چونکە هیچ شتێکی پێچەوانەی شەرع نییە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم سوڵحە لەنێوان محەمەد پێغەمبەری خوا ﷺ، قسەکەی تەواو نەکرد سوهەیل ڕەخنەی تری هەبوو وتی: ئەگەر بزانین تۆ پێغەمبەری بۆ ڕێگریمان دەکردی و جەنگمان لەگەڵ دەکردی؟! بەڵکو بنووسە محەمەد کوڕی عبدوڵلا، چونکە قورەیش دانی نەنابوو بە پێغەمبەرایەتی محەمەد، بۆیە سوهەیل ناتوانێت لەجیاتی قورەیش ئەو ئیعترافە بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەئاسایی وەریگرت، فەرمووی: ئەگەر ئێوە من بەدرۆ دەخەنەوە بەڵام من هەر پێغەمبەری خوام.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە عەلی (رسول الله) بکوژێنێتەوە و بنووسێ محەمەدی کوڕی عبدوڵلا، عەلی برازای نەیتوانی (رسول الله) بکوژێنیتەوە، وتی من کاری وا ناکەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دەستم بخە سەر وشەکە با خۆم بیکوژێنمەوە، ئاماژەی بۆ کرد و پێغەمبەر ﷺ بە پەنجەی موبارەکی کوژاندییەوە.

سوهەیل زۆر لەکارە لاوەکییەکان وەستا بۆ ئەوەی هەرچی کردووە قورەیش ڕازی بکات، ڕەخنەکانی دووربوو لە جەوهەری سوڵحەکە بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بەقسەی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی ئەو پەیماننامەیە زۆر گەورەیە و لەبەرژەوەندی موسڵمانانە کە هەرگیز خەونیشیان پێوە نەبینیووە، ئێستا وا بەئاسانی دەستیان کەوتووە دەیویست جەنابیان بەهەرشێوەیەک بووە ئەم سوڵحە تەواو بێت و بەکۆتایی بگات.

لە ڕاستی هەموو داواکاری موسڵمانان لەو کاتەدا ئەوەبوو کە بڕۆنە ناو خاکی مەککە و مزگەوتی حەرەم عومرە بەجێ بهێنن، بەڵام ئەمە ڕووی نەدا و هەموو گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە.

لەم پەیماننامەیەدا دوو وانەی زۆر گرنگ لێوە فێر دەبین، ئەویش پەیوەندی هەیە بەسەرکردە و جەماوەر و شوورا و ناڕەزایی.



وانەی یەکەم: ڕاستە پێغەمبەری خوا ﷺ وەحی بۆ دێت و لەدوای ئەو وەحی بوونی نییە و پەیمانی حودەیبییە وەحی بووە، بۆیە بەقسەی هیچ هاوەڵانی نەکرد و شوورا و ڕاوێژی پێنەکردن.

بەڵام لەدونیای ئەمڕۆدا دەبێت قیاداتی ئیسلامی دانەبەزن بۆ ڕای زۆرینە و فشاری جەماوەر ئەگەر زانیاری هەبوو لەسەر کارێکی چاک و باش بۆ بانگەوازی ئیسلامی، ئەگەر چی زۆرینەی جەماوەر لەگەڵیدا نەبوو، بەڵام بەهۆکارێک زانیاری هەواڵ کە دەگاتە قیادات دەبێت خوا ڕازی بکەن نەک جەماوەر و خەڵک، خەڵک و جەماوەر هەرگیز ڕازی نابن، بەڵام کە خوای گەورە ڕازی کرد بەدڵنیاییەوە خوای گەورە هەموو خەڵکت بۆ ڕازی دەکات.

جیاوازی زۆر گەورە لەم سەردەمی نوێیە پەیدابووە کە قیاداتی ئیسلامی شوێن جەماوەر دەکەون وەکو شوێنی بەرژەوەندی گشتی بانگەوازی ئیسلامی بکەون.

وانەی دووەم: توڕە نەبوونی و هێمنکردنەوەی جەماوەر لەکاتی پرسیار کردن و تووڕەبوونیاندا، یاخود دەوترێت کە لەئێستادا لەبەر چەند هۆکارێکی ئەمنی ناتوانین ڕوونکردنەوە بدەین، بەڵام لەداهاتووی نزیکدا بەدڵنیاییەوە شیکاری تەواو دەدرێت لەسەر ڕووداوەکە.

ئەگەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەمووی ئەمانەی کردوومە وەحی بووە، لەگەڵ ئەوەی کە هاوەڵان زۆر توڕە بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەسادە و هێمن وەریگرت و بەڵکو هەموو موسڵمانانی هێور کردەوە.

لەئێستادا پێویستمان بەو سوننەتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە، کە شتە لاوەکییەکان بە قورسی ناگرێت و زوو لە شتەکان تێدەگات، ئەوەی کە کاریگەری نییە لەسەر بانگەوازەکە و لەسەر ئوممەت ئاسانکاری تێدا دەکات.

دەست ناگرێت بەشتێکەوە کە هیچ کاریگەری نییە، ئەم سوڵحە ئەمەمان بۆ دەردەخات کە پرەنسیپی پەیماننامە و سوڵح چۆن دەکرێت و مەرج و میحوەرەکانی چۆن دابنێین و لێکبدەینەوە.

چونکە پێغەمبەر ﷺ هیچ قەرارێکی باتڵی نەدایە موشریکەکان، نە خاکی پێ بەخشین و نە وتی خۆمان چەکدار ناکەین و تەنازول لە چەکەکانمان دەکەین و بڕیارن لەسەر ئەوە نەدا کە هاوپەیمان و گرێبەست لەگەڵ کەسدا ناکەین، ئەوانەی کە نەگۆڕ بوون لە ئیسلامدا گۆڕانکاری تێدانەکرد.



بڕیاری ئەوەیان نەدا کە هەر جەنگ ناکەن بەڵکو بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بوو لەهەمانکاتدا نەوترا کە قورەیش و موشریکەکان هاوڕێ و دڵسۆز و برامانن.

بەڵکو دوژمنایەتی هەر بەردەوامە و تەنها ١٠ ساڵ پشوو ئەدرێت، بەڵام دەکرێت دوای ئەو ١٠ ساڵە دانوستان لەسەر کاری تر و بڕیاری تر بدرێت یان ماددەکە درێژ دەکرێتەوە، یاخود ماددەکە تا ئەو کاتەیە و موسڵمانان داوای حەقی خۆیان دەکەنەوە، ئەمەش بڕیار لەوە نەدراوە بەئاشتی هەتاهەتایی، پاشان هیچ بەندێک لە بەندەکان وەکو وشەی چەند مانا بەکار نەهات کە دوایی تەفسیری زیاتر هەڵبگرێت و وەکو لاستیک هەرکەس بەئارەزووی و بۆ بەرژەوەندی خۆی خۆی ڕایبکێشێت، هەموو بەند و مافەکان ڕوون و ئاشکرا تێیدا بەجوانی و دیاری کراوە.

لەهەمووی گرنگتر ئەم پەیماننامەیە و سوڵحە ئەگەر موسڵمانان هێز و توانایان نەبێت ناتوانن ڕەتی سەرپێچی دوژمن بدەنەوە، چونکە ئەگەر موسڵمانان هێز و توانایان نەبوو سوڵح و پەیماننامە و دانوستان هیچ مانایەکی نییە، ئەگەر هاتوو قورەیش پەیماننامەکەی پیادە نەکرد موسڵمانان خاوەن هێزن وەڵامیان ئەدەنەوە، خۆ موسڵمانان ناڕۆن بۆلای ڕۆم و فارس سکاڵا بکەن، بەڵکو خۆیان خاوەن چەک و توانا و بەرگری خۆیان بەهێزی خۆیان دەپارێزن.

بەداخەوە لەئێستادا مافی موسڵمانان دەخورێت، دەڕۆن بۆلای نەتەوە یەکگرتووەکان سکاڵا دەکەن!

بەهەرحاڵ لێرەدا موسڵمانان خاوەن هێز و چەک و توانان دەتوانن سوڵح و ئاشتی بپارێزن.

ماکوان: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە ئەو پەیماننامەیە زۆر جیاوازە، ئەگەر پێوانەی بکەین بە سوڵح و پەیماننامەکانی ئەمڕۆی موسڵمانان و بێباوەڕان، زۆر جیاوازی گەورەن و لەباسکردن نایەن.

هەرگیز ناتوانین پێوەری بکەین بە (کامپ دەیڤید) و (پەیماننامەی ئۆسلۆ) پەیماننامەی (نەخشە ڕێگا، خارطة الطريق) لە نێوانی موسڵمانان و جوولەکەدا یاخود (سایکس بیکۆ) و (لۆزان)، ئەتاتورکی گۆڕبەگۆڕ و جەمال عەبدولناسر و لال نەهرۆ و عەلمانییەکانی هاوشێوەیان لە بوورقیبە و بوو عەلی و مەلیک عەبدوڵڵای ئەردن و سیسی...هتد.

لەڕاستیدا سوڵحی حودەیبییە، ڕێک لە کامپ دیڤد و هەموو پەیماننامەکانی تری ئەمڕۆ دەچێت, بەڵام بە پێچەوانەوە لەدژی موسڵمانان و موسڵمانانە تێیدا زەلیلن.



# ڕاهێنان لەسەر کارنەکردن لەسەر هەست و سۆز

ڕاغیب: لەیەکێک لە وانە گەورەکانی پەیمانی حودەیبییە ڕاهێنانە لەسەر کارنەکردن بەهەست و سۆز و نەشکاندنی وەعد و پەیمان، لەدوای ئەوەی موسڵمان و پێغەمبەری خوا ﷺ کۆتاییان بە سوڵح و پەیماننامەکە هێنا و لەسەر هەموو بەند و خاڵەکان ڕێکەوتن ئینجا تاقیکردنەوەی خوای گەورە دەستی پێ کرد، لەناو عەرەبدا باو بووە کە دواتر ئەگەر ڕێز و ئیحترام لەوشە و گفتی خۆت ناگریت مەینووسە، یاخود وشە و گفتێک کە جێگای ڕێزە بۆ نووسین باشە.

لەدوای تەواو بوونی سوهەیلی کوڕی عەمر لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەو جێگایەدا کوڕەکەی سوهەیل بەناوی ئەبو جەندەل بە زنجیر و خوێن هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە زیندانەکە هەڵهات و هاتە ناو موسڵمانان ڕای کردبوو لەدەستی موشریکەکان بەو ئومێدەی کە موسڵمانان بیپارێزن.

بەدەم هاوارکردنەوە هات و دەیوت ڕزگارم بوو لەدەستی کافر و موشریکەکان کە سوهەیل بینی ئەبو جەندەلی کوڕیەتی خێرا هەڵسا و وتی: ئەی محەمەد ئەوەی لەنێوانماندا هەبوو بڕیاری لەسەردراوە بەشاهێدی موسڵمانان و خەڵکی مەککە، موسڵمانان ئەوانەی کە شاهێد بوون (ئەبو بەکر و عومەر و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بوو) کۆمەڵێکی تر لە موسڵمانان لە موشریکەکان، (سوهەیل و میکرزەی کوڕی حەفس).

پاشان سوهەیل وتی: گفتوگۆ و لێدوان و موناقەشە کۆتایی هاتووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ڕاستدەکەیت).

سوهەیل مەبەستی بوو کە ئەبوجەندەلی کوڕی لەگەڵ خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ شاری مەککە، چونکە لە پەیماننامەکەدا هاتووە.

کە ئەبو جەندەل گوێی لەقسەکانی باوکی بوو، وتی ئەی گرۆی موسڵمانان ئێوە ڕادەستی موشریکەکانم دەکەنەوە بۆ ئەوەی لە دینەکەم پەشیمانم بکەنەوە تووشی فیتنەم بکەن؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد لە سوهەیل کە ئەم جارە ئەبو جەندەل لەناو سوڵحەکەدا هەژمار نەکات و ئەبوجەندەل ببەخشە بەمن.

سوهەیل ڕازی نەبوو، ناچار پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوجەندەلی گەڕاندەوە بۆلای باوکی و ڕادەستی کردەوە، چووە لای ئەبو جەندەل و فەرمووی: ئەی ئەبو جەندەل ئێمە



لەگەڵ قوڕەیش وەعد و پەیمان و سوڵحمان کردووە، ئێمە و ئەوان پەیمانمان داوە لەسەر ئەم سوڵحە من ناتوانم وەعد و پەیمان شکێنی بکەم، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی دایە ئەبو جەندەل کە بەنزیکترین کات خوای پەروەردگار کارەکانی بۆ ئاسان دەکات بەو مەرجەی ئارامگر و خۆڕاگربن.

مژدەکە تەنها بۆ ئەبوجەندەل نەبوو بەڵکو بۆ هەموو موسڵمانە لاوازەکانی شاری مەککە بوو کە توانای هیجرەتیان نەبوو، خوای گەورە لە سوورەتی الطلاق دا دەفەرموویێت:

﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ۝ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ۝﴾ [الطلاق]

واتە: کاتێک گەیشتنە ماوەی دیاریکراووی خۆیان (دوای یەک، یان ئەو دوو تەڵاقەی خواردوویانە) ئینجا یان بیانهێڵنەوە لای خۆتان هاوڕێ لەگەڵ ڕەفتار و هەڵسووکەوتی چاک دا یاخود وازیان لێ بهێنن و لێیان جیاببنەوە، (لە سێیەم جاردا کە تەڵاقتان خوارد) بە شێوەیەکی جوان کە مافیان پارێزراو بێت لەکاتی جیابوونەوەی یەکجاریدا با دوو شایەتی دادپەروەرو خواناس لە خۆتان لەنێوانتاندا هەبێت و ئامادەی شایەتی بن و بپارێزن بۆ خوا و لەبەر خوا، بەوەی کە باسکرا ئامۆژگاری دەکرێت ئەو کەسەی کە باوەڕ بەخوا و بە ڕۆژی دوایی دەهێنێت، جا ئەوەی لەخوا بترسێت و پارێزکار بێت، ئەوە خوا دەرووی لێدەکاتەوە.

لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێدەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و خۆی پێی نازانێت، جا ئەوەی پشت بەخوا ببەستێت ئەو زاتەی بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی خوا کار و فەرمانی خۆی بەڕاستی ئەنجام دەگەیەنێت، بێگومان خوا بۆ هەموو شتێک نەخشەیەکی دیاریکراوی بڕیار داوە (کە دەبێت پەیڕەوی بکرێت).

هاوەڵان یەکجار توڕەبوون، تەنانەت عومەری کوڕی خەتاب، شمشێرەکەی نزیک کردەوە بۆ ئەبو جەندەل بەهێواشی پێی وت ئەو سەگە بکوژە؟!

بەڵام ئەبوجەندەل ئەو کارەی نەکرد.

لەڕاستیدا وانەیەکی زۆر سەخت و گران بوو بۆ هاوەڵان تەنانەت هەندێکیان دەستیان کرد بە گریان بۆ ئەبوجەندەل کە باوکی ڕایکێشاوە بەخوێن و زنجیرەکەی کەپێی بەسترابوویەوە.



زۆر دڵ پڕبوون کە لەبەرچاویاندا براکەیان کە لەسەر تەوحید و بیروباوەڕی پاک ئازار ئەدرێت و باوکە موشریکەکەی بەوشێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دەکات.

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەری خوا ﷺ وانەیەکی فێرکردن کە دەبێت خاوەن گفت و قسە و وەعد و پەیمان بن، موسڵمانان نابێت غەدر و خیانەت بکەن، هەرگیز کار بە عاتیفە و هەست و سۆزیان نەکەن.

بەڵام بەدڵنیاییەوە هەموو ئەو وشانە ئەبەرژەوەندی موسڵمانانە، موسڵمانان خوایان هەیە تەرەفی بەرامبەر کێیان هەیە لات و عوزا؟! بەیەقینەوە خوای موتەعال تەرەفی خۆی سەردەخات.

پێغەمبەری خوا و ڕاوبۆچوونی ئۆپۆزسیۆن

ڕاغیب: لەدوای ڕووداوەکانی حودەیبییە و بەتایبەت ئەبوجەندەل، لەناو موسڵمانان دەنگی ناڕەزایی بەرزبوویەوە، بەتایبەت لەسەر ئەو خاڵ و بەندەی کە موسڵمانان ڕادەستی کافران بکرێنەوە.

پاشان دەنگی ناڕەزایی تر زۆر بڵاو بووەوە لەسەر ئەوەی کە ئەم ساڵ ناڕۆنە ناو شاری مەککە و ساڵی داهاتووە.

لەو دەنگە ناڕەزاییانە کە زۆر سەخت گیر بوو عومەری کوڕی خەتاب و ئوسەیدی کوڕی حوقەیری و سەعدی کوڕی عوبادەی خەزرەجی، تەنانەت عومەر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ڕاو بۆچوونی خۆی بەو پەڕی ڕاشکاو و ئاشکرایانە دەربڕی و زۆر بە توندی قسەی کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەگەر تۆ پێغەمبەر نیت؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، من پێغەمبەرم.

عومەر: مەگەر ئێمەش ئیماندار و موسڵمان نین؟!

پێغەمبەر: بەدڵنیاییەوە ئیماندار و موسڵمانن.

عومەر: مەگەر ئەوان موشریک و کافر نین؟!

پێغەمبەر: بەڵێ موشریک و کافرن

عومەر: ئەی بۆچی ئاوا زەلیل و سەرشۆڕین و ئەوانەی ئەوان دەیانەوێت پێیان دەبەخشین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عومەر من پێغەمبەری خوام ناتوانم سەرپێچی فەرمانی خوا بکەم (فەرمانەکە وەحییە).



عومەر: ئەی جەنابت نەتفەرموو دەڕۆینە ناو شاری مەککە؟!

پێغەمبەر: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە وتم دەچینە ناو شاری مەککە، بەڵام خۆ نەم وت ئەم ساڵ (واتە کات دیاری نەکراوە).

عومەر: ڕاستە نەتفەرموو ئەم ساڵ.

پێغەمەبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: دڵنیابە عومەر دەڕۆینە ناوی و تەواف دەکەین و هەموو درووشمەکانیش جێبەجێ دەکەین.

پاشان عومەر بەدوای ڕێگا چارەی تردا دەگەڕێت، ئەم پەیماننامەیە هەڵبوەشێنێتەوە، چووە لای ئەبو بەکر و هەمان حوججە و وتار و گۆی بەکار هێنا، ئەبو بەکری صدیق ئامۆژگاری کرد کەواز بهێنێت لە نارەزایی و ئۆپۆزسیۆنی، فەرمووی من شاهێدی ئەدەم کە پێغەمبەر نێردراوی خوایە، ئەوەی کە فەرمانی پێکراوە حەققە و دەبێت بەجێی بهێنێت، سەرپێچی لە فەرمانی خوا ناکات و خوای گەورە ئەویش زایە ناکات.

عومەر هەر وازی نەهێنا، تا چووە لای زۆرێک لەهاوەڵان، بەڵام لەکۆتاییدا ئارامیگرت و ئەبوجەندەل زۆر کاریگەری لەسەر دانابوو.

پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم زۆر بە ئارامی و هێمنی وەڵامی بەرهەڵستیکارەکانی داوە ڕێزی ڕای جیاوازی گرت و نەیفەرموو من سەرۆکی دەوڵەتم ئەوەی نارازی بێت زیندانی بکرێت یان لە حیزبەکەی دەری بکات، بەڵکو وانەی ئەوەی فێرکردین کە دەکرێت و دەبێت هەمیشە ڕای جیاواز هەبێت، دەشێت ڕێز و حورمەت لە ڕای جیاواز بگیرێت.

پێغەمبەری خوا خاوەنی بەڵگەی بەهێز بوو توانای هەبوو نارازییەکان ڕازی بکات بە بەڵگە و دەلیلی بەهێز، دوور لەچاو زەقکردنەوە، هەرکەسە لە ئەمان و ئاسایشدا هەموو ڕاووبۆچونی خۆیان دەوت و بێ ئەوەی تووشی هیچ زەرەر و زیانێک بن.



# شوورا تایبەت نییە بە پیاوان

ڕاغیب: لەدوای کۆتایی هاتنی نووسینی پەیماننامەکە و هێوربوونەوەی ڕەوشەکە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سێ جار بەهاوەڵانی فەرموو قوربانییەکانتان بکەن و سەرتاشین بکەن، ئەوەندە توڕەبوون یەک هاوەڵ هەڵنەسا، پاشان گەڕاوە لای خێزانی و ڕاوێژی بە ئوم سەلەمەی خێزانی کرد، کە خەڵکەکە بەقسەی ناکەن! ئوم سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ حەزدەکەیت بەقسەت بکەن بەکەسیان مەڵێ خۆت قوربانییەکەت بکە و قژت کورت بکەرەوە، ئیتر ئەوانیش هەموو بەدواتا ئەنجامی ئەدەن.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵسا قوربانییەکەی کرد و قژی کورت کردەوە، ئەوانیش هەموو هەڵسان و چاویان لە پێشەنگ و قودوەکەیان کرد و کارەکەیان ئەنجام دا.

بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەری هەموو تاشی و فەرمووی ڕەحمەت لەوەی کە سەری هەموو ئەتاشێت، وتیان ئەی کورتی بکەینەوە؟ سێ جار ڕەحمەتی نارد بۆ ئەوانەی کە هەموو سەریان ئەتاشن وەکو دەڵێن (سفری دەکەن)، لە کۆتایی وتی ڕەحمەتیش بۆ ئەوانەی کورتی دەکەنەوە، هاوەڵان ئەوەندە بەتوڕەییەوە سەری یەکیان ئەتاشی خەریک بوو ملی یەکتریان هەڵدەکەند.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە حودەیبییە وشترەکەی ئەبوجەهلی سەربڕی، یەکێک بوو لەوشترە جوانەکانی عەرەب، ڕەنگی سوور بوو زۆر بەرز و گەورە بوو، لەو ناوچەیەدا تاجێکی زیوی لەسەر کرابوو، بۆ بوغزاندنی قوڕەیش وشترەکەی لەوێدا سەربڕی.

لەکۆتاییدا هەموو عومرەکەیان بۆ نووسرا, گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، ئەم سوڵحە ئەوەندە وانە و پەند و عیبرەتی تێدایە کە لێکۆڵەرەوان دەتوانن بە بەرگی زۆر گەورە کتێبی لەسەر بنووسن، هەموو گەشتەکە ٢٠ ڕۆژ بۆ مانگێکی پێچوو، ئەوەندە ئەحکام و یاسا و ڕێسای لەخۆ گرتووە بەشی چەندین بەرگ کتێب دەکات بۆ نووسین.



# گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە و چارەسەر

ڕاغیب: لەنێوان مەککە و مەدینەدا خوای گەورە مژدەی گەورەترین فەتحی پێبەخشین، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی خۆشەویسترین شەو و ڕۆژ بوو کە ڕۆژی نوێ هەڵهات و ئەو ڕۆژ و شەوە بوو کە سوورەتی فەتح تێیدا دابەزی.

هەر یەکەم ئایەتی دابەزی چارەسەری هەموو خەم و غەمگینی هاوەڵانی کرد.

﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١﴾ [الفتح]

ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت (مەبەست ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەیە کە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و قورەیشدا مۆرکرا، بەندەکانی ئەو پەیمانە لە ڕواڵەتدا زەرەری ئیمانداران بوو، بەڵام هەر هەمووی گەڕا بەخێر و سەربەرزیی بۆیان).

پاشان هاوەڵان پیرۆزباییان لەیەکتری کرد و وتیان (هنيئا مريئاً).

لەدواییدا سەکینەت و دڵ ئارامی بەسەریاندا دابەزی هەموو موسڵمانان ئاسوودەبوون.

﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ۝٤﴾ [الفتح]

واتە: هەر ئەو خوایە خۆی ئارامیی و هێمنی دابەزاندۆتە سەر دڵی ئیمانداران، بۆ ئەوەی کە ئیمانیان دامەزراوتر و پتەوتر بکات، سەرەڕای ئیمانداری و خواناسییان، بێگومان هەرچی سەربازانی ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەر خوا خۆی خاوەنیانە، هەمیشە و بەردەوام خۆی گەورە زانایە بە هەموو شتێك و دانایە لە هەموو کارێکدا.

لە دواییدا ئیمتاز و خۆشەویستی و دڵخۆشبوون و ڕازی بوونی هاوەڵان لەلایەن خوای گەورە ئایەتی لەسەر دابەزی:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ۝١٠﴾ [الفتح]

واتە: ئەوانەی پەیمان دەدەن بە تۆ (ئەی محەمەد ﷺ) لە ڕاستیدا پەیمانیان بە خوا خۆی داوە, دەستی پیرۆز و بەتوانای خوا لەسەر دەستیانەوەیە (بە پشتگیری و یارمەتی)



جا ئەوەی پەیمانەکە بشکێنێ و لێی پاشگەز بێتەوە، ئەوە لەسەر خۆی دەکەوێت، ئەوەش کە پەیمانەکە دەباتە سەرو پاشگەز نابێتەوە لێی، خوای باڵادەست ئەجرو پاداشتی گەورەی پێدەبەخشێت.

مژدەی چوونە بەهەشت درا بەهاوەڵان:

﴿لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾﴾ [الفتح]

واتە: (ئەمەش هەمووی بۆ ئەوەی) تا ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان بخاتە ناو بەهەشتانێکەوە کە جۆگەو ڕووبارو بە ژێر درەخت و بەبەردەم کۆشك و تەلارەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەمریدا، هەروەها بۆ ئەوەی کە چاوپۆشی لە هەڵە و گوناحەکانیان بکات، ئەم بەڵێنە لەلایەن خواوە دەستکەوت و سەرفرازییەکی زۆر گەورە و بێ سنوورە.

لەسەرووی هەموویەوە خەونەکەی پێغەمبەر ﷺ بەوەحی هەژمار کراو خوای گەورە هەموو فەرمانی ئەو سوڵحەی گەڕاندەوە بۆلای خۆی:

﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾﴾ [الفتح]

واتە: بێگومان خوا خەونی پێغەمبەرەکەی بەڕاستیی و وەك خۆی هێناوەتەدی کە دەفەرمووێت: بەم زوانە ئێوە بە هەموو ئاارامیی و ئاسوودەییەکەوە بەویستی خوا دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە، (عەمرە بەجێدێنن) سەرتان دەتاشن یا کورت دەکەنەوە بێئەوەی ترس و بیمتان لە کەس هەبێت، جا ئەوەی ئێوە نایزانن خوا دەیزانێت، کە جگە لە سەرکەوتنی (مککە) سەرکەوتنێکی نزیکی (کە گرتنی خەیبەرە) بۆ بڕیار داون و پێتان دەبەخشێت.

لەکۆتاییدا خوای گەورە وەها پێناسەی ئیماندارانی کرد:



﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ۝ مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ۝﴾ [الفتح]

**واتە: هەر پەروەردگاری مەزنە کە پێغەمبەری خۆی ڕەوانەکردووە بۆ گەیاندنی هیدایەت و ڕێنموونی و پەیامی ڕاست و درووست تا سەری بخات بەسەر هەموو پەیام و بەرنامەیەکی تردا، خوا خۆیشی بەسە بۆ شایەتیدان و ئاشکراکردنی ئەو ڕاستییە. محەمەد ﷺ ڕەوانە کراوی خوایە، ئەوانەش کە لە خزمەتیان و (شوێنی کەوتوون) ئازا و بەهێزن بەسەر بێ باوەڕاندا، وە بەبەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا، دەیانبینی سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین، کڕنووش و سوجدە دەبەن (بۆ خوای پەروەردگار)، هەردەم ئاواتیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی و پایەبەرزییە لەلای ئەو زاتە، نیشانەی چاکیی و پاکیيان لە ناوچەونیاندا دیارە و دەدرەوشێتەوە لە ئەنجامی سوجدە بردن و خوا پەرستییانەوە لە تەوراتدا، نموونەیان لە ئینجیلیشدا وەك ڕووەکێك وایە کە لە سەرەتاوە چەکەرە دەکات و سەردەرهێنێت، دوای ئەوە چەکەرەکە بەهێزو ئەستوور ببێت، قەدەکەی خۆ بگرێت و ڕابوەستێت، ئەوەندە زوو پێ بگات کشتکارەکان پێی سەرسام بن و پێیان سەیر بێت: (چۆن وا پێ گەیی؟! چۆن ئاوا خۆی گرت؟! هەر بەو گەشەکردنە خوای گەورە کافران داخ لەدڵ دەکات، جا خوای (بەدەسەڵات) بەڵێنی بە باوەڕدارانی کردەوە چاك لەوان داوە: کە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە و بێ سنووریان پێببەخشێت.**



ڕاغیب:- لەدوای سوڵحی حودەیبییە ڕاستەوخۆ بەچەند ڕۆژێک کەسێک موسڵمان بوو بەناوی (ئەبو بەسیر عوتبەی کوڕی ئوسەید) توانی لە زیندان لەدەستی موشریکەکانی قوڕەیش هەڵبێت لەشاری مەککە و خۆی بگەیێنێتە شاری مەدینەی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ، قوڕەیش دوو کەسی نارد بۆ گەڕانەوەی ئەبو بەسیر بۆ شاری مەککە لەسەر بنەمای عەهد و پەیماننامە و سوڵحەکەی کە لەنێوانیاندایە، داوایان کرد کە ئەبو بەسیر بگەڕێننەوە بۆ شاری مەککە، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بانگی ئەبو بەسیری کرد پێی فەرموو: ئەی ئەبو بەسیر، ئێمە و قوڕەیش پەیماننامە و عەهدمان کردووە کە کەس وەرنەگرین لە موسڵمانانی مەککە، خۆشت باش دەزانی کە دینەکەمان غەدر و شکاندنی وەفا و پەیمانی قبوڵ نییە، بەڵام دڵنیابە خوای گەورە بۆ تۆ و هەموو موسڵمانە لاوازەکانی مەککە دەرگای خێرتان لێ دەکاتەوە، بگەڕێوە بۆلای هۆزەکەت.

ئەبو بەسیر وتی یا رسول الله، ئەتانەوێت موشریکەکان هەڵمان بگەڕێننەوە لە دینەکەمان؟!
پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆی دووبارە کردەوە وتی: ئەبو بەسیر بگەڕێوە بۆ لای هۆزەکەت, خوای گەورە دەرگای خێر لەتۆ و لە موسڵمانە لاوازەکانی شاری مەککە دەکاتەوە.

ئەمجارەش زۆر قورس بوو بۆ موسڵمانان، بەڵام چار نەبوو براکەیان خاوەن عەقیدەی پاک و خواناس ڕادەستی کافرەکان بکرێتەوە، بگەڕێتەوە بۆ زیندانی ملهوڕ و کافر و موشریکەکان.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ پابەند بوو بە پەیماننامەکە چونکە ئەوە کردارێکی سلووکی و ئاکاری بەرزی موسڵمانانە، پەیوەندی هەیە بە پەیوەندییەکانی دەوڵەت و یاسای نێودەوڵەتی، خوای گەورەش هۆشداری داوە لەسەر پەشیمان بوونەوەی پەیمان و عەهد و سوێند خواردن، خوای گەورە لە سوورەتی النحل دا دەفەرمووێت:

﴿وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٩١﴾﴾ [النحل]

واتە: هەر پەیمان و بەڵێنێکتان بڕیاردا بەوەفا و ئەمەك بن بۆ ئەنجامدانی، سوێند و پەیمان و بەڵێنتان هەڵمەوەشێننەوە دوای ئەوەی کە دووپات کرا بووەوە تەئکیدی لەسەر کرابوو، لە کاتێکدا کە ئێوە خواتان کردۆتە شایەت و زامن بەسەریەوە، بێگومان خوا بەهەموو کار و کردەوەیەکتان دەزانێ.



یاخود لە سوورەتی الإسراء دا دەفەرموویّت:

﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا ٣٤ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ إِذَا كِلۡتُمۡ وَزِنُواْ بِٱلۡقِسۡطَاسِ ٱلۡمُسۡتَقِيمِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلٗا ٣٥ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ٣٧﴾ [الإسراء]

واتە: نزیك ماڵی هەتیوو مەکەوون مەگەر بەجوانترین شێوە نەبێت (وەك ئەوەی بیخەنە بازرگانییەکەوە تا گەشە بکات)هەتا دەگاتە هەڕەتی لاوی، وەفا بکەن بە بەڵێن و پەیمان، چونکە بەرپرسیارن لە بەرانبەر بەڵێن و پەیمانەوە.

هەرکاتێك کێشان و پێوانتان ئەنجام دا بەڕێکوپێکی و تێر و تەواوی ئەنجامی بدەن، بەو شێوەیە چاکتر کار ئەنجام دەدرێ، (لە دنیادا ئاسوودە دەبن و پاداشتی قیامەتیش بەدەست دەهێنن).

(ئەی ئینسان) لە شتێك مەدوێ و باسی شتێك مەکە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی دەسگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەرهەمووی، بەرپرسیارە لە بەرانبەریەوە.

هەروەها بەسەر زەویدا بە کەشو فش و لە خۆباییبوونەوە مەڕۆ، چونکە تۆ هەرگیز ناتوانی زەوی کوناوەدر بکەیت، ناشتوانیت وەکو چیاکان بەرز و بڵند بیت (ئیتر ئەم خۆ فشکردنەوەیەت لە چییە؟).

ئیتر لێرەوە ئەمە بنەڕەتێکی شەرعییە و موسڵمانان ناتوانن لێی لابدەن، پێغەمبەری خوا ﷺ پابەند بوو ئەبو بەسیری ڕادەست کردەوە، ئەبو بەسیر لەگەڵیاندا گەڕاوە، کە گەیشتنە ناوچەی (ذي حوليفه)، ئەبو بەسیر توانی شمشێری کەسێک لەوان وەرگرێت یەکیانی چەک کرد و کوشتی، چوو بۆ کوشتنی ئەوەی دووەم، بەڵام لەدەستی ڕایکرد، چۆوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: هاوەڵەکەتان هاوڕێکەمی کوشت و منیش لەدەستی هەڵهاتم، زۆری پێنەچوو ئەبو بەسیر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و بەشمشێری تیژ و خوێناوی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لە زیممەی جەنابتانم، بەڵکو تۆ منت ڕادەستی قوڕەیش کرد من خۆم دەرباز کرد لێیان، ناگەڕێمەوە لەگەڵیاندا بۆ ئەوەی تووشی فیتنەم بکەن لەسەر دینەکەم، دەڕۆم لەجێگایەکدا دەژیم، چووە ناوچەی ذی حولیفە لەوێ بنە



و بارگەی خست لە جێگایەک بەناوی (سیف البحر) پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەی دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ نەکات، بەڕاستی پیاوی جەنگە ئەگەر خەڵکی تری لەگەڵدا بێت.[٤٥]

ئەبو بەسیر ڕۆشتە جێگایەک بەناوی (سیف البحر)، پاشان موسڵمانە هاوشێوەکانی ئەبو بەسیر لە چارە و فەرموودەکەی تێگەیشتن کە ئاماژەیە بۆ هاوکاری ئەبو بەسیر، ٧٠ کەس لێی نۆبوویەوە لەوانە ئەبو جەندەل کوڕی سوهەیل، دەستیان کرد بە جەنگی گەریلایی دژی قوڕەیش و کاروانە بازرگانییەکانیان، بەتەواوەتی قوڕەیشیان هەراسان کرد.

ناچار قوڕەیش وەفدێکیان نارد بۆ لای پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بە زەلیلی داوایان کرد کە بەندی کۆتایی لابەرێت و موسڵمانان وەربگرێت، ئەمەش ئەو مەرجە بوو کە موسڵمانانی توڕە کرد، وا قوڕەیش بەهەموو لوت بەرز و تەکەبوری خۆیەوە زەلیلی دەنوێنێت بۆ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ تا ڕازی بێت ئەو خاڵە لە پەیماننامەکەدا بسڕنەوە.

ئەوەش ئەو نهێنییەیە کە خوای گەورە ئەو کەونەی پێ بەڕێوە دەبات ناوی ناوە قەزا و قەدەر.

ئەو کۆمەڵە گەریلایە بە سەرکردایەتی ئەبو بەسیر و ئەبو جەندەل، کۆتاییان بە چالاکییەکانیان هێنا و چوونە ناو موسڵمانان ٧٠ سەربازی چاونەترس و موجاهید چووە سەر هێزی خواناسان لە دەوڵەتی ئیسلامی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٤٥] ـ وَيْل أمِّه ، مِسْعَر حَرْبٍ لو كان له أحد، صحيح البخاري.



# هاتنی ئافرەتانی موسڵمان بۆ مەدینە

ڕاغیب: پێش ڕووداوەکانی ئەبو بەسیر ڕوویدات کۆمەڵێک لە ئافرەتان موسڵمان بوون و هاتن بۆ شاری مەدینە، لەو ئافرەتە خواناسانە بریتیبوون لەئوم کەلسومی کچی عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت.[٤٦]

موشریکەکان هاتن بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ئافرەتانە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو بۆ گەڕاندنەوەیان، فەرمووی ئێمە پەیماننامە و سوڵحەکەمان تایبەت بووە بە پیاوان، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی نەبوو ئافرەتان بکەونە ژێر فشار و ئازار و ئەشکەنجەی کافرەکان.

خوای گەورە ئایەتی لەسەر ئەو ئافرەتانە دابەزاند لە سوورەتی الممتحنة و دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ [الممتحنة]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك ئافرەتە ئیماندارەکان دێن بۆلاتان و کۆچ دەکەن تاقییان بکەنەوە و بەوردی پرسیاریان لێبکەن سەبارەت بە کۆچ و هۆی هاتنەکەیان، خوا ئاگادارە بە ئیمانەکەیان، جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن ئەوا مەیانگێڕنەوە بۆلای مێردە بێباوەڕەکانیان، نە ئەم ئافرەتانە حەڵاڵی ئەو بێباوەڕانەن و نە ئەو بێباوەڕانەش حەڵاڵی ئەم ئافرەتە ئیماندارانە، ئەو مارەییەی کە مێردە بێباوەڕەکانیان خەرجییان کردووە بۆیانبگێڕنەوە. ئیتر هیچ ڕەخنەیەکیش لەسەرتان نییە ئەو ئافرەتانە مارە بکەن کاتێك مارەییان بدەنێ، ئافرەتانی کافر مەهێڵنەوە لای خۆتان، واتە مارەیان مەکەن، ئێوەش ئەی ئیمانداران ئەگەر مەسرەفێکتان کردووە لە ئافرەتانی بێ باوەڕدا داوای بکەنەوە، ئەوانیش ئەگەر مەسرەفێکیان کردووە لە ئافرەتێکی ئیماندار دا با داوای بکەنەوە، ئا ئەوە حوکم و فەرمانی خوایە کە خۆی فەرمانڕەوایی دەکات لە نێوانتاندا، خوای گەورەش هەمیشە دانا و زانایە.

---

[٤٦] ـ امّ کلثوم بنت عقبة بن ابی معیط.



لەدوای مانگێک لەپەیماننامەکە قورەیش داوای کرد کە خاڵی کۆتایی پەیماننامەکە بسڕێتەوە لە ساڵی ٦ی کۆچی و موسڵمانان بۆ ساڵی ٧ی کۆچی هەنگاویان بەرەو قۆناغی بەجیهانیبوونی ئیسلام.



# ناساندنی ئیسلام بە جیهاندا

لەدوای سوڵح و پەیماننامەی حودەیبییە لەگەڵ ڕاغیب: گەڕامەوە بۆ ناو شاری مەدینە و لە دوای پشوودان ڕاغیب وتی: ماکوان ئەزانی ئەم ساڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نامە دەنێرێت بۆ هەموو سەرکردەکانی جیهان و بانگیان دەکات بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام؟!

ماکوان: لە مێژوودا بیستوومە، بەڵام لەڕووی بینین و شیکاری زۆر زانیاریم نییە لەسەری.

ڕاغیب: من ئەم ماوەیە دەگەڕێمەوە بۆلای نومێر، خۆت بەتەنها دەبیت!

ئەرێ بەڕاست دەنگوباسی نومێر چییە، لەبەر ڕووداوەکان نەپەرژاینەوە سەر باسی نومێر؟!

ڕاغیب: برای خۆم هەموو لە بارێکی زۆر دژواردا دەژین تۆ لە زیندانی، منیش زۆر سەرقاڵم نومێر نەخۆشە، ڕووداوەکان زۆر چڕ و پڕن، تەنانەت ئاگام لە تۆیە ناتەوێت هیچ ڕووداوێکی لاوەکی باس بکەین، زۆر سەرقاڵی بە ڕوماڵ کردن و وەرگرتنی زانیاری لە سەرئەم ڕووداوانەی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، جا بەردەوامبە نازانین تا چەند ئەم هەلەمان بۆ دەڕەخسێت، لەگەڵ ڕووداوەکاندا بڕۆ تا من یان نومێر بۆ لات دەگەڕێینەوە.

ماکوان: زۆر باشە خوای گەورە کارمان بۆ ئاسان بکات.

ڕاغیب جێی هێشتم و خۆم و ئەوانەی کە لە دەوارەکە دابوون، سیستەمێکمان دانا بۆ چوون بۆ شاری مەدینە و تێکەڵ بوون بە هاوەڵان و پێغەمبەری خوا ﷺ ، لای مزگەوتی پێغەمبەری خوامان جێنەدەهێشت هەر ڕووداوێک ڕوویبدایە خێرا هەواڵیان بۆ دەهێنام، ئەوکات هەستم کرد بەڕاستی ڕۆژانە خەریکی نووسینی ژیانی پێغەمبەری خوام ﷺ ئەی کە خۆشحاڵ بووم، سەبووری هەرچی خەمم بوو، لەو حاڵەتە و ڕەوشەدا دەژیام هیچم بیر نەدەما، ئەوەندە ئارامی و سەکینەتی بەدڵ و دەروونم بەخشی بوو زۆر وردبینانە تەماشای ڕەوش و ژیانی پێغەمبەرم دەکرد، شاری مەدینە ئارام و بزوتنەوەیەکی بازرگانی بەهێز و بونیادنانی کۆمەڵگایەکی پڕ لە ژیار و شارستانییەتی بونیاد دەنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵە لەگەڵ هەموو چین و توێژێک دا دەکات بۆ ئەوەی ببێتە ئەحکام و لە دواییدا موسڵمانان لەسەر بنەما و مەنهەجی بڕۆن، دیارە ئەو مەنهەجەش هەر کەس دەستی پێوە بگرێت سەرکەوتووی هەردوو دونیایە.

لەگەڵ ئەوەی هێزی موسڵمانان ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبوواندا بوو، دەوڵەتی ئیسلامی پێغەمبەر ﷺ لە دوای جەنگی ئەحزاب هەیبەت و توانای زۆری پەیدا کرد، بەڵام سەقامگیر



و ئارامی ڕاستی لەدوای سوڵحی حودەیبییە دەستی پێکرد قۆناغێکی یەکجار گرنگ بووە بۆ موسڵمانان.

هۆکاری سەرەکی ئەوەبوو کە قوڕەیش گەورەترین هۆز و عەشیرەتی ناو عەرەب بوو، ئیعترافی کرد بە دەوڵەتی مەدینە.

ئەم دانپێدانانی قوڕەیشە، سەر لەنوێ ژیانەوەی بەخشییە موسڵمانان بەو پێیەی کە قوڕەیش دانپێدانراوە لە هەموو لاکانەوە، پاشان بیسترا کە دەوڵەتێک سەری هەڵداوە لە شاری مەدینە، سەرکردەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ عەرەب و عەجەم و ڕۆم ئەم هەواڵەی بیست و ئاگاداری ڕەوشەکە بوون دوور و نزیک.

هەربۆیە دوای گەڕانەوی لە سوڵحی حودەیبییە پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لەوە کردەوە ئیسلام بەجیهان بناسێنێت.

بۆ هەموو لایەک دەربکەوێت و بچەسپێت کە ئەم ئایینە ئایینی هۆز و نەتەوە و لایەک نییە، بەڵکو ئایینی هەموو جیهانە و ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهان:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ١٠٧﴾ [الأنبياء]

واتە: ئەی (محد صلى الله عليه وسلم) ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان( جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەك و پەری و هتد...).

پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: لەڕاستی هەموو پێغەمبەران بۆ هۆز و نەتەوە تایبەتەکان ڕۆیشتوون، بەڵام خوای گەورە منی ناردووە بۆ هەموو خەڵک.[٤٧]

ئەمەش ئەو بەرچاوڕوونی و دیدەمان پێدەبەخشێت کە بەگوێرەی توانامان لەسەرمان واجبە کە ئیسلام بڵاو بکەنەوە بەهەموو جیهاندا.

ئەوە لەڕاستیدا فەزڵ نییە لە ئێمەوە، بەڵکو ئەرکی سەرشانمانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەشاری مەککەوە لەسەرەتای هاتنی وەحییەوە هاوەڵانی ڕاهێنا و فێرکردن کە ئەم دینە بۆ هەموو جیهانە، چەندین ساڵ پێش هیجرەت هەر لەشاری مەککەدا مژدەی دانێ و دەیفەرموو: بڵێن (لاإلەإلاالله) ڕزگارتان دەبێت، بڵێین (لا إلە

---

[٤٧] ـ وكان النبي يبعث إلى قومە خاصة وبعثت الى الناس عامة، صحيح البخاري.



الا الله) عەرەب و عەجەم دەخەنە ژێر دەسەڵاتتان, بەڵام لەدوای سوڵحی حودەیبییەوە، ئیتر کاتی هات و ئیسلام دەبێت بەهەموو جیهان بڵاوبکرێتەوە.



## واقعبینی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناساندنی ئیسلام بەجیهاندا

ماکوان: پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتای بانگەوازەکەیەوە هیچ وەفد و نوینەری خۆی نەنارد بەهیچ لایەکدا و تا ئیسلام بەهەموو پادشا و دەسەڵاتدار و جێگاکاندا بناسێنن، تەنانەت لەسەرەتای هیجرەتی بۆ شاری مەدینە ئەوکارەی نەکرد ئەگەر چی هەندێک پەیوەندی هەبوو بە ئەمیر و پادشاکانی ناوچەکە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ پلانێکی بۆ دانەنابوو، چونکە بانگەواز لاواز بوو پێویستی بەوە هەبوو کە بناغە درووست بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ واقیعبین و واقیعناس بوو، خۆ ئەگەر لەو کاتە ئەو کارەی ئەنجام بدایە هیچ کەس گوێی بۆ نەدەگرت، لەکاتێکدا هەموو ڕێکخستنە سەرەتاییەکانی لە زیندان و ئەشکەنجە و ئازاردا بوون، هەر نامەیەکی بناردایە بۆ هەر جێگایەک، هیچ کاریگەری نەبوو پشتگوێ دەخرا و لەوانەش بوو زیاتر لەناووچوونیان دەستی پێ بکرایە، تەنانەت کە هاوەڵان چوون بۆ حەبەشە کاریان بانگەوازی ئیسلامی نەبوو تەنها داوای پەناهەندەییان دەکرد، خۆ ئەگەر (عەمری کوڕی عاس) هەوڵی هاندانی نەجاشی نەبوایە بۆ ڕادەست کردنەوەی موسڵمانان و ڕوونکردنەوەی جەعفەری ئەبو تاڵب وای کرد کە سەرنجی نەجاشی ڕابکێشێت و بێتە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلام، لەگەڵ ئەوەها زانیشیان نەجاشی لەناو دینەکەدایە، بەڵام لە حەبەشە نە مزگەوتیان درووست کرد و نە هەوڵی بانگەوازیشیان دا لە ناو خەڵکەکەیدا.

بەمەش بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە واقیعی بووە ئەمەی کەباسمان کرد پێش سوڵحی حودەیبییە بوو، بەڵام دوای سوڵح و پەیماننامەکە ڕەوشەکە بەتەواوی گۆڕا، هەموو ناوی ئیسلام و پێغەمبەرەکەیان زانی و هەواڵ بڵاوبوویەوە بە هەموو وڵاتەکاندا، بەتایبەت لەدوای دانپیادانانی قوڕەیش لە پەیماننامەکەدا، ڕاستە قوڕەیش هێزێکی گەورە نەبوو وەکو فارس و ڕۆم بەڵام بەدڵنیاییەوە پەیوەندی سیاسی و دیبلۆماسی و ئابووری هەبوو لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە، هەموو سوڵحی حودەیبییە ئامانجەکەی لەوەدابوو کە قوڕەیش بەفەرمی دان بە بوونی دەوڵەتی ئیسلامیدا بنێت، چونکە پێشتر موسڵمانان لەڕووی دونیاییەوە هیچ شەریعەتێکیان نەبوو، وا پەی دەبرا کۆمەڵێکن لە قوڕەیش تووڕەبوون و وەکو هێزێکی ناو قوڕەیش تەمەشا دەکرا.

لە قۆناغی دوای حودەیبییە، بەتەواوەتی ڕەوشەکە لە سوودی موسڵمانان هاتووە و هەموو لایەک وەکو دەوڵەت و گیانی سیاسی و سەربازی و ئابووری تەمەشای دەوڵەتی مەدینەیان دەکرد، ئەویش وەفدی خۆی نارد بۆ جێگاکان.



# ناردنی نوێنەری دەوڵەتی ئیسلامی بۆ وڵاتانی جیهان

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەرەکانی خۆی ئامادەکرد بۆ گەیاندنی بانگەوازەکەی بەجیهاندا، لەوسەردەمەدا جیهان دابەشبوو بەسەر چەند دەوڵەتێکدا، ئەوروپا و بەشێکی ئەفریقا ڕۆم دەسەڵاتدار بوو، ئاسیا بەگشتی فارس و دەوڵەتی چین کە ناسرابوو بە (ئوبا) دەسەڵاتی هەبوو، لە ئەفریقاش دەوڵەتی حەبەشە خاوەن دەسەڵات بوو، لەگەڵ هەندێک ئیمارات و دەوڵەت کە هەر دابەش بوون بەسەر ئەم هێزانەدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ هەموو سەرکردە باڵاکانی سەرزەوی زۆر بەڕوونی و ڕاشکاوانە بانگی کردن بۆ ئەم ئایینە و هاتنە ناوەوەیان، ئەگەرنا ئەوا بەرپرسیارەتی خۆیان و میللەت و گەلەکەیان هەڵدەگرن.

هەر لەهەمان مانگی سوڵحی حەدەیبییەکە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە دەستی کرد بەناردنی نوێنەرەکانی واتا لە مانگی ذیلحیجەی ساڵی ٦ کۆچی دەستی پێ کرد تا ساڵی ٧ کۆچی مانگی موحەڕەم.

ئەگەر تەمەشای سەرەتای مژدەکەی بکەی هەر لەدوای چەند ڕۆژێک لە گەڕانەوەی حودەیبییە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە ناردنی نوێنەرەکانی ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە لەسەر بانگەوازەکەی چالاک بووە درێخی نەکردووە شەو و ڕۆژ چرکە ساتی بەکارهێناوە بۆ ئەم بانگەوازە، هەروەها نامەکان لەیەک کاتدا هەندێکیان چووە بۆ پادشا و مەلیکەکان، هەندێکیان دواکەوتووە چەند مانگێک لە نێوانیاندا بووە.

بەگشتی لەکۆتایی ساڵی ٦ کۆچی دەستی پێکردووە سەرەتای ساڵی ٧ کۆچی کە بریتیبوون لە (٩) نامە.

نامەی یەکەم: بۆ نەجاشی (ئەسحەمە) ڕەحمەتی خوای لێبێت هەڵگری نامەوە و وەفدی پێغەمبەر ﷺ هاوەڵی بەڕێز (عەمری کوڕی ئومەییەی زەمری) بووە.

نامەی دووەم: بۆ گەورە و سەرۆکی میسر (مقەوقیس) هەڵگری نامە و نوێنەری پێغەمبەر ﷺ (حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە)[٤٨] بوو.

-----

[٤٨] ـ حاطب بن ابي بلتعة.



نامەی سێیەم: بۆ پادشای فارس (کیسرا) هەڵگری نامە و نوێنەری دەوڵەتی پێغەمبەر (عەبدوڵای کوڕی حوزافەی سەهمی) بوو.

نامەی چوارەم: بۆ مەلیکی ڕۆم (قەیسەر) هەڵگری نامە و نوێنەری دەوڵەتی پێغەمبەر (دحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبیی) بوو.

نامەی پێنجەم: بۆ مەلیکی بەحرەین (مونزیری کوڕی ساوای) نوێنەری دەوڵەتی پێغەمبەر (عەلای کوڕی حەزرەمی).

نامەی شەشەم: بۆ (سامانی کوڕی بازانی فارس) حاکمی یەمەن هەڵگری نامە دوو نوێنەری خودی سامانی کوڕی بازانی فارس بوو.

نامەی حەوتەم: بۆ دووبرا حاکمی وڵاتی عومان بەناوی (جەیفەر و عەبد).

نامەی هەشتەم: بۆ (هەوزەی کوڕی عەلی) مەلیکی یەمامە هەڵگری نامە و نوێنەر (سەلیتی کوڕی عەمری عامری).

نامەی نۆیەم: بۆ مەلیکی دیمەشق (حارسی کوڕی ئەبو شەمەری غەسانی) هەڵگری نامە هاوەڵی بەڕێز (شوجاعی کوڕی وەهبی ئەسەدی).

ئەو نامانە کە گەیشتنە جێگای دیاریکراو لەنوێنەر و مەلیکەکاندا گفتوگۆی زۆر سەرنج ڕاکێش ڕوویداوە، کە ئەوەندەی وانە و ئەزموونی تێدایە کە لە ژماردن نایەت.

ئەو نامانە ناوەڕۆکی بریتی نەبوو لە دامەزراندی پەیوەندی دبلۆماسی و پەیوەندی ئابووری و سیاسی و سەربازی، دوور بوو لە عورف و عاداتی سەرکردە و دەوڵەتەکان و قانونی نێودەوڵەتی، چونکە خودی سەرۆکی ئەم دەوڵەتە خۆی بە پاشا و مەلیک هەژمار ناکات، بەڵکو دەڵێت من پێغەمبەرم، کاری پێغەمبەریش زۆر جیاوازە لەکاری سەرکردە و مەلیک و پادشاکانی جیهان، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ یەک داوای هەیە و دوای وەحی کەوتووە.

چاوەڕێی ئەوە نییە دەوڵەتەکان دانی پیدا بنێن و داوای ئیعترافی دەولی بکات، نەخێر بەڵکو زۆر بەڕاشکاوی بانگیان دەکات بۆ نووری ئیسلام، ئەم بانگەوازەش زۆر ترسناکە و ئەنجامەکەی زۆر کارەساتی بەدواوەیە.

چونکە داوایان لێدەکات شوێنکەوتووی ئایینی ئیسلام بن، واتا لە سەروەری دەوڵەتەکەیانەوە بۆ شوێنکەوتنی دەوڵەتێکی تر، لە گوێڕایەڵی خەڵکی بۆی دەبێت لەمەودوا پادشا و مەلیک گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بەدڵنیاییەوە هەر کەس ئەوکارە



ئەنجام بدات ئیمانداره، بەڵام ئایا ئەو کاره دەکەن یان سوپا ئاماده دەکەن و دەچنه سەریان بۆ لەناو بردنیان.

بەهەرحاڵ ئەوەی خاوەنی ژیری بێت، دەزانێت هیچ سەرکردەیەک لەسەر ئەم زەوییەدا کاری وای نەکردووە، هەرگیز جورئەتی ئەوەشیان بۆ درووست نەبووە، پرسیار لەوەدایه کە ئەم پیاوه بەهێزه و لەساڵی ٧ کۆچی نوێنەری خۆی دەنێرێت بۆلای هەموو هێزه زەبەلاح و پادشا خاوەن دەسەڵاتەکان کەشوێنی بکەون، لە لۆمەی هیچ لایەک ناترسێت، نهێنی ئەم باسه لەوەدایه کە ئەم پیاوه سەرکرده نییه تا دەوڵەتی نەتەوەیی دابمەزرێنێت ئیمپراتۆر نییه تا بەدوای فراوانی خاکەوه بێت، پادشا نییه تا بەشوێن موڵک و سەروەت و سامانەوه بێت، ئەی چییه؟!

تەنها و تەنها پێغەمبەره و فەرمانی خوای لەسەر زەویدا پیاده دەکات، خۆ ئەگەر یەکێک بوایه لەوانەی کە ئاماژەمان پێدا هەرگیز بیری لەبانگەوازی خوای پەروەردگار نەدەکردەوە.

بانگەوازەکەش بۆ جیهانه نەک تەنها لایەک، جا بەهەر نرخێک کۆتایی دێت گرنگ نییه، گرنگ ئەوەیه خوا ڕازی بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی لەهەموو قەیرانەکاندا، بەهێز و توانای خۆیان سەرکەوتوو نەبوون، دەیزانی دوژمنانیان زۆر بەهێزن، بەڵکو سەرکەوتن لای خوای گەوره و مەزنەوەیه.

ئاخر کۆمەڵێک موسڵمانی ڕەش و ڕووت کە خەڵکی لەڕێگای خوادا جێگای کردنەوە، وا ئێستا خاوەنی دەوڵەت و هێزن، نەجەنگی بەدر و ئەحزاب و مەفرەزەکان و یەهوودی بەنو قەینوقاع و بەنو نەزیر و بەنی قورەیزه... هتد هەموویان بەپێوەری ماددی لە موسڵمانان دەجار بەهێز تربوون، لێرەدا ئەوەی دەردەکەوێت ئەوەی تەڕەفی خوا بێت، بەدڵنیاییەوە خوا سەری دەخات.

## نامەکەی پێغەمبەر بۆ هیرەقلی ڕۆم

ماکوان: ئەم نامەکە دەیخوێنێتەوە زۆر ئاساییه تووشی شۆک بێت، وەکو ئەوە وایه بەنموونه سەرۆکی هێزێکی کوردی نامه بۆ سەرۆکی ئەمریکا بنووسیت بڵێت شوێنم بکەوە؟!

هەڵبەت لە ڕووی هێز و توانای ماددی و هێزی سەربازی و هێزی ئابووری پێوەری دەکەم، دەنا پێوەرکردنی وشەی پێغەمبەر ﷺ بە هەموو جیهان پێوانه ناکرێت، بەڵام بۆ تێگەیشتنه و زیاتر ڕوون ببێتەوە.



چونکە دەوڵەتێکی زۆر بچووک کە سوپاکەی ناگاتە ٤ هەزار سەرباز لەکاتێکدا دەوڵەتی ڕۆم خاوەنی ٢ ملیۆن سەربازە، هەموو چەند مانگێکە سەرکەوتووە بەسەر فارسدا و ناوچەکانی خۆی گرتۆتەوە دەست.

ڕۆم هەزاران ساڵە دەوڵەتە و خاوەن ژیار و شارستانییەت، حکومەتی شاری مەدینە یەشتا ٧ ساڵی پڕ نەکردۆتەوە، هەر چۆن پێوەری بکەین و لێبکۆڵینەوە ئەستەمە بتوانین لەڕووی واقیعەوە شیتەڵی بۆ بکەین، تاکە شیتەڵ ئەنجامێک دەست بکەوێت، ئەویش بوونی ڕاستەقینە خودی محەمەدە کە پێغەمبەری خوایە ﷺ لای خواوە نێراوە، تەنها ئەو ڕستەیە دەتوانێت دەرگای هەموو کۆدەکان بشکێنێت.

نامەکە دەفەرمووێت: بۆ قەیسەری ڕۆم....

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

لە محەمەد بەندەی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هیرەقل گەورەی ڕۆم، ئاشتی و هێمنی برژێت بەسەر ئەو کەسەی کە شوێن هیدایەتی خوا دەکەوێت، موسڵمان بەو خۆت بدە بەدەستەوە.

(زۆر بەڕاشکاوانە موسڵمان بەو شوێنی بکەوە).

خوای گەورە دووجار پاداشتت ئەداتەوە، خۆ ئەگەر واتنەکرد و سەرپێچیت کرد ئەو هەموو تاوانی ئەریسییەکان کە مەزهەبی ئەو کاتەی مەسیحی بوو دەکەوێتە سەرت.

(یاخود دەڵێن ئەریسییهکان واتا هەموو گەل و میللەتی ژێر دەستەی ڕۆم).

پێغەمبەری خوا لەسوورەتی آل عمران دەفەرمووێت:

﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡ[illegible]
شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُو[illegible]

[آل عمران]

واتە: (ئەی محەمەد ﷺ بە گاور و جوو) بڵێ، ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانە کراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەکەیەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لەنێوان ئێمەش و ئێوەشدا...

(ئەویش ئەمەیە کە): جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان (بە پیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین و) لە جیاتی ئەو زاتە



نەیپەرستین (خۆ ئەگەر لەم بانگەوازەدا) سەرپێچیان کردو گوێیان پێنەدا، ئەوە پێیان بڵێ: کە ئێوە شایەت بن کە ئێمە موسوڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین.



## دەقی نامەکە:

بسم الله الرحمن الرحيم، من محەمەد عبدالله ورسوله الی هیرقل عظیم الروم سلام علی من اتبع الهدی، أسلم تسلم، یؤتک الله أجرک مرتین فن تولیت فن علیک إثم الارسیین: قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴿٦٤﴾

واتە: (ئەی محەمەد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، بە گاور و جوو) بڵێ، ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانە کراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەکەیەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لەنێوان ئێمەش و ئێوەشدا...

زۆر بەجوانی بەڕوون و ئاشکرا و هێز و عیزەتی وشەکان و هەروەها حیکمەتی وشەکان، پێویستی بەچەند کاتی دوورو درێژخایەنە تا باس و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین، بەڵام لێرەوە واقیعیانە ڕووداوەکە وەکو خۆی باس دەکەین و شیکاری بۆ دەکەین.

پێش هەموو شتێک لە درووشمەکاندا ئەوەی تێیدا بەدی دەکرێت کە عیزەتی دەوڵەتی ئیسلامی تێدا بەرجەستە دەبێت وتاری یەکەمی پێغەمبەر بەناوی خۆی دەستی پێکردووە دوای ناوی هیرەقلی نووسیوە، ئەمەش لەو زەمەنەدا زۆر ترسناک بوو، پاشان ڕاستەوخۆ بێ پێشەکی و دوودڵی و بەئیرادەیەکی بەهێزەوە داوای موسڵمان بوونی لێ دەکات.



لەڕووی بەرامبەرەوە وشەکان زۆر نایابن وەکو دەڵێن (ترهیب و ترغیب)ی پێوە دیارە، هیرەقلی بەگەورەی ڕۆم نووسیوە، هیچ لە قەدر و مەکانی بەرامبەری کەم نەکردۆتەوە، لەگەڵ ئەوەی داوای موسڵمان بوونی لێ دەکات ئەجر و پاداشتی قیامەتی و خوای پەروەردگار دەخاتە بەرچاوی، ئەمەش جۆرێکە لە ڕەغبەت پێدان، پاشان هەڕەشەیەکی زۆر ڕوونە دەفەرمووێت خۆ ئەگەر گوێت پێنەدا و سەرپێچیت کرد بەرپرسیارەتی دەکەوێتە سەر شانت، هەڕەشەی لێنەکردووە بە سوپا و هێزی سەربازی، هەڕەشەی وشەی کردە سەر بنەمای پێغەمبەرایەتی، ئینجا نموونەی پەیامی پێغەمبەرایەتی بۆ دەنێرێت کە ئایەتی قورئانە و سورەتی ئالی عیمرانە ئایەتی:

﴿قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴿٦٤﴾﴾

[آل عمران]

واتە: (ئەی محەمەد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، بە گاور و جوو) بڵێ، ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانە کراوە وەرن بەدەم بانگەوازو بەرنامەکەیەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لەنێوان ئێمەش و ئێوەشدا...

هێزێکی نێوانیان و کارە هاوبەشەکانیان دەردەخات، تا مێشک و دڵی بکاتەوە بەبیرکردنەوە سەرنجی ڕابکێشێت.

بەم شێوەیە گوتاری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ هەموو پادشا و سەرکردەکان ڕۆیشتن, هەموو نامەکان بەم شێوەیە بوو، تەنها گۆڕانکاری چەند وشە و ئایەتێک گۆڕابوو کە گونجاو بێت لەگەڵ واقیعی پادشا یاخود دەسەڵاتدارەکەدا، هەموو نامەکان بەو پەڕی حورمەت و ئەدەبەوە نووسرابوو، هیچ بێڕێزی و سووکایەتی تێدا نەبوو.



# ..ەڵامی هیرەقل مەلیکی ڕۆم

ماکوان: لەکاتێک هیرەقل نامەکەی وەرگرت زۆر بەجددی وەریگرت و کەوتە لێکۆڵینەوە، ئەگەر هەڵوێستەیەک بکەین لەسەر نامەکە و قسەکانی هیرەقل زۆر شتمان بۆ ڕوون دەبێتەوە لە ئێستا و مەبەستم سەردەمی پێغەمبەر و دوای سەردەمی پێغەمبەر و جەنگی خاچ پەرستان و ئەو واقیعەی ڕۆژئاوای جیهانگیری سەدەی ٢١.

لەگەڵ ئەوەی پادشای ڕۆم خاوەن گەورەترین دەوڵەت بوو لە جیهاندا، نامەکەی پێغەمبەری وەرگرت و ئەگەر وەکو دەوڵەت تەماشای بکەین، عەرەب هیچ توانا و هێزی نەبوو تەنانەت لەناو ڕووداوەکانیشدا ئەرزشی نەبوو، دەوڵەتی مەدینە بچووک و لاواز کەس هەواڵی بەهێز بوونی نەبیستووە.

ئینجا داوای کرد لەوانەی دەور و پشتی کە تەرجومەی بۆ بهێنن و نامەکەی بۆ وەربگێڕنە سەر زمانی لاتینی، ئەیەوێت لەژیانی عەرەب بزانێت لەهەموو سەحرای پارچە پارچە و بێ ژیار و شارستانی، ئێستا نامەی لای ئەوانەوە بۆ هاتووە کە لە هیچ هاوکێشەیەکدا نەبوون.

لە ڕووی سیاسی و سەربازی و ئابووری هەرگیز پێوانە ناکرێت هەموو عەرەب و دەوڵەتی ڕۆم، وەکو سۆماڵ و ئەمریکا وایە!

ڕاستە سۆماڵ لە ڕووی خەڵکەوە زۆرە، بەڵام لەڕووی ئابووری سەربازی سیاسی و تەنانەت سەرمایەی مرۆیی هەر پێوانە ناکرێت بە ئەمریکا.

لەڕاستیدا کاتێک باسی پادشای ڕۆم هیرەقل دەکەم، هەروا کەسێکی سادە نییە، بەڵکو کەسێکی وردبین و دینداری نەسرانییە و شارەزایە لە تەورات و ئینجیل، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پابەند و مولتەزیمە بەئایینی مەسیحی، چونکە لەکاتی سەرکەوتن لە جەنگی فارسدا نەزری کرد لە شاری (حمس) بەپێ پەتی بڕوات بۆ حەج بۆ شاری قودس، بۆ سوپاسگوزاری خوای گەورە کە سەریخستووە بەسەر فارسدا.

پیاوێکی وەکو هیرەقل دەیزانی کە لە تەورات و ئینجیلدا باسی هاتنی پێغەمبەرێک کراوە، مژدەی موسا و عیسایە سەلامی خوایان لێبێت.

بەڕاستی هیرەقل چاوەڕوانی ئەو پێغەمبەرەی دەکرد، کاتێک (دحیە) نامەکەی ئەداتێ و دەڵێت لەلایەن پێغەمبەری کۆتایی زەمانەوە هاتووە، ئەو لەبنەڕەتدا بڕوای بە بیرۆکەکە هەیە،



لەوانەیە موشتاق بێت بەبینینی ئەو پێغەمبەرە، بەڵکو خوای گەورە بە ستراتیژی ئەم کەونە کە قەزا و قەدەرە کارەکەی ئاسان کرد بۆ هیرەقل.



## گفتوگۆی ئەبو سوفیان و هیرەقل و ئوسقووفی پاپای ڕۆم

ماکوان: لەدوای وەرگێرانی نامەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ هیرەقل، داوای کرد کە کۆمەڵێک عەرەبی بۆ بهێنن پرسیاری ئەم پێغەمبەرەیان لێ بکات؛ ئەم پێغەمبەرە کێیە و لەناو عەرەبدا چۆن ناسراوە؟

سەربازەکانی هیرەقل لەشاری غەزە لە فەلەستین کۆمەڵێک بازرگانی عەرەبیان دەستگیر کرد، ئەم کۆمەڵە بازرگانەیان برد بۆ شاری قودس بۆ پرسیار و وەڵام بۆ ئەوەی بزانێت کێیە ئەم کەسە داوای پێغەمبەرایەتی دەکات.

لەناو ئەو بازرگانانە (ئەبو سوفیان کوڕی حەڕب) کە دوژمنی پێغەمبەرە ﷺ ئەویان لەگەڵ دابوو، لەهەمانکاتدا سەرۆکی شاری مەککەیە، لەدوای سوڵحی حودەیبییە ئەم ڕووداوە ڕوویدا چونکە ئەبو سوفیان بۆ بووژانەوەی ئابووری مەککە ئەم جارە خۆی دەرچووبوو بۆ شام، بە دەستگیرکراوی بردبوویان بۆ لای هیرەقل، بەڵام ئەم کەونەیە بە ستراتیژی قەزاو قەدەر بەڕێگاوە دەچێت، لەوکاتەدا ئەو کافرە ئیقامە حوجە لەسەر خۆی و هیرەقل دەکات، لەنێوانیاندا گفتوگۆیەکی زۆر نایاب و سەیر ڕووئەدات، هیرەقل پرسیاری کرد کێ لەم بازرگانانە لەو کەسە نزیکە وەکو کەسایەتی و خزمایەتی کە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکات؟

ئەبو سوفیان: من نزیکترین کەسم لێی و لەڕووی خزمایەتییەوە.

هیرەقل: وەرە نزیک بەرەوە لێم، چووە تەنیشتی هیرەقل وەستا لەبەردەم هاوەڵەکانی و قەیسەری ڕۆم وەرگێڕەکانی هەموو وشەیەکی بۆ وەردەگێڕن، پاشان ڕووی کردە هەموو بازرگانەکانی عەرەب و پێی وتن ئەگەر ئەم کەسە هەر ناڕاستی و درۆیەکی کرد، تکایە بەدرۆی بخەنەوە، چونکە هیرەقل دەیەوێ بەجددی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات و زۆر بە پەرۆشەوەیە بۆ زانیاری دروست و ڕاستی لەسەر ئەم پێغەمبەرە.

هەربۆیە پرسی کێ نزیکترین کەسە لە ڕووی خزمایەتییەوە، دەیویست ورد و درشت بزانێت، لەهەمانکاتدا لە پشتی ئەبو سوفیان چەند کەسی لە عەرەب دانا ئەگەر ئەبو سوفیان ڕاستی نەکرد بەدرۆی بخەنەوە و هەروەها لەژێر کاریگەری ترس و ئیرهابی قەیسەردا، ئەبو سوفیان حەتمەن دەترسێت درۆ بکات، ئەوانەی لەڕوویدا داناوە هەر قسەیەکی ناڕاست بکات ئەنجامی باش نابێت.

هەرچەندە لەناو عەرەب لەسەردەمی جاهیلیشدا درۆ کردن زۆر عەیب بووە، وایان داناوە هەرکەس درۆ بکات مرۆڤێکی زۆر لاوازە، تەنانەت ئەبو سوفیان دەڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر



لەبەر هاوڕێکانم نەبووایە حەزم دەکرد درۆ بکەم، بەڵام لەترساندا نەبوو بەڵکو لەبەردەم هاوڕێکانمدا شەرمم دەکرد درۆ بکەم، بۆیە هەرچی لێی پرسیم بەڕاستگۆیی وەڵامم دایەوە.

تا ئەو چرکە ساتە هەر دژی پێغەمبەری خوایە، ڕقی لە پێغەمبەر ﷺ دەبێتەوە ڕقێکی زۆر، بەڵام شەرم لە درۆکردن دەکات بۆیە درۆی نەکردوە.

ئینجا لێپێچینەوە و وتوێژ و گفتوگۆی هیرەقل دەستی پێکرد و لەبەردەم هەموو پاپای ڕۆم و وەزیرەکان و فەرمانبەری دەوڵەتەکەی، بەدڵنیاییەوە دەیانزانی زانای تێدایە.

هەموو پرسیارەکانیش لەدەوری چۆنیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەخولێتەوە بەڵام پرسیارەکانی ئەنجامی لێ وەردەگرێت و دەیەوێت بگاتە یەقین لەوەی ئایا بەڕاستی ئەو کەسە پێغەمبەرە لەناو عەرەبەوە هاتووە؟

پرسیارەکان هەموو ئەنجامی هەڵکۆڵینی ئەقڵییە.

پرسیارەکان هەموو زانیارین لەسەر چۆنییەتی پێغەمبەران بەشێوەیەکی گشتی, لەسەر ئەو پێغەمبەرە بەتایبەتی، چونکە سیفاتی لە تەورات و ئینجیل دا هاتووە.

گفتوگۆکە دەستی پێکرد.

هیرەقل: ئەو پێغەمبەرە لەناوتاندا لە بنەماڵەیەکی چۆنە؟

ئەبو سوفیان: خاوەن بنەماڵەیەکی ناسراو و جوانترین بنەماڵەن.

هیرەقل: هیچ کەس لەناوتاندا پێش ئەو ئەو بانگەشەیەی کردووە بڵێت من پێغەمبەرم؟

ئەبو سوفیان: نەخێر، لەمێژووی عەرەبدا کەس ئەو بانگەشەیەی نەکردووە.

هیرەقل: ئایا لە باوانیدا پادشای تێدابووە؟!

ئەبو سوفیان: نەخێر.

هیرەقل: کێ شوێنی دەکەوێت لە خەڵکی ئەوانەی لە دەسەڵاتدارن یان هەژار و لاواز؟!

ئەبو سوفیان: بەڵکو لاوازەکان.

هیرەقل: زیاد دەکەن یاخود کەم دەکەن؟

ئەبو سوفیان: هەمیشە لەزیاد بووندان.

هیرەقل: هیچ کەس لەشوێنکەوتوانی لەدوای ئازاردانیان پەشیمان دەبنەوە .



ئەبو سوفیان: نەخێر هیچ کەس پەشیمان نابێتەوە.

هیرەقل: پێشتر ئەو کەسە تاوانبارتان کردووە بە درۆکردن، پێش ئەوەی بڵێ پێغەمبەرم؟!

ئەبو سوفیان: نەخێر.

هیرەقل: غەدر و پەیمان شکێنی کردووە؟

ئەبو سوفیان: نەخێر، ئێمە لەگەڵیداین لە پەیماننامەیەکدا نازانین دوای ئەوە چی ڕوودەدات، (مەبەستی سوڵحی حودەیبییە).

ئەبو سوفیان هەر دەیوت شتێکی نابەجێ بڵێ دژی پێغەمبەری خوا ﷺ تا ئەم ساتە وەختە هەموو وەڵامەکان لەبەرژەوەندی پێغەمبەرە ﷺ، ئەبو سوفیان دەڵێت: هەر دەمویست قسەیەکی گوماناوی بخەمە ناو قسەکانم بێجگە لەو وەڵامە هیچی ترم بۆ نەکرا.

واتا بەهەر شێوەیەک دەیویست پێغەمبەر ﷺ ناشرین بکات، بەڵام نەیتوانی پاشان گفتوگۆکە بەردەوام بوو.

هیرەقل: جەنگتان لەگەڵ کردووە؟

ئەبو سوفیان: بەڵێ.

هیرەقل: جەنگەکەتان چۆن بوو؟!

ئەبو سوفیان: جارێک ئەو سەرکەوت، جارێک ئێمە سەرکەوتووبووین، (مەبەستی بەدر و ئوحود).

هیرەقل: فەرمانتان بەچی پێدەکات، داوای چی دەکات؟!

ئەبو سوفیان: دەڵێت بەتەنها خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن، واز لەئایینی دایک و باوکتان بهێنن، فەرمان دەکات بە نوێژکردن و ڕاستگۆیی و داوێن پاکی و سیلەی ڕەحم.

بەم پاوپێوەندە کۆتایی بە گفتوگۆکە هات.

بەڵام هیرەقل بەشێوەیەکی زۆر ئەکادیمی کەوتە شیتەڵکردنی گفتوگۆکە، لە ئەنجامی ئەو زانیارییانەی کە لەدەمی ئەبو سوفیان دەستی کەوتووە، تا بە ئەنجامێک لێی دەربچێت.

هیرەقل وەرگێڕەکەی بانگ کرد و شیتەڵ کارییەکەی دەستپێ کرد.



هیرەقل وتی: لێم پرسیت لە بنەماڵە و ناونیشانی وتت خاوەن بنەماڵە و نەسەب و کەسایەتی بەرزە، ئەمەش ئەوە دەردەخات هەموو پێغەمبەرێك کە دێت لە ناو گەل و هۆزەکەیدا لە ناو بنەماڵەیەکی ناسراو و خاوەن نەسەبە و کەسایەتی بەرزدا دێت.

هەروەها لێم پرسیت: پێشتر کەس ئەو بانگەشەیەی کردووە، تۆش وتت نەخێر، خۆ ئەگەر پێشتر کەسێک ئەو بانگەوازەی بکردایە دەکرا بمانووتایە کاریگەری پێشتری خۆی لەسەر بووە، بەڵام یەکەم کەسە ئەو بانگەوازە دەکات.

لێم پرسیت کەس لە باوک و باپیرانیان پادشا و مەلیک بوون, بۆت باسکردم کە نەخێر، خۆ ئەگەر باوک و باپیرانی پادشا و مەلیک بوونایە، دەوترا بەدوای موڵک و دەسەڵاتی باوانیەوەیەتی.

لێم پرسیت درۆتان لێ بینیووە یاخود تاوانبارتان کردووە بەوەی درۆی کردبێت و درۆزن بێت، تۆش وتت نەخێر، ئەو کە بەرامبەر خەڵکی درۆ نەکات، چۆن درۆ بەدەم خواوە دەکات و دەڵێت پێغەمبەرم.

پرسیارم کرد ئایا خەڵکی دەسەڵاتدار و خاوەن هێزەکان شوێنی دەکەون یاخود لاواز و چەوساوەکان، لە وەڵامدا وتت چەوساوە و هەژار و لاوازەکان، ئەوەیش هەموو شوێنکەوتەی پێغەمبەرانن.

پرسیم لەزیادبوون دان یاخود کەم دەکەن؟ وتت لەزیاد بووندان هەمیشە ئەمەش کار و بانگەوازی ئیمانە تا تەواو دەبێت، تا دینەکە سەردەکەوێت.

هەروەها پرسیم کەس لەشوێن کەوتەکانی پەشیمان دەبنەوە، بەهۆکاری زۆر لێکردن، تۆش وتت نەخێر، ئەمەش نیشانەی ئیمانە کە تێکەڵ بە دڵ و دەروون دەبێت.

پرسیم لێت غەدر دەکات و پەیمان شکاندن دەکات وتت نەخێر، هەروەها هیچ پێغەمبەرێک غەدر و پەیمان شکاندن ناکات.

وتم بەچی فەرمانتان پێ دەکات، پێت ڕاگەیاندم فەرمانمان پێ دەکات کە خوای پەروەردگار بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن، ڕێگریتان لێ دەکات لە بەندایەتی بت و پەیکەرەکان، هەروەها فەرمانتان پێ دەکات بە نوێژ و ڕاستگۆیی و پاکی داوێن و لاشە، ئەمەش کاری هەموو پێغەمبەرانە.

لەدوای شیتەڵکارییەکەی ئەنجامێکی زۆر سەیر ئەداتە گوێگرانی ناو هۆڵی قەیسەر.



دەڵێت: ئەوەی کە وتت هەموو ڕاستی و حەق بوو، ئەو کەسە ئەم جێگایە کە قاچی منی لەسەرە هەموو دەکاتە موڵکی خۆی، من پێشتر وام دەزانی کە لەعەرەب نایەت بەڵکو لە ڕۆمدا ئەو پێغەمبەرە دەردەکەوێت، ئەگەر دەمزانی لەکوێیە دەڕۆشتم خۆمم ڕزگار دەکرد، واتا موسڵمان دەبووم و هەردوو قاچەکانی ئەو پێغەمبەرەم دەشۆرد و لەخزمەتیدا دەبووم.

لەڕاستیدا ئەم وتانەی هیرەقل لەناو هۆڵەکەدا قەرەباڵغی درووست کرد، چونکە لەهەموو لاکانەوە دەنگ بەرزبوویەوە، لەڕاستیدا زۆر ترسناکە ئەم قسەیە کە هیرەقل ئیمپراتۆری ڕۆم ئەم وتەیە بڵێت، یەقینی هەیە کەئەو کەسە پێغەمبەرە و ڕاستگۆیە، تەنانەت موڵک و حکومڕانی فراوان دەبێت و هەموو وڵاتانی شام دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆی بە تەوازوع و لەخۆبوردی بەشوێنکەوتوی تەواو بۆ فەرمانەکانی ڕای خۆی دەڵێت تەنانەت دەڵێت قاچە موبارەکەکانی بشۆرم.

ئینجا دەبێت پێش ئەوەی کە ئەبو سوفیان بانگ بکات چەند جاری تر ئەو نامەیەی خوێندبێتەوە و هەموو ئەم قسانە دحیەی کەلبی وەستاوە, وەکو نوێنەری پێغەمبەر و دەوڵەتەکەی گوێی لێیە.

پاشان هیرەقل بەوە نەوەستا پاپای ڕۆمی بانگ کرد کە بە ئوسقووفی گەورە ناسراوە، بێجگە شیتەڵ کارییەکەی خۆی دەیەوێت بزانێت چی نووسراوە لە تەورات و ئینجیل دا.

دەیەوێت زیاتر لەسەر ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بزانێت، بەهەر حاڵ ئەو نامەکەی لەبەر چاوی هەموو ڕۆم و عەرەب و ئامادەبوانی ناو هۆڵەکە خوێندەوە، دەنگی نارەزایی لەهەموو لایەکەوە درا بەهۆی قسەکانی قەیسەر دەنگ بەرز بوویەوە کە لە دێرێک داوایان لێدەکات هەموو موسڵمان بن، ئیتر چۆن توورە نابن

کۆتایی بەو کۆبوونەوەیە هات، بەرزبوونەوەی دەنگی دەسەڵاتدارانی ڕۆم لەوە بەرز بوویەوە کە بانگەوازی ئیسلامی کران!

هەرچی سەرۆک و سەرکردەی سەربازی بوو لەگەڵ تەواوی ئامادەبوان بەتەواوتی ڕەتی فەرمووده‌کەی پێغەمبەریان کردەوە کە لەنامەکەدا نوسرابوو، پاشان ئەبو سوفیان و هەموو بازرگانەکان کرانە دەرەوە و ئازاد کران بۆ گەڕانەوە.

ئەبو سوفیان کە نامەکەی پێغەمبەری بینی بە هیرەقلە و نامە بۆ پادشا و گەورەکانی جیهان دەنێرێت و بەو شێوەیە لە مەجلیسی هیرەقل باسی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ محەمەد مصطفی دەکرێت، زۆر کاریگەری لەسەر درووست کرد، تەنانەت کێشای بەدەستی خۆیدا و بەسەرسووڕمانەوە وتی: بەڕاستی کوڕی ئەبو کەبشە ناو و ناوبانگی لەهەموو جێگایەکدا بەرزبووە. (لقد أمر إبن إبی کبشة)



مەبەستی پێغەمبەر بوو پاشان وتی خۆ مەلیکی هەموو ئەوروپا لێی دەترسێت (إنه ليخافه ملک بني الأصفر)

هەر ئەمە بوو وای کرد کە کاتێک کچەکەی شووی کرد بە پێغەمبەر لە ساڵی ٨ ی کۆچیدا بەخۆشحاڵی و شانازییەوە وتی: محەمەد کەسێکی کەم نییە، تا ئەو ساتە وەختەش هەرکافر و بێباوەڕ بوو.

دوایش دەبینین ئەبو سوفیان چۆن موسڵمان دەبێت.

هیرەقل دان بەڕاستیدا دەنێت بەڵام هەر پادشایی هەڵدەبژێرێت

ماکوان: هیرەقل ئامادەی تەواوی هەبوو بۆ وەرگرتنی ئیسلام، بەڵام لەدوای دەنگ بەرزبوونەوەی ناو کۆشك و تەلارەکەی و هۆڵەکە زانی هەموو ڕەتی ئیسلامەتی دەکەنەوە، ئەویش لە کورسییەکەی ترسا، زانی هەڵبژاردنی ئەم دینە لەدەستچوونی کورسی و دەسەڵاتەکەیەتی لەناو ڕۆمدا، ناشیەوێت ئەم کارە ئەنجام بدات.

هەر بۆیە بانگی دحیەی کوڕی خەلیفە کەلبی کرد و پێی وت:

سوێند بەخوا دەزانم محەمەد حەقە، هاوەڵەکەت واتا بەدحیەی وت پێغەمبەر نێردراوی خوایە یەقینم هەیە، ئێمەش چاوەڕوانی بووین، لەکتێبەکانمان هەواڵی نووسراوە، بەڵام من لەگەلی ڕۆم دەترسێم کە شوێنم نەکەون، دەمکوژن.[٤٩]

پاشان کە پاپای ڕۆم هات ناسرابوو بە ئوسقووفی گەورەی ڕۆم، نامەکەی پێغەمبەری نیشاندا، دوای ئەوەی ئوسقووف خوێندییەوە لەناو مەجلیسەکەدا ڕاستەوخۆ وتی: سوێند بەخوا ئەو کەسەی کە ئەم نامەی ناردووە ئەو کەسەیە کە موسا و عیسا مژدەیان پێداوین کە چاوەڕوانی بکەین، ئەوکەسە خۆیەتی هیرەقل وتی: بەچی ئەمرو فەرمانم پێ دەکەیت؟!

ئوسقووف وتی: منیش دەزانم ڕاستە و حەقە، بەڵام ناتوانم وەکو تۆ بانگەشەی بۆ بکەم، خۆ ئەگەر وام کرد ڕۆم دەمکوژن.

پاشان (ئەزغاتر)[٥٠] کە ئوسقووفی گەورەیە ناوی (ئەزغاتر)ە ڕەحمەتی خوای لێبێت، بەئاشکرا لەناو خەڵکەکەدا ئیمانی بە پێغەمبەر هێنا و زۆر بە ئازایانە وتی (اشهد ان لا اله الاّ الله وان محمد رسول الله) لەبەرچاوی هەموویاندا و ئەوانیش هەموو لێی کۆبوونەوە و لەبەردەم

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٤٩ ـ (قال هرقل لدحية بن خليفة الكلبي والله إنِّي لأعلم أن صاحب نبي مرسل، وإنّه الذي كنا ننتظره، ونجده في كتابنا، ولكن أخاف الروم على نفسي، ولولا ذلک لاتبعته) إبن كثير.



هیرەقل دا بەچەقۆ و خەنجەرەکانیان کوشتیان و بەشەهیدی گەڕایەوە بۆلای خوای خۆی، یاخود دەڵێن بەلێدان شەهیدیان کرد[٥١].

هیرەقل نەیتوانی هیچ کارێک ئەنجام بدات، لەکاتێدا لەدوای قەیسەری ڕۆم گەورەترین کەسایەتی لەناو دەوڵەتی ڕۆمدا ئوسقووفی گەورەیە.

ئەو کەسایەتییەکی ئازا و بەجەرگ بوو، بەڵام هیرەقل لە پێناوی کورسییەکەیدا نەیتوانی بڕیار بدات، لاوازی کەسایەتی بۆ دەسەڵاتەکەی بە کافری هێشتییەوە، بەداخەوە ئەمە چیرۆکی ژیانی ئەبو جەهل و قەیسەری ڕۆم چەندەها ملیۆن خەڵکی ترە.

هیرەقل لەپێناوی دەسەڵاتەکەیدا وازی لە ئیمان هێنا لەبەر ژیانی دونیا وازی لە ژیانی قیامەت هێنا، بەڵام لەکۆتایی ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە ئیسلام ڕاستە و قورئان موعجیزەیە و پێغەمبەری خوا ﷺ حەقە و ڕاستگۆیە، هەموو بەڵگەن لەسەر خودی مرۆڤ بۆ هەڵبژاردنی دینەکەی، مرۆڤ خۆی ئازادە چی هەڵدەبژێرێت خوای پەروەردگار ڕێگای ڕێنمویی و هیدایەتی ڕۆشنکردۆتەوە، کێیە بەدەم ڕووناکییەکەوە دەڕوات و خۆی لە تاریکی ڕازگار دەکات.

خوای گەورە لە سوورەتی النمل دا دەفەرمووێت:

﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴿١٤﴾﴾

[النمل]

واتە: ئەوانە هەر ڕق ئەستووریان کرد و باوەڕیان پێی نەبوو، بە زۆرداری و خۆبەزلزانی، لە کاتێکدا لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد کە حەقیقەتەو ڕاستە، دە تەماشا بکەو سەرنج بدە بزانە سەرئەنجامی تاوانباران و گوناهکاران چۆن بوو.

هەروەها خوای پەروەردگار لە سوورەتی یونس دا دەفەرمووێت:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥١] ـ (لما استدعى الأسقف الكبير فعرض عليه هرقل رسالة رسول محمد ﷺ : فلما قرأ. قال: هو والله الذى بشرنا به موسى وعيسى الذى كنا نتظره. قال قيصر: فما تأمرنى؟ فقال الأسقف: أما أنا فني مصدقه و متبعهُ.

فقال قيصر: أعرف أنه كذلک، ولكن لا أستطيع أن أفعل، وإن فعلت ذهب ملكي وقتلني الروم.

وخرج صفاطر للرومان و دعا صيع الرومان الأيمان بالله وإلى الايمان برسول الكريم، وإعلن شهادة أمام الجميع، حيث قام الناس قفزوا عليه قفزة واحدة فضربوه، ولقي به شهيدا) (إبن كثير).



﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ۝١٠٨﴾ [يونس]

واتە: (ئەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی حەقیقەتتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، ئەوەی ڕێبازی هیدایەت بگرێتە بەر ئەوە (قازانجی) بۆ خۆیەتی و هیدایەتەکەی بۆ خۆی سوودمەندە، ئەوەش گومڕا بێت ئەوە گومڕاییەکەی لەسەری دەکەوێت، من لێپرسراو و چاوودێر نیم بەسەر کارو کردەوەی ئێوەوە.

لەدواییدا لەدوای یەقینی تەواوەتی تەنها بەوە کۆتایی هێنا چەند دیارییەکی بەدەحیەدا نارد بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئیتر بیری لە ئیمان و ئیسلامەتی نەکردەوە، لەگەڵ ئەوەی لە تەورات و ئینجیل دا خوێندبوویەوە کە پێغەمبەرێک لەو سەردەمەدا دێت.

لەدوای ئەو هەموو یەقین و دڵنیاییە بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، تەنانەت بێلایەنی هەڵنەبژارد بەڵکو سوپا لەدوای سوپا ئامادەیان دەکرد بۆ سەر پێغەمبەر و موسڵمانان.

لەکاتێکدا دەیانزانی لەناخەوە سەرکەوتن ئەستەمە بەسەر ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا، چونکە تەرەفی خوای پەروەردگارە و دڵنیابوون لە ڕاستگۆییان، لەگەڵ ئەو هەموو ئیحساسی و ڕاستییە چوونە تەرەفی شەیتان، دژی موسڵمان جەنگیان دەست پێکرد لەسەرەتای موئتە و تاگەیشتە بە جەنگی تەبووک، لەدوای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەیان جەنگیان لەگەڵ موسڵمانان ئەنجامدا لە فەلەستین، سوریا و لوبنان و تورکیا...هتد، لەگەڵ هەموو شکستەکانیان دا کەم کردنەوەی قەڵەمڕەویان، ڕۆژ بەڕۆژ ڕاستگۆیی زیاتری پێغەمبەریان بۆ دەردەکەوت، بەڵام خۆشی کورسی و دەسەڵات دیارە هیچ پێیناگات، بۆیە هیرەقل هەربەردەوام بوو لەسەر ئینکاری و بێباوەڕی.

ئەمە هەڵوێستی دەوڵەتی ڕۆم بوو، سەرەتا بە عووزر و بێ دەنگی، دوایی بە جەنگ و هێز و شەڕەنگێزی.

لەمێژوودا زۆر لەم ڕووداوانە دووبارە بوونەتەوە، زۆرێک لە سەرکردە و دەسەڵاتدار و پادشاکان زانیویانە کە ئایینی ئیسلام ڕاستە، زۆرێکیش لە پیاوانی ئایینی مەسیحی و جولەکە و ئایینەکانی تر دڵنیا بوون لە ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوا، بەڵام ئارەزوو و هەواو نەفس کوێری کردن و حەز و خۆشییەکانیان بەرەو لەناوچوونی بردوون.

خوای گەورە لە سوورەتی البقرة دا دەفەرمووێت:



﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۚ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْۚ وَمَن يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢١٧﴾ [البقرة]

واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی جەنگ لە مانگی حەرام دا (کە بریتین لە ذوالقعدة و دوالحجة و محرم و رجب) بڵێ: جەنگ لەو جۆرە مانگانەدا کارەساتێکی گەورە و هەڵەیەکی گەورەیە، بەرهەڵستی ڕێبازی خوا و بێ باوەڕییە پێی و (تاوانێکی گەورەیە) (جەنگ) لە مزگەوتی حەرام دا و دەبەردەرکردنی خەڵکەکەی زۆر گەورەترە لای خوا (لە کوشتنی کەسێك یا چەند کەسێك) زۆر هێنان بۆ ئیمانداران تا پاشگەز بکرێنەوە تاوانێکە لە کوشتن گەورەترە، (بێگومان بێ باوەڕان) بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتان لێ بکەن کە لە دین و ئایین تان پاشگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێت، جا ئەوەی لە ئایینەکەی پەشیمان ببێتەوە بە کافری بمرێت، ئەو جۆرە کەسانە کارەکانیان پووچ دەبێت لە دنیا و لە قیامەتدا، ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیای دا دەبەنە سەر.



# نامەکەی پێغەمبەر بۆ کیسرا (مەلیکی فارس)

ماکوان: پێغەمبەری خوا نوێنەری خۆی نارد بۆ دەوڵەتی فارس، ئەم دەوڵەتە لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆم دا جیهانیان دابەش کردبوو، هەڵوێستی ڕۆم بە دوو قۆناغدا تێپەڕی یەکەم عوزر و پاشان جەنگ، بەڵام دەوڵەتی فارس هەڵوێستی زۆر ڕوون و ئاشکرابوو، هەر لەسەرەتاوە کیسرا دژی موسڵمانان دوژمنایەتی ڕاگەیاند، لەیەکەم زانینیدا بڕیاریدا کە ئەم دینە بەتەواوەتی لەناوبەرێت، جەنگ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بکات، کیسرا ئەوەی پێ قبوڵ نەکرا کە ناوی خوا لەسەرەتاوە بنووسرێت و پاشان ناوی پێغەمبەر ئینجا ناوی کیسرا گەورەی فارس، نامەکە هاوشێوەی نامەکەی هیرەقلی ڕۆم بوو بەڵام بە هەندێك گۆڕانکاری کە گونجاو بێت لەگەڵ ئایینی زەردەشتی و مەجوس دا.

دەقی نامەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ



(نص يحكي رسالة الرسول ﷺ إلى كسرى ملك الفرس)

بسم الله الرحمن الرحيم من محمد رسول الله إلى كسرى عظيم فارس سلام على من اتبع الهدى وامن بالله ورسوله وشهد ان لا اله إلا الله وحده لا شريك له وانّ محمداً عبده ورسوله وأدعوك بدعاء الله فإني انا رسول الله إلى الناس كافة لأنذر من كان حياً ويحق القول على الكافرين فاسلم تسلم فان ابيت فان إثم المجوس عليك .



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ئەم ڕستەیە زۆر بەهێزە ڕاستەوخۆ کە ئەو ڕستەیەی خوێندەوە زۆر بەسەرەتایی و نەزانانە بەسەریدا ڕۆیشت و تورە بوو، وتی چۆن یەکێک لە ژێردەستەکانم ناوی خۆی پێش ناوی من دەنووسێت، زۆر بە لووت بەرز و خۆ بەزلزانیی نامەکەی لەناو دەستیدا لوول کرد و فڕێیدا.

کاتێک هەواڵەکە گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە نامەکەی لوول کردووە زۆر بەبێ ئەدەبی فڕێی داوە، فەرمووی: خوای پەروەردگار موڵک و دەسەڵاتی لوول بکات وەکو نامەکەی لوول کرد.[٥٣]

لەدوای چەند ساڵێکی کەم هەموو خاکی فارس کەوتە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئیسلامی، بەتەواوەتی ئیمپراتۆریەتی فارسیان شکست پێهێنا و دین و دەوڵەتیان لەناو چوو، ئەوەش هەواڵی ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوایە.

بەهەرحاڵ پاشای فارس کە ناوی (پەروێز) بوو، بەبێ ئەدەبی بەرامبەر نامەکەدا وەستایەوە، بەڵکو بڕیاریدا دەبێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەستگیر بکرێت و بە قۆڵبەستی ببرێت بۆ لای (خەسرەوی پەروێز) تا قۆڵەکەی لێبکاتەوە لەسەر ئەو نامەیە کە ناوی خۆی پێش ناوی ئەو نووسیوە.

## بڕیاری دەستگیرکردنی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن کیسراوە

ماکوان: پاشای فارس وەڵامی نارد بۆ حاکمی یەمەن کە بڕوات محەمەد دەستگیر بکات ئەوکاتە یەمەن ژێر دەستەی دەوڵەتی فارس بوو، کەسێکی فارس حوکمداری بوو بەناوی (سامانی کوڕی بازانی فارس)، یەمەن نزیکە لەشاری مەدینەوە بۆیە ئەوی ڕاسپارد کە دوو کەس بنێرێت، محەمەد بە دەستگیرکراوی بنێرێت بۆ کیسرا، ئەگەر تەماشای دەوڵەتی فارس بکەیت چەند بەچاوێکی سووک و بێ هیچ هەژماردکردنێک تەمەشای عەرەبیان دەکرد، تەنها دەڵێت دوو کەس بنێرێت بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەستگیر بکات.

چونکە پایتەختی دەوڵەتی فارس دوور بوو لە مەدائین، بۆیە وەڵامی بۆ یەمەن نارد کارەکە ئەنجام بدات، خۆ ئەگەر هاتوو پێغەمبەر ﷺ ڕەتی کردەوە بڕوات لەگەڵیدا ئەوە کیسرا سوپا دەکاتە سەری و خۆی و گەلەکەی لەناو دەبات.

ئەوەی کە کیسرا داوای کردبوو گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ، سامانی کوڕی بازان دوو کەسی نارد چوونە لای پێغەمبەری خوا و ئەویش پێشوازی لێکردن و پێی فەرموون تا

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٣] ـ (مزق الله ملكة مثلما مزق الكتاب).



سبەیێ بمێننەوە پاشان وەڵامتان ئەدەمەوە، هەر لەو شەوەدا کە فەرمانبەرەکانی دەوڵەتی کیسرا تێدا هاتبوون، شەوەکەی وەحی بۆ پێغەمبەر دابەزی بەهەواڵێکی زۆر سەیر و جێگای تێرامان کە هەر ئەو شەوە پادشای فارس بەدەستی کوڕەکەی خۆی کوژرا بەناوی (ئەنەوشێروان). ئەم ڕووداوە لە شەوی ۱۳ی جەمادی کۆتایی ساڵی ۷ی کۆچی ڕوویدا، کە ڕۆژ بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دایە هەردوو نوێنەر و فەرمانبەرەکانی دەوڵەتی فارس کە ئەم شەو خوای من خواکەی ئێوەی کوشت.

هەردوو نوێنەرەکە داچڵەکین: چونکە مەدائین بەدرێژایی هەزار کیلۆمەتر لەشاری مەدینەوە دوورە، دوو کەسەکە وتیان بە پێغەمبەر ﷺ تۆ دەزانی چی دەڵێیت؟!

ئێمە لەلایەن سامانەوە هاتووین لەسەر نامەیەک داوای دەستگیرکردنت دەکات بەڵام ئەم وتەیە کە دەڵێیت خواکەی من خواکەی ئێوەی کوشت، ئەمە زۆر سەختە ئایا دڵنیایت کە ئێمە سامانی کوڕی بازان بە وتەکەت ئاگادار بکەینەوە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەدڵنیاییەوە فەرمووی: بەڵێ بەدڵنیاییەوە ئاگاداری بکەنەوە بەوەی کە پێم وتن، نەکو هەر ئەوە بەڵکو بەسامان ڕابگەیەنن کە دینی ئیسلام دەسەڵات و توانای من هەموو دەسەڵاتی کیسرا دەبات بۆ خۆیی و کۆتایی دەسەڵاتی کیسراش ناو چاڵ و گۆڕە، هەروەها لە منەوە بە سامان ڕابگەیەنن ئەگەر موسڵمان بوو ئەوەی کە لەژێر دەسەڵاتیدایە لە یەمەن و مەملەکەتەکەی ئەیهێڵمەوە و با هەر حاکم بێت[٥٣].

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەجوانی مامەڵەی لەگەڵ هەردوو نوێنەرەکە کرد و هەندێک دیاری پێدان و بەڕێی کردنەوە بۆ شاری مەدینە.

لەدوای چەند ڕۆژێک هەردوو کەسەکە گەڕانەوە بۆلای سامانی کوڕی بازانی فارس و هەواڵ و قسە و وتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺیان ڕاگەیاند پێی، ئەویش پیاوێکی ئاقڵ و زیرەک بوو، جوان گوێی بۆ هەموو وشەکان گرت پاشان وتی:

---

[٥٣] ـ (وقتله ابنه نشيروان بن إبرويز، وكان هذا في ليلة الثلاثاء العاشر من الجماد الأخير ستة ٧هـ، ولما جاء البق الثاني بعث الرسول الى الرسولين... فقال لهم:- ان ربي قتل ربكم الليلة. قالا: هل تدرى ما تقول؟ إنا قد نقمنا عليك ماهو أيسر من هذا، أفنكتب عنک هذا، ونخبر الملک باذان؟! فقال الرسول ﷺ: نعم أخبراه ذاک عن.

وقولا له أيضا: إن دينى وسلطاني سيبلغ مابلغ كسرى وينتهى الى منتهى الخف والحافز، وقولا له:- إن أسلمت أعطيتک ماتحت يديک وملکتک على قومک).



سوێند بەخوا ئەم قسانە لە قسەی پادشا و مەلیک ناچێت، بەڕاستی من وای دەبینم ئەم کەسە پێغەمبەر بێت، چونکە کەس ناتوانێت قسەی وا بکات مەگەر پێغەمبەران بتوانن، چونکە دووری نێوان مەدائین و شاری مەدینە زۆر دوور و درێژە.

هەربۆیە چاوەڕوانی کرد بابزانین قسەکەی ڕاستە، هەواڵەکەیان ناردەوە بۆلای کیسرا ئەگەر کیسرا کوژرا بوو ئەوە ڕاستگۆیە و پێغەمبەرە خۆ ئەگەر وانەبوو بزانین کیسرا فەرمانی بەچی و داوای چی دەکات.

## حاکمی یەمەن بازان ئیسلام بوونی خۆی ڕادەگەیەنێت

لە ئەنەوشێروانی کوڕی خەسرەوی پەروێزەوە پادشای فارس وتاری پادشا و کیسرای خۆی ڕاگەیاند بۆ دەوڵەتی فارس وتاری نارد بۆ سامان کوڕی بازان کە لەمەودوا ئەو پادشایە هەروەها سامانی لەجێگای خۆیدا هێشتەوە.

بە ئاشکرا ئەنەوشێروان ڕایگەیاند کە باوکی خۆی کوشتووە لەسەر ئەوەی زۆرێک لە پیاو مەعقوولانی فارسی کوشتووە، بەڵکو خەریکە پیاوچاکانی فارس و ئەشرافەکانی هەموو لەناو دەچوون، ئەم هەواڵە گەیشتە سامان، کاتەکەی نیوە شەو بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنیشانی کردبوو، ئیتر دڵنیا و یەقینی بۆ درووست بوو کە ئەو کەسە پێغەمبەرە ئەوەی ئاگاداری کردەوە وەحییە، بۆیە بڕیاری موسڵمان بوونی خۆی داو بەدواییدا هەموو فارس و کوڕی بنەماڵەکەی لەگەڵ خەڵکی یەمەندا ئیسلام بوونی خۆیان ڕاگەیاند.

هەردوو نوێنەرەکەش موسڵمان بوون. هەموو ئەم ڕووداوانە ئایەتی ١٧ی سوورەتی الأنفال-مان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾﴾ [الأنفال]

واتە: کەوابوو ئەی ئیمانداران: وەنەبێت ئێوە کافرانتان کوشتبێت، بەڵکو خوا کوشتنی و لەناوی بردوون، تۆش ئەی محەمەد ﷺ کاتێک مشتێک خۆڵت روو بە کافران فڕێ دا ئەوکارە تەنها تۆ نەتکرد، بەڵکو خوا فڕێی داو (خۆڵی کردوە چاوی کافرانەوە) تا ئیمانداران تاقیبکاتەوە بە تاقیکردنەوەیەکی چاک، چونکە بەڕاستی خوا بیسەری (دووعا و نزایانە) و زاناشە (بە نیەتی دڵیان).

ئەم کەون و گەردوونە بە یاسایەکی (بەدیع) دەگەڕێت، پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد گەلی فارس موسڵمان بێت، بەڵام بەهۆکاری نامەکەی گەلی یەمەن موسڵمان بوون،



بەهەرحاڵ پادشا نوێکەی فارس هیچ بیرێکی نەکردەوە لەوەی کە بەشوێن نامەکەی پێغەمبەردا بڕوات، وەکو ئەوەی باوکی دەیویست بەم شێوەیە پەیوەندی نێوان هەردوو وڵاتەکە وەکو خۆی مایەوە تا سەردەمی ئەبو بەکری سدیق.

**نامەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ پادشای حەبەشە و پادشای بەحرین**

ماکوان: کاردانەوەی حەبەشە و بەحرین زۆر ئەرێنی بوو، پادشای حەبەشە (نەجاشی ئەصحیمەی کوڕی ئەبجەر) موسڵمان بوو بەڵام بە نهێنی و نەیتوانی ئیسلام بوونی خۆی لەبەر دەوڵەتەکەی ئاشکرا بکات، دەوڵەتێکی دینداری نەسرانی بوون، ئەگەر بهاتایە و بانگەوازی ئیسلامەتی بکردایە ئەوا ڕاستەوخۆ گەلی حەبەشە لەسەر کورسیەکەی دەیان هێنا خوارەوە و دەیانکوشت، لەبەر ئەوە ئیسلام بوونی خۆی شاردەوە بە ڕووکەش نەسرانی بوو بەڵام لەناخ و دڵ و دەروونیدا موسڵمان بوو، لەهەمانکاتدا هاوکارێکی زۆر باش بوو بۆ دەوڵەتی مەدینەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.



بەڵام پادشای بەحرین مونزیری کوڕی سارا -ڕەحمەتی خوای لێبێت- ڕاستەوخۆ بانگەوازی ئیسلامەتی کرد و هەموو گەلەکەی لەگەڵ خۆی موسڵمان بوون، مونزیر کەسێکی بەهێز و سەرکردەیەکی بەتوانا بوو، هەروەها لەناو گەلەکەیدا زۆر خۆشەویست بوو، عەرەب بەشێوەیەکی گشتی عەشایەر بوون شوێن سەرکردەکان دەکەوتن لە هەموو هەڵسوکەوتێکیدا، بەڵام نەجاشی نەیتوانی وەکو مونزیر بکات، بیروباوەڕی خەڵکەکەی بە ئاسانی بگۆڕێت.



# نامەی مقەوقیس مەلیکی میسر

ماکوان: وەڵام دانەوەی مقەوقیس وەڵامدانەوەیەکی پادشایانە بوو بۆ نوێنەرەکەی پێغەمبەر ﷺ (حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە) زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ کردن و چەندین دیاری بەنرخ و ڕێز و سێ کەسی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ماریا و خوشکی و ئامۆزایەکی بەدیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد، دەیزانی کە پێغەمبەرێک دێت لەو سەردەمەدا، بەڵام مقەوقیس پێی وابوو لە وڵاتی شامەوە دێت، وەکو باری دەروونی ئامادە بوون بۆ ئەوەی کە پێغەمبەرێک لەو سەردەمەدا دێت.

مقەوقیس بەوە کۆتایی هێنا و گرنگی نەدا بە بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ و حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعەی بەدیاری بەڕێ کرد، نە بیری لە جەنگ کردەوە لەکاتێکدا هێزی دەوڵەتی میسر چەندین جار ئەوەندەی هێزی مەدینە بوو، بەڵام دڵنیایی بەخشی کە دەوڵەتی مەدینە دەوڵەتە و ئیعترافی پێ کرد، لەکۆتاییدا هیدایەت لای خوای پەروەردگارە.

نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەلیکی یەمامە

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ هەوزەی کوڕی عەلی خاوەنی یەمامە، ئەو زۆر براگماتیکی و بەرژەوەندییانە بیری کردەوە، دەیزانی دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ قەڵەمڕەوییەکەی ڕۆژ بەڕۆژ لەبەر فراوانیدایە، بیری لە موسڵمان بوون نەکردەوە، بەڵام هەستی بەهێزی دەوڵەتی ئیسلامی کردووە، بۆیە بڕیاریدا دانوستان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا بکات پاشان ئەویش نامەیەکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ناردەوە، لەنامەکەدا دەڵێت ئەوەی کە داوای دەکەیت بانگەوازێکی جوان و چاکە، هەندێک لە موڵکی زیاتری عەرەبم پێ ببەخشە باشوێنت بکەوم.

هەوزە تەنها داوای دەسەڵاتەکەی خۆی نەکردەوە بەڵکو زیاتری دەوێت، دەیویست لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کڕین و فرۆشتن بکات، واتا موسڵمان بوونی خۆی بە مەرج دەبەستەوە، تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی ئەوەی کردەوە، کە فەرمان و دەسەڵاتی حوکمڕانی بداتە دەستی کەسێک کە داوای دەکات.

تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند دەخوات لەسەر ئەوەی کە هەر کەس داوای ئەمیرایەتی و کاری حوکمڕانی بکات هەرگیز نایدرێتێ.[٥٤]

---

[٥٤] ـ (إنا والله لا نولي على هذا العمل احد سأله، ولا أحدا حرص عليه) صحيح البخاري.



پێغەمبەری خوا ﷺ مەنعی ئیمارەتی دەکرد لە هەرکەسێک کە داوای بکردایە، لەبەر ئەوەی دەیزانی ئەوەی بەدوای دەسەڵاتەوە بێت مەفتونە بۆی لە پێناوی کورسی و دەسەڵاتەکەی ئەدات، جا لەبەر ئەوە لەپێناوی ئیسلام کار ناکات، لە پێناوی دەسەڵات و کورسیەکەی واز لە ئیسلام دەهێنێت و شوێن هەوا و ئارەزووەکانی دەکەوێت، خۆ ئەگەر هاتوو گەل و هۆزەکەش شوێنی کەوتن ئەوەندەی تر کارەسات ڕوودەدات، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دووپاتی کردەوە هەڵوێستەکەی هەوزەی کوڕی عەلی فەرمووی: ئەگەر داوای یەک پارچە زەویم لێ بکات نایدەمێ.[٥٥]

پاشان فەرمووی مولکی هەمووی دەڕوات و بەرباد دەبێت[٥٦]

بەدڵنیاییەوە وتەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتە دی هەوزە مرد و لەدوای خۆی مولکی نەگرتە دەست, هەموو ئیسلام بووە خاوەنی، بەڵام لەلایەکی ترەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی مەلیکی عومانی کرد بەناوی جەیفەر و عەبد، هەردووکیان موسڵمان بوون لە جێگای خۆیاندا مانەوە، دوو برا بوون ئەو دەوڵەتەیان فەرمانڕەوایی دەکرد, ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت.

نامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەمیری دیمەشق

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ (حارسی کوڕی ئەبو شەمری غەسانی) ئەمیری دیمەشق بووە, شوێنکەوتووی وڵاتی ڕۆم بوو، خۆی کەسێکی نەسرانی و مەسیحی بوو.

وەڵام و بەرپێچدانەوەی هاوشێوەی کیسرا بوو، نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺی فڕێدا و وتی ئەوەی مولکەکەم لێ وەردەگریتەوە من بە سوپاوە دەچمە سەری جەنگی لەگەڵ دەکەم، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی سوپا بۆ ئەوەی شاری مەدینە داگیر بکات، چونکە ژێردەستەی هیرەقل بوو, ئەویش پێش دەرچوونی ویستی پرس و ڕا بە هیرەقل بکات و نامەی بۆ نارد، هیرەقل داوای لێ کرد کە چاوەڕێ بکات، گەیشتنی نامەی هەردووکیان لە یەک کاتدا بووە، ئەویش سوپای نەنارد بڵاوی بە سوپاکەی کرد، کە هەواڵ درایە پێغەمبەری خوا ﷺ کە چۆن ڕەفتاری کردووە نامەکەی فڕێداوە, پێغەمبەر ﷺ فەرمووی مولکی هەموو بەردباد بوو, لەناوچوو. (باد ملکه).

---

[٥٥] ـ (لو سألني قطعة من الأرض مافعلت).

[٥٦] (باد وباد مافي يديه).



پێغەمبەری خوا ڕاستی فەرموو دوای چەند مانگێک مرد و موڵک و سامانی بەردبارد بوو، هەمووی بووە موڵکی موسڵمانان.

ئەو نامانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاراستەی ئەو پادشا و دەسەڵاتدارانەی کرد بەم شێوەیە کاردانەوەی لێ کەوتەوە لە جیهاندا، هەر یەکە و بەجۆرێک بەرخوردی لەگەڵدا کرد، هەیان بوو بەبێ دوودڵی موسڵمان بوون، هەبوو ڕێزی پێغەمبەری گرت و بەڵام موسڵمان نەبوو، هەیانبوو ڕەتی ئیسلامی کردووە، هەبوو بانگەشەی جەنگی کرد.

لێرەدا وانەیەک فێر دەبیت لە سەر بانگەوازخوازان واجب نییە دڵی هەموو خەڵکی هیدایەت بدەن، بەڵکو واجبە لەسەریان کە بانگەوازی ئیسلامی بەجوانی پاکی بگەیەنێت و هیچی تێکەڵاو نەکەیت لە هەوا و ئارەزوو نەفسی خۆت، خوای گەورە هیدایەتی هەموو خەڵکی ئەدات بۆ ئیمان، هەروەها دەزانێت کێ وەریدەگرێت و کێش ڕەتی دەکاتەوە، لە سوورەتی المائدة دا دەفەرمووێت:

﴿مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾﴾ [المائدة]

پێغەمبەر تەنها ڕاگەیاندنی پەیامی خوای لەسەرە، خوا دەزانێت بەوەی کە دەری دەخەن، بەوەش کە دەیشارنەوە.

بەدڵنیاییەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازەکەی گەیاند بە باشترین و جوانترین شێوە.



## شیکارییەک بۆ سەفیر و نوێنەرەکانی پێغەمبەر ﷺ

ماکوان: ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەم نوێنەرانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەیەکی زۆر گەورەیە بۆ نەهێشتنی هۆزگەرایی و عەشیرەتبازی و بەهێزکردنی لایەک و لاکانیتر لاواز بێت، بەڵکو پێغەمبەری خوا ... دەیویست دەوڵەتەکەی هێزی دەزگایی ببێت دوور بێت لە هێزی عەشیرەت و هۆز و نەتەوەی عەرەب، بۆ نموونە بیلالی حەبەشی بەرپرسی بەیتولمالی پێغەمبەر بووە، بەتێگەیشتنی ئەمڕۆ وەزیری دارایی بووە، سەلمانی فارسی و سەعد کوڕی موعاز هەموو ئەمانە ڕاوێژکاری سەربازی و هەموو مەجلیسی عەسکەری بوون.

سوهەیبی ڕۆمی و جابانی کوردی، زیاتر لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لەدوای ساڵی ٧ی کۆچی گرنگیان دا بە بازرگانی و بووژاندنەوەی ئابووری لەگەڵ بازرگانەکانی ناو شاری مەدینە و پاشانیش مەککە.

هەروەها ئەم سەفارەتانە هەموو لەسەر بنەمایەکی بەهێز و دوورکەتنەوە لەوە کە لایەک بەهێز بکرێت و لایەکیتر لاواز، هەموو لاکان بەشدارن و هەمووی دەوڵەتی ئیسلامی بە دەوڵەتی خۆی دەزانێت، حیکمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەڵبژاردنی ئەو نوێنەرانە.

یەکەم: پێغەمبەری خوا لەیەک هۆز و عەشیرەت هەڵینەبژاردن، بەڵکو زۆر لەناو هۆزەکاندا هەڵیبژاردن و واتا هەمەچەشنەی ناو هۆزەکان بوون.

لە عەشیرەتی (ضمرة) عەمری کوڕی ئومەییەی هەڵبژارد، بۆ لای نەجاشی لە عەشیرەتی (حضرموت) یاخود ناوچەی حەزرەمەوت، عەلای کوڕی حەزرەمی هەڵبژارد بۆ لای مونزیری کوڕی سارا.

لەناو بەنی سەهم و (بنی سهر) عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهمی هەڵبژارد بۆلای کیسرا.

لەناو (بني كلب) دحیەی کەلبی هەڵبژارد بۆلای قەیسەری ڕۆم لەناو بەنی نەزم (بني نضم) حاتەبی کوڕی ئەبو بەڵتەعە بۆ لای مقەوقس.

لەناو بەنی عامر (بني عامر) سەلیتی کوڕی عەمری هەڵبژارد بۆ هەوزەی کوڕی عەلی لە یەمامە.



هەروەها شوجاعی کوڕی وەهبی هەڵبژارد لە بەنی ئەسەد (بني أسد) بۆلای مەلیکی دیمەشق حارسی کوڕی ئەبو شەمر.

ئەم جیاوازییە لەناو نوێنەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی ڕوون و ئاشکرا بوو لە دانانیان بۆ ئەوەی هەموو لایەک بزانیت ئەم دەوڵەتە قورەیش بەتەنها خاوەنی نییە، یاخود لە شاری مەدینە دایە خەڵکی مەدینە دەستناگرن بەسەر هەموو جومگەکانی دەوڵەتدا, لەلایەکی ترەوە دەبێت هەموو لایەک ئەوە بزانێت بانگەوازەکە تایبەت نییە بە هۆز و لایەنێک هەموو بەشدارن تێدا.

ئەمانەی هەڵیبژاردوون هیچیان ڕۆژێک لە ڕۆژان هیچ پۆست و پلەیەکیان نەبوو لەناو عەرەبدا بەڵکو هەموو هۆز و عەشیرەتی بچووک بوون.

ئەوەی لەمەودواوە موسڵمانان کۆدەکاتەوە پەیوەندی بیروباوەڕە نەک هۆزگەرایی.

دووەم: لەناو ئەم نوێنەرانەدا هەڵبژاردەی قورەیشی تێدانییە، هەموو دەرەوەی قورەیش تەنها یەک هاوەڵ نەبێت لە تیرەی زۆر دوورە بەڵام بنەڕەتی قورەیشە ئەویش عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهمییە.

هەموو نوێنەرەکانی تر لە دەرەوەی قورەیشن، ئەمەش ئاماژەیەکی ترە بۆ ئەوەی کە خاوەنی توانا و هێز و بەڕێوەبردنە خەڵکی هەرجێگایەک دەتوانێت کاری خۆی بکات، ڕاستە قورەیش خاوەنی مێژوو و ناووبانگە لەناو عەرەبدا و خاوەنی نەسەبی گەورەیە و لەناو جیهاندا ناسراوە، بەڵام ئەگەر هەر قورەیش هەڵبژێرن ئەی هۆزەکانی تر و خەڵکە تواناکانی چۆن بێ بکەن؟

ئەمەش واتایەکی زۆر گرنگی هەیە ناکرێت تەنها دەسەڵات لە دەوڵەمەند و خاوەن هێزەکان بێت، دەبێت هەژارانیش بەشداری تێدا بکەن و لاوازەکانیش بزانێت کە بەشێکن لەو کیان و دەسەڵاتە.

سێیەم: نەبوونی هیچ نوێنەرێک لە هۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ (بەنی هاشم)، لە هەمانکاتدا لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ناکرێت پێغەمبەری خوا (د.خ) پلە و پایە و پۆست بەسەر کەس و کار و خزمەکانی خۆیدا دابەش بکات، ئەوانی تر هەموو خزمەتکاری هۆز و عەشیرەتی خاوەن دەسەڵات و سەرۆک بن، ئەو تەمەشای بەرژەوەندی ئوممەت دەکات، نەک بەرژەوەندی عەشیرەت و هۆزەکەی، هیچ گرنگی نادات بەخێزان و خانەوادەی لێرەدا تەنها و تەنها گرنگی دەدرێت بە ئیسلام و بانگەوازەکەی، لەو سەردەمەدا هەڵبژاردەی سەفیر بۆشتێکی زۆر گەورە بووە.



چوارەم: هەموو ئەو نوێنەرانەی هەڵبژێراون و هیچیان لە ئەنسار نەبوون، بەڵکو هەموو لە موهاجیرەکان بوون، زۆر بەدەگمەن دەبینرێت کە ئەنسارییەک پۆستی وەرگرتبێت، دوو هۆکاری تێدا دەبینم:

هۆکاری یەکەمی دەگەڕێتەوە بۆ درووشم و نیشانەی بەخشینی ئەنسار کە هەمیشە پشت و پەنا و داڵدەی موسڵمانان بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەویست ئەو بەها گەورە و ئەو پلە و پایەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوون لەناویاندا ون بێت، خوای گەورە لە سورەتی الحشردا دەفەرموێت:

﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٩﴾ [الحشر]

واتە: ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادەکرد بۆ پێشوازی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆلایان و لە دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودییەک و بەخیلییەک نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە و بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەسکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژار و نەداریشن جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئائەوانە هەر سەرفرازن.

ئەو بەخشینە بۆ ئەوەیەکە تا ڕۆژی قیامەت خەڵکانێکی تر لاساییان بکاتەوە ئەوان لە دنیای خۆیاندا هەر دەیان بەخشی، هەرگیز بەدوای وەرگرتنەوە نەبوون، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ تا وەفاتی ئەویش خۆی بەخشی بەشاری مەدینە و لە شاری مەدینەدا مایەوە، ئەگەرچی خۆشەویستی شاری مەککە لە دڵی دابوو، خۆی خەڵکی ئەو شارە بوو یادگاری زۆری تێدا بەجێ هێشت.

تەنانەت خەڵکانێک لە شاری مەدینە داوای پۆست و کاری حوکمڕانی ان دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری دەکردن کەوازی لێ بهێنن، بۆ ئەوەی لە دوای مردنی پێغەمبەر ﷺ نیشانەی بەخشین تێیاندا بمێنێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو چاوەڕێیانم لەسەر حەوز و کانی لە ڕۆژی قیامەتدا.[٥٧]

ئەم ئیمتیازە هیچ کەس نەبووە بە خاوەنی تەنها ئەنسار نەبێت.

---

[٥٧] ـ (ستلقون بعدي أثرة فاصبروا حتى تلقوني على الحوض).



ئەمەش مانای وانییە کە موهاجیرەکان بەشوێن پلەوپایە و ئیماراتەوە بوون، نەخێر بەڵکو ئەوان هەموو دونیای خۆیان فرۆشت بۆ قیامەتیان و لە پێناوی ئەم دینەدا درێغییان نەکرد.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر موهاجیرەکان سەفیر و نوێنەر بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە پلە و پایەکی زۆر گەورەیە، لەهەمان کاتدا زۆر ترسناک و سەختە، لە هەر دەقە و ساتێکدا خاوەنەکی ئامادەیە بۆ کوشتن، وەکو چەند سەفیرێک گیانیان لە دەستدا، نموونەی (حارسی کوڕی عومەیری شەرحەبیلی کوڕی غەسانی)[٥٨] کە هۆکاری جەنگی موئتە لەسەر ئەوان بوو.

موهاجیرەکان زۆر زۆر بوون ڕۆژ بەڕۆژ ئەنسار کەم دەبوویەوە، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ئەنسار ئەوەندە کەم دەبێتەوە وەکو خوێ بۆ ناو خواردن چەند بەکاردێت ئەوەندە کەم دەبن.[٥٩]

هۆکاری دووەم: بۆ ئەوەی نەبێتە عورف و عادات و لاسایی کردنەوە مادام پایتەختی ئیسلام مەدینەیە دەبێت هەموو دەسەڵاتدارەکانی لەو شارەبن.

یاخود خەڵکی واهەست بکەن کە قیاداتی ئەنسار واجبە ئەگەر نەمان کێ جێگایان بگرێتەوە، کە لە دونیای ئەمڕۆدا وجوودیان نەماوە لەسەر زەویدا لە پشتیانەوە، واتا لەناو شاری مەدینەدا نابینی نەسەبێکی دیاری ئەوس یان خەزرەجی لە نەوەی ئەنسار، کەواتە ئەنسار هەمیشە پشت و پەنای موهاجیرەکان بوون هەروەکو سەعدی کوڕی عوبادە: بە موهاجیرەکان لە باخچەی سەقیف دەفەرمووێت ئێوە ئەمیر و ئێمەش وەزیر.

بەواتای وەزارەتی ئەمڕۆ نا، بەڵکو بەواتای هاوکاری و داڵدەدان.

پێنجەم: هەموو نوێنەر و هەڵبژاردەکان خەڵکی بەتوانا و خاوەن زمان پاراو و تێگەیشتنی قووڵیان هەبووە، هەموو خاوەن بەرپرسیارەتی بوون ئاگاداری ڕووداوەکانی جیهان بوون، هەروا بە ئاسانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پۆستەی پێنەبەخشیبوون، لەکاتی قسەکردنیاندا دەیانزانی چ وشەیەک بەکار دەهێنن.

ئەم قۆناغەش کۆتایی هات بە عیزەت و سەربەرزی و هێزی نوێی موسڵمانان پەیوەندی و هاتنە ناوەوەی هەزارەها خەڵک و چەند دەوڵەتێک بۆ ناو ئیسلام، هێزی ئیسلام ڕۆژ بەڕۆژ پەرەی دەسەند، ئینجا کاتی هەڵدانەوەی ئەو مەلەفە (فایلە) کۆنانەیە کە کاتی خۆی دژی موسڵمانان ئەنجام دراوە.

---

٥٨ ـ الحارث بن عمير شرحبيل ابن غسان.

٥٩ ـ (الناس يكثرون ويقل الأنصار حتى يكونوا في الناس كمنزلة الملح في الطعام).



# هەڵدانەوەی مەلەفی خەیبەر

ماکوان: لەدوای ئەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە دوای مانگێک لە گەڕانەوەی حودەیبییە نامەی نارد بۆ پادشاکانی جیهان و بۆ ناساندی ئایینی ئیسلام و دەوڵەتی نوێ، لەدوای ڕێکخستن و ناردنی نوێنەرەکانی بۆ وڵاتانی جیهان پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ مەلەفی خەیبەری هەڵداوە، خەیبەر ناوچەیەکە لە نیوەدوورگەی عەرەبی کە زۆرترین کۆمەڵگای جوولەکە لەم ناوچەیەدا دەژین بریتی بوو لە ناوچەیەکی ئاوەدانی و پڕ باغ و باخات و ئاو و سەرچاوەی ڕووبار و چەم، تەنانەت لە هاویندا یەهوود لەو ناوچەیەدا ئاوی دەهێشتەوە وەکو بەنداوێک، ناوچەکە بریتی بوو لە شارێک کە پێکهاتبوو لە ١٢ قەڵای گەورە کە نزیکەی ٥ هەزار یەهوود لەو جێگایەدا دەژیان.

مەلەفی خەیبەر و یەهوود بەگشتی مەلەفێکی ڕەش و پڕ کارەساتە پڕە لە ژەهر و بۆگەنی, جا ئەگەر لە ئاشتیدا بن یاخود لە جەنگدا، لەهەردوو حاڵەتەکەدا یەهوود ئەمانی نییە و هەمیشە خەریکی کاری قێزەونە دژی موسڵمانان، لەپێشتردا لە شاری مەدینەدا ئەزموونمان هەیە لەگەڵ بەنی قەینوقاع و بەنی قووڕیزە، یەهوود سروشتیان پڕە لە خیانەت، بنەڕەتی مامەڵەکردنیان لە سەربنەمای خیانەتە، هەروەها درووستکردنی گومان لەسەر دینی ئیسلام، هەوڵدانی درووستکردنی فیتنە و ئاشووب لە نێوان موسڵماناندا بە هەمیشەیی، لە کۆتاییدا هەوڵدانی جەنگ لەگەڵ موسڵماناندا کە بەشکستی سێ هۆزە جوولەکە کە کۆتایی هات دوودانەیان بەدەرکردن و کوشتنی هەموو پیاوانی بەنی قورەیزە.

لەناو نیوەدوورگەی عەرەبیدا گەورەترین سەری فیتنە و خراپەکاری جەنگ و ئاشووب لە خەیبەرەوە سەرچاوەی دەگرت، هەروەها لە چواردەووری خەیبەر ناوچەی تری یەهوود هەبوون کە بریتیبوون لە (تەیما و فەدەک) لەناو دۆڵێکدا کە پێی دەوترا (وادي القرى) ئەمەش گەورەترین کۆمەڵگای یەهوودی بوون، هێزیان زۆر زیادی کردبوو دوای ئەوەی یەهوودی مەدینە لە بەنی نەزیر چووبووونە ناویان. پێشتر زانیمان مامەڵەی یەهوود لەگەڵ پێغەمبەر [illegible] دا هەمیشە لە خیانەت و غەدر و پیلانگێڕی دابوون یەک لەدوای یەک، یەهوودی خەیبەر هەموویان وەکو یەهوودەکانی مەدینە وابوون. بەڵکو زۆر زیاتر دژایەتی پێغەمبەر و دەوڵەتەکەیان دەکرد.

لەڕاستیدا گەورەترین خیانەت و کارەسات کە ڕووبەڕووی ئیسلامیان کردووە، ئەویش جەنگی ئەحزاب بوو کە هەموو هۆزەکانی عەرەبیان کۆکردەوە بۆ لەناوبردنی موسڵمانان، زیاتر



لە ٢٠ سەرکردەی گەورەی خەیبەر بەشداربوون و وەفد بوون بۆ کۆکردنەوەی قورەیش و غەطەفان... هتد، لەگەڵ هەندێک لە سەرکردەکانی بەنی نەزیر.

بە پەیوەندی سیاسی و سەربازییەوە نەوەستان بەڵکو پارە و سەروەت و سامانیان بەخشی بەو سوپایە بۆ لەناو بردنی موسڵمانان.

ئاشکرایە کە هۆزی غەتەفان هەموو مورتەزیقەن بە پارە جەنگ دەکەن، خەیبەر نیوەی سامانی بەروبوومی بەخشییە ئەو سوپایە کە بریتی بوو لە ١٠ هەزار سەرباز، ئەگەر لوتف و کەرەمی خوای گەورە نەبووایە بەدڵنیاییەوە موسڵمانان هەموو بەتەواوەتی لەناو دەچوون.

یەهوودی خەیبەر تەنها بەوە نەوەستان بەڵکو هەمیشە لەگەڵ دووڕووەکانی شاری مەدینەدا خەریکی کاری جاسووسی و پیلان و فیتنە دروست کردن بوون، گەیشتە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیرۆر بکەن، بێجگە لەوەی کە هەمیشە لە پەیوەندی سەربازیدا بوون لەگەڵ سوپا مورتەزیقەکانی عەرەب بۆ لێدانی موسڵمانان.

هەموو ئەو کارە قێزەونانەیان پێویستی بەوە بوو کە موسڵمانان هەڵویستی لەسەر وەربگرن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو مەلەفەی دواخست، تا توانی پەیمانی حودەیبییە مۆر بکات, چونکە پێغەمبەر دەترسا کە بڕواتە سەر خەیبەر قورەیش لە دواوە هێرش بەرێتە سەر شاری مەدینە. ئەم ترسە لە جێگای خۆیدا بوو، ئەگەری ئەوە هەبوو جارێکی تر هەموو هۆزەکانی عەرەب کۆببنەوە و هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە.

پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەویست شاری مەدینە بەجێ بهێڵێت بێ سەرباز و سوپا، بۆیە مەلەفەکەی دواخست و دەیزانی یەهوودی خەیبەر بەهێزن لە چەک و خواردن و هەروەها سوپاشدا, جەنگ کردن لەگەڵ ئەو هێزە هەروا ئاسان نییە، بۆیە بەدوای هەلێکدا دەگەڕا وا هەلەکە نزیک بۆتەوە.

## هۆکاری فەتحی خەیبەر

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی فەتحی خەیبەر بکات، بەدوای هەلدا دەگەڕا، چاوەڕوانی کاتێکی گونجاوی دەکرد، کاتە گونجاوەکەش دوای سوڵحی حودەیبییە بوو بە تەواوەتی ڕەوشەکە لەبەرژەوەندی موسڵمانان بوو.

کاتێک لایەنی قورەیشی هێور کردەوە پەیمانی لەگەڵ بەستن بۆ ١٠ ساڵ ئاگر بەست, ڕاستەوخۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دوای مانگێک خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگی خەیبەر بەپەلە سوپای ئامادەکرد، لە مانگی موحەڕەمی ساڵی ٧ی کۆچی سوپای بردە سەر خەیبەر ئەم خێراییەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامانجی تایبەتی خۆی هەبوو.



یەکەم ئامانج: پاراستنی کەرامەتی ئوومەتی ئیسلامی و دەوڵەتەکەی بوو، دەیویست کە ڕەد ئیعتبار بۆ ئوممەت و دەوڵەتەکەی بگەڕێنێتەوە، تۆڵەسەندنەوەی کەرامەتی خەڵکەکەی دوانەکەوێت، یەک ساڵ چاوەڕوانی کرد ئێستا کاتی گونجاوە بۆ وەرگرتنەوەی تۆڵەی ئەو هەموو خراپەکاری و کارە گەندەڵییەی کە یەهوود ئەنجامی دابوو دژی موسڵمانان.

ئامانجی دووەم: پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ متمانەی تەواوی نییە بە قوڕەیش، دەیزانی ئەوان گەلی خیانەت و غەدرکردنن، بۆیە پەلەی کرد تاوەکو قوڕەیش بیر لە پیلان و خیانەت و غەدرکردن نەکاتەوە پێش هەنگاو هەڵهێنانەوەیان لە دوای سوڵحی حودەیبییە چارەسەری فیتنەی یەهوود و خەیبەر بکات، هەروەها یەهوودیش دەیزانی کە موسڵمانان بیر لە هێرشکردن دەکەنەوە بۆ سەر یەهوودی خەیبەر، بۆ ئەوەی پێش ئەوەی یەهوود خۆی ئامادە بکات پێغەمبەرصَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ بڕواتە سەریان و جەنگیان لەگەڵدا بکات.

ئامانجی سێیەم: گرنگترین پەیام بوو بۆ ئەو موسڵمانانەی لە ڕووی دەروونییەوە پێشتر ڕووخا بوون بە هۆکاری صوڵحی حودەیبییە، پەیامەکەش ئەوەیە کە هۆکاری سوڵح و پەیمانی حودەیبییە ئامانجی هێرش کردنە سەر خەیبەری لە پشتەوە بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ دەیویست هەموو لەوە تێبگەن، دڵنیایان بکاتەوە کە گەورەترین فەتحەو فەتحی خەیبەر نزیکە، بۆ بەرزکردنەوەی مەعنەویاتی هاوەڵان سوپاکە تەنها لە خەڵکی حودەیبییە پێکهاتبوو.

ئامانجی چوارەم: دەستکەوتی سەروەت و سامان و غەنیمەی گەورەیە لە دوای سوڵحی حودەیبییەوە کە خوای گەورە پێی بەخشین و لە دوای دابەزینی سوورەتی (الفتح) هەندێک لە ئایەتەکانی لەدوای پەیماننامەی حودەیبییە دابەزی خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأۡخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمۡ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيۡدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمۡ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَيَهۡدِيَكُمۡ صِرَٰطًا مُّسۡتَقِيمًا ۝٢٠﴾ [الفتح]

واتە: خوا بەڵێنی دەستکەوتی زۆری داونەتێ، لە ئایین دەدا دەستتان دەکەوێت و وەری دەگرن، بەڵام جارێ ئێستا هەر ئەوەی پێ بەخشیوون (مەبەست دەستکەوتەکانی خەیبەرە) دەستی خەڵکیشی لێ کۆتا کردن (مەبەست قوڕەیشە کە بەهۆی ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەوە خوای گەورە لە بەگژاچوونی موسوڵمانان دەستی بەستنەوە)، تا ئەم دەستکەوت و سەرکەوتنە ببێتە نیشانە و بەڵگەیەکی بەهێز بۆ ئیمانداران (کە خوا یار و یاوەر و پشتیوانیانە)، هەروەها ڕێنموونیتان بکات بۆ ڕێبازی ڕاست و دروست (لە بەرەو پێش بردنی بانگەواز دا).

ئەم غەنیمەت و دەستکەوتانە هەموو مەبەست پێ خەیبەر بوو.



چونکە لە دوای سوڵحەکە تەنها ڕووداوەکە ڕوویدا خەیبەر بوو کە زۆرترین سامان و موڵک چووە سەر موڵکی موسڵمانان.

خۆ ڕزگارکردن لە مونافیقەکان

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ لە خیانەتی دووڕووەکانی شاری مەدینە دەترسا، مونافیقەکان مامەڵەیەکی زۆر باشیان هەبوو لەگەڵ یەهوود دا، هەمیشە لە پەیوەندیدا بوون، پەیوەندییەکان لەسەرەتاوە بەهێزبووە لەگەڵ بەنی قەینوقاع و بەنی نەزیر و بەنو قوڕیزە، بەدڵنیاییەوە ئێستا پەیوەندی بەهێزیان هەیە لەگەڵ خەیبەر.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست بەهیچ شێوەیەک مونافیق لەگەڵیدا دەرنەچێت بۆ جەنگ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا ئەوەی کە لە سوڵحی حودەیبییە لەگەڵیدا بوو، تەنها ئەوانە دەربچن بۆ جەنگ، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەتوانی بڵێت تۆ مونافیقی دەرناچی لەگەڵمدا، بۆیە بەهێزی حودەیبییە سوپای پێکهێنا کە بریتی بوون ١٤٠٠ کەس کەواتە ئەوانەی کە بەشداری دەکەن لە جەنگی خەیبەردا ئیمانداری ڕاستەقینەن خوای پەروەردگار لە هەموویان ڕازی بووە، موسڵمانانی سەر ڕاست و خواناسن.

﴿۞ لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ١٨﴾ [الفتح]

واتە: بەڕاستی خوا ڕازیی و خۆشنوودە لەو باوەڕدارانەی کە پەیمانیان دایتێ (ئەی پێغەمبەر! ﷺ) لە ژێر درەختەکەدا، خۆی ئاگادارە بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە (لە نیازپاکیی و دڵسۆزیی) بەو هۆیەوە ئارامیی و هێمنیی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەریان و پاداشتی بە (مژدەی) سەرکەوتنێکی نزیك داناوە.

ئەم ١٤٠٠ سەربازە دەرچوون بۆ جەنگ، هەرکاتێک سوپای موسڵمانان خاڵی بوو لە مونافیق سەرکەوتن بەدەست دەهێنن، ئەگەر لە پێناوی خودا جەنگیان کرد خوای گەورە سەرکەوتنیان پێ دەبەخشێت، لەگەڵ ئەوەی سوپای موسڵمانان زۆر گەشبین بوو بەسەرکەوتن، بەڵام هێزی یەهوود چەند جار زیاتر بوو لە هێزی موسڵمانان لە ڕووی سەرباز و چەک و خواردن، بەڵام بە گیانی سەرکەوتن و ڕۆحی جیهادی بۆ مردن خۆیان ئامادە کرد، کە موسڵمانان بە ئیمان جەنگی کرد ژمارە هیچ بایەخی (ئەرزشی) نییە، خوای گەورە لە سوورەتی البقرة دا دەفەرمووێت:



... ٱللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن
... غُرْفَةًۢ بِيَدِهِۦۚ فَشَرِبُواْ مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ
... ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ
... بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ [البقرة]

واتە: ئینجا تاڵوت سەربازانی جیاکردەوە و پێی وتن (وا ئێمە دەڕۆین) (بەڵام) خوا (لە ڕێگوزەرماندا) تاقیمان دەکاتەوە بە ڕووبارێك (دوای ماندوبوون و تینوویەتی) جا ئەوەی تێر لێی بخواتەوە (ئەوە سەربازی) من نییە و (بگەڕێتەوە) وە ئەوەی جگە لە لویچێك زیاتر ناخواتەوە (ئەوە سەربازی) منە و (دەپەڕێتەوە و دەڕۆین)، )جا لەگەڵ ئەو ڕوونکردنەوەیەشدا) زۆربەیان (لە ئاوی ڕووبارەکەیان) خواردەوە کەمێکیان نەبێت. کاتێك کە پەڕینەوە خۆی و ئەوانەی باوەڕدار بوون لە تەکیا (گەلێکیان) وتیان: ئەمڕۆ (زەحمەتە بەم ژمارە کەمەوە) دەرەقەتی جالووت و سەربازانی بێین، (بەڵام) ئەوانەی کە دڵنیابوون بە خزمەتی پەروەردگاریان دەگەن وتیان: (مەترسن) چەندەها جار دەستەی کەم، زاڵ بووە بەسەر دەستەی زۆردا بە فەرمانی خوا، خوا یار و یاوەری خۆگر و ئارامگرانە.



# هاوپەیمانی مونافیق و یەهوود و غەطەفان دژی موسڵمانان

سوپای موسڵمانان دەرچوون هەروەکو پێغەمبەری خواصَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ پێشبینی کردبوو، خێرا دووڕووەکان وەڵامیان نارد بۆ خەیبەر، کەوا پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بە سوپاوە دەچێتە سەریان بەڵکو بەوەشەوە نەوەستان کە زانیاری لەسەر موسڵمانان بدەن، بەڵکو یەهوودیان هاندا بۆ جەنگ، گوایە کە یەهوود نەترسێت هێز و توانای موسڵمانان لاوازە.

کۆمەڵی موسڵمانان لاواز و بێهێز و پەککەووتە و برسین، لەهەموو شتێک دابڕاون تەنانەت چەکی دەستیان زۆر کەم و کۆنە.

هەواڵەکە گەیشتە خەیبەر، خەیبەر دەستی کرد بە ڕێکخستنی سوپا و قایمکردنی قەڵاکانی، بەوەشەوە نەوەستان بەڵکو هەواڵیان نارد بۆ غەتەفان و هۆزە مورتەزیقەکان واتا ئەوانەی کە بۆ خاتری پارە جەنگ دەکەن، ئەوەی هەڵسا بە کارەکە سەرکردەیەکی خەیبەر بوو بەناوی (کینانەی کوڕی ئەبو حوقەیق) برای سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیق بوو کە موسڵمانان پێشتر کوشتیان.

بەزۆر خۆی گەیاندە هەموو هۆزەکانی غەتەفان کۆی کردنەوە بۆ جەنگ بە پارە و بەروبوومی کشتوکاڵی خەیبەر، ئەوانیش بەدەم داواکەیانەوە ڕۆیشتن و هەموو خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ، سوپایەکی زۆر گەورەیان پێکهێنا تا لە دژی موسڵمانان بجەنگن.

پێغەمبەری خواصَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەزگای هەواڵگری سەربازی بەناوچەکەدا بڵاوکردبوو، کە مەفرەزەیەکی هەواڵگری بوون بە سەرکردایەتی (عەبادی کوڕی بشر) توانی هەواڵ بداتە پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کە کینانەی ئەبو حوقەیق و هەوزەی کوڕی قەیس) خەریکی کۆکردنەوەی سوپان لەناو هاوپەیمانەکانیاندا لە غەتەفان، کە پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هەواڵەکەی زانی خێرا هەڵسا بەچەند کارێک.

یەکەم: سریەیەکی گەورەی لە سوپاکەی جیاکردەوە، بە سەرکردایەتی (ئەبانی کوڕی سەعید) بەرەو ناوچەکانی نەجد ڕۆشت تا وەکو بیخاتە چەقی ئەعرابە دەشتەکییەکانی ئەو ناوچەیە بیر لە جەنگ نەکەنەوە، ئەم سریە کاری ئەوە بوو کە غەتەفان و ئەعرابییەکان بیر لە داگیرکردنی شاری مەدینە نەکەنەوە، وانەزانن کە شاری مەدینە خاڵیە لە سوپا بەڵکو بەهێزە توانی لایەنی شاری مەدینە بپارێزێت.



دووەم: بەهەمان شێوە سریەیەکی تری ئامادە کرد و ناردی بۆ باکووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەکانی غەتەفان بۆ ئەوەی سوپای غەتەفان بترسن و وا هەست بکەن کە موسڵمانان بۆ جەنگی ئەوان هاتوون و ئامانجی غەتەفانە نەکو خەیبەر، ئەم سوپایە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری کردن کە دەنگ بەرز بکەنەوە و هاوار بکەن بۆ ئەوەی سوپای غەتەفان بترسێت و بگەڕێتەوە لەوەی کە ماڵ و جێگاکانی موسڵمانان لە پشتەوە نەچنە ناوی ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانیان، لەدوای سەرکەوتنی کاری ئەو سریەیە، توانیان بەتەواوەتی لە کارەکەیاندا سەرکەوتووبن، سوپای غەتەفان ترسان و گەڕانەوە بۆ جێگاکانیان، پێغەمبەری خوا ﷺ توانی بەتەواوەتی بڵاوە بە سوپای غەتەفان بکات و بیر لە جەنگی موسڵمانان نەکەنەوە لەگەڵ یەهوود دا.

سێیەم: ڕێگا گۆڕینی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ناوچەی خەیبەر، لە باکووری خەیبەرەوە چووە ناوچەکە لە کاتێکدا مەدینە لە باشووری خەیبەر دایە، بەڵام ڕێگای گۆڕی و سەربازگەی لە باکووری خەیبەر دامەزراند و لەو جێگایەوە دەڕۆیشتن ئەمەش دوو ئامانجی گەورەی پێ پێکا.

ئامانجی یەکەم: نێوانی غەتەفان و خەیبەر بە سوپای خۆی گرت و هیچ هاوکارییەک بۆ خەیبەر نەڕوات لەلایەن غەتەفانەوە.

ئامانجی دووەم: ڕێگای گرت لە یەهوود کە بەرەو شام هەڵبێن و بەرەو وڵاتی شام ڕابکەن، چونکە ڕێگای شام گیراوە بە سوپای ئیسلام.

ئەمەش پلانێکی سەربازی بوو لە بەرزترین ئاستدا، لێرەوە نیشانەکانی سوپای سەرکەوتوو دەرکەوتن و ئەگەر چی کەمیش بن بەڵام بە پشتیوانی خوا سەردەکەون، غەتەفان وازی لە جەنگ هێنا و گەڕایەوە بۆ ناوچەکەی خۆی، سوپای ئیسلام بێجگە لە موهاجیر و ئەنسار ئەو هۆزانەی تر کە موسڵمان بوون لە ڕێگادا بە سوپای موسڵمانەوە لکان زیاتر بوون، هەموو لەسەر شەهیدبوون ئومێدیان دامەزراند بوو، لەپێناوی خوادا شەهید بن، پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو هۆکارێکی گرتەبەر بۆ سەرکەوتن، هێزی خۆی بەتەواوەتی بەکار هێنا.

ئەمەش لە جەنگی بەدر و ئەحزاب دا لەبەرچاو دا هەبوون بۆیە موسڵمانان سەرکەوتن و ئەوەی بەکاری هێنا لە بەدر و ئەحزاب دا لە خەیبەردا دووبارەی کردەوە.



## سوپای پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناوچەی خەیبەر

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەواوەتی نزیک بوویەوە لە قەڵاکانی خەیبەر و هەموو کاتەکانی کە دەڕۆیشتن لەشەودا بوو، بۆیە هەر لە شەودا گەیشتە خەیبەر، سروشتی پێغەمبەر ﷺ وابوو بەشەودا جەنگی نەدەکرد تا ڕۆژ هەڵنەهاتایە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ناوچەیەکی هەڵبژارد و سەربازگەی تێداخست، بۆ ئەوەی لە بەرەبەیاندا جەنگ دژی قەڵاکانی خەیبەر دەست پێبکات، ئەو ناوچەیە نزیک بوو لە کۆمەڵێک قەڵای یەهوود ناسراو بوون بە (قەڵاکانی نەتا)، بەڵام هاوەڵی بەڕێز (حوبابی کوڕی مونزیر) هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ هەر هەمان هاوەڵ بوو لە بەدردا ئاماژەی کرد بە خراپی جێگاکە، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم جێگایە نزیکە لە قەڵاکانیانەوە، ئەوان شارەزان دەتوانن بێنە چواردەورمان، پاشان ئەوان ئاگاداری کاری ئێمە دەبن، ئێمە ئەوان نابینین، هەروەها تیرەکانی ئەوان دەگاتە لای ئێمە بەڵام تیرەکانی ئێمە ناگات، ناو ئەم دارانە باش نییە بۆ جەنگ ئێمە شارەزا نین و ئەوانیش لە نێوان دارەکان یاخود سەردارەکان کەمینمان بۆ دادەنێن، ئەگەر بڕۆینە جێگایەکی خاڵی لەدار و زەوییەکەی زۆر خۆر لێی دابێت باشترە سەربازگەی تێدا درووست بکەین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ڕاکەتم بەدڵە، تێکەوتە و ئاماژەیەکی جوان و چاکە (أشرت بالراي)

پاشان موسڵمان چوونە ئەو جێگایەی حوبابی کوڕی مونزیر دەست نیشانی کرد، بەوەش زیاتر گەورەیی و عەزەمەتی پێغەمبەرمان بۆ دەردەکەوێت، ڕاستەوخۆ دابەزیە سەر ڕاوێژ و ئەمری شوورا و چووە ئەو جێگایەی کە حوباب دەستنیشانی کرد، لەویدا جێگر بوون.

لە بەرەبەیاندا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دا بۆ سوپاکەی و ورەی بەرزکردنەوە بیریخستنەوە قیامەتی شەهادەت، پاشان فەرمووی سبەینێ ئاڵای سوپاکە دەبەخشینە کەسێک خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی دەوێن و ئەویش خواو پێغەمبەری خوا ﷺی خۆش دەوێت.[٦٠]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٠] ـ (لأعطين الراية غدا رجلا يحب الله ورسوله و يحبه الله ورسوله).



ئەستەمە سەرکردەیەك خوا و پێغەمبەر ﷺ ی خۆش نەوێت ببێتە سەرکردەی ڕاستەقینە و خوای گەورە سەرکەوتنی پێببەخشێت، چونکە سەرکردەی سەرکەوتوو لە جەنگدا کە خوای گەورە سەری دەخات خوا خۆشی دەوێت، ئەویش خوای خۆش دەوێت.

هەموو سەرکردەیەکی موسڵمان نیشانەیەکە لە خۆشەویستی خوای گەورە، کە تەمکین دەبەخشێت بە سەرکردەکانی.

بۆ ڕۆژی دووەم پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵاکەی هەڵگرت کە بیداتە دەستی یەکێیان، هەموو چاوەڕێیان دەکرد و موشتاق بوون کە پێغەمبەر ﷺ ئەیداتە دەستی کامیان، لە کۆتاییدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب؟!

هاوەڵان وەڵامیان داوە کە عەلی لە تاو ئازاری چاوی لە خێمەی سەربازەکاندایە، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە شوێنیدا، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب زۆر بە ناڕەحەتی دەیبینی و چاوی بەردی کردبوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کرد، هەندێك لە لیکی موبارەکی کردە چاوی، ئیتر بە باشترین شێوە دەیبینی و لەوەوبەدواوە هەرگیز چاوی نەهێشا و ئازاری نەما و چاك بوویەوە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵاکەی دایە دەستی، هەرچەند خەڵك وتیان ئەی پێغەمبەر ﷺ باری تەندرووستی ڕێگا نادات، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی عەلی ئاڵاکە هەڵدەگرێت!

عەلی چونکە ڕاستگۆ و حەزی بە جیهاد بوو خوای گەورە دەرگای خێری بۆ کردەوە و ڕێنوێنی کرد.

﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩﴾ [العنكبوت]

واتە: ئەوانەش لە پێناوی ئێمە دا و بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمە هەوڵ و کۆششیان کردووە، بەڕاستی ئەوانە ڕێنموویی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاك، بێگومان خوای پەروەردگار هەمیشە لەگەڵ چاکەکارانە.



# بانگەواز لە هەموو ڕەوشێکدا

ماکوان: لەگەڵ ئەو هەموو تاوانەی کە یەهوود ئەنجامی داوە، لەگەڵ ئەوەی خاوەنی مێژوویەکی ڕەشن، پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی بانگەوازیان و هیدایەتیان دەدات، حەز دەکات هەموو بێنە ناو نووری ئیسلام.

بە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی فەرموو: لە سەرەتاوە بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام، پاشان عەلی وتی: جەنگیان لەگەڵ بکەین تا ئەوکاتەی وەکو ئێمە موسڵمـان دەبن، هەڵبەت ئیسلام بەدوای هیدایەتی خەڵکەوەیە، نایەوێت بڕۆنە ناو ئاگر و دەیانپارێزێت، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی فەرموو: دابەزە گۆڕەپانەکەیان و پەیامی خۆتیان پێ بڵێ لە پێغەمبەرەکەتەوە کە فەرمانی چیت پێ کراوە، پاشان بانگیان بکە بۆ هیدایەتی ئیسلام بۆ ناو ئەم ئایینە، ئاگاداریان بکەرەوە لەوەی کە واجبە لەسەریان و حەقی خوای گەورە چییە لە سەریان، ئەی عەلی سوێند بەخوا ئەگەر کەسێك لەو یەهوودانە هیدایەت وەربگرن لەسەر دەستت ئەوا باشترین و گەورەترین خێرە کە خێرەکەی گەورەتر و بەرزترە لە هەرچی نیعمەت و خۆشی هەیە.

ئەمەش ئامانج و ئاواتی موسڵمانانە، لە ئایینی لە ئیسلامدا ئامانج لە جەنگ بۆ لەناوبردنی خەڵکی نییە! بەڵکو بۆ هیدایەت وەرگرتنە.

نفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم, ثم أدعهم الى الاسلام, وأخبرهم بما يجبُ عليهم من حق الله تعالى فيهِ فوالله لأن يهدي الله بك رجلاً واحداً خيرٌ لك من أنْ يكون لك حمُر النعم) ([٦١]).

پێغەمبەری خوا ﷺ فێرمان دەکات، خەڵکی یەهوودی لا خۆشەویسترە تا سەروەت و سامان وماڵیان، حەز بەهیدایەتی مرۆڤ دەکات.

لەگەڵ ئەو هەموو مێژووی خراپەی یەهوود ئەوە ڕەوشتی پێغەمبەرەکەی ئێمەیە.

سوپای موسڵـمانان بە تەواوەتی نزیك بوونەوە، سەرەتای جەنگ بە تەواوەتی بەدی دەکرا و بانگی بەیانی درا و پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی بۆ کردن، هەموو سوپا بەڕێکەوتن بۆ قەڵاکەی خەیبەر، ئیتر موسڵمانان بەرەو قەڵاکە ڕۆیشتن، خەڵکی یەهوود

---

[٦١] ـ رواه مسلم.



لەدەرەوەی قەڵاکە بوون بۆ زەوی کشتوکاڵیان هاتبوون، کاتێک سوپاکەیان بینی هەموو ڕایان کرد و دەرگای قەڵاکەیان داخست و وتیان محەمەد و سوپاکەی هاتن.

کاتێک نزیک بوونەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی بەرزکردەوە هەموو سوپاکەی گوێ لێبوو هەروەها دەنگدانەوەی ناوچەکە (صدی) زیاتر دەنگی پێغەمبەری ﷺ بەرز کردەوە، هەموو یەهوود گوێی لێ بوو فەرمووی: الله أكبر خەیبەر وێرانبوو! الله كبر خەیبەر وێران بوو!، الله أكبر خەیبەر وێران بوو!.

لە دوای سێ جار کە فەرمووی: (إنا إذا نزلنا بساحةِ قومٍ فساء صباح المنذرين).

ئەم وشانە وەکو بەرد بوو لەسەر دڵی یەهوود، لە هەموو لایەکدا بیرخستنەوەی موسڵمانان بوو بە سەرکەوتنی خوا و پێش دەستپێکردنی جەنگ بەوە بیری خستنەوە کە خوا لە قەڵا و چەکی یەهوود بەهێزترە و سەرکەوتن لای زاتی بەرزییەوەیە، گیانی جیهاد و ڕۆحی جەنگ لە موسڵمانان بەرز بوویەوە، بە پێچەوانەوە یەهوود ترسی لێنیشتبوو.

سوپاکە لە قەڵاکان نزیك بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لێوردبوونەوە و شیتەڵکاری دەکرد لەکام قەڵای خەیبەرەوە دەستپێبکات، چونکە چەند قەڵای گەورەی تێدابوو ژمارەیان (٨ )قەڵا بوو، هەروەها قەڵای بچووکیشی تێدایە بەڵام ئەو (٨)قەڵایە سەرەکیترین قەڵای خەیبەرن، (٥) لەو قەڵایانە لەیەك ناوچە دایە و(٣) دانەی تریشیان لە ناوچەیەکی تر دایە، بەڵام (٥)قەڵاکەی کە بەیەکەوەن هێڵی ستراتیژی بەرگری یەهوودن، ئەو قەڵایە دابەش دەبێت بەسەر دوو جێگای تردا، بەناوی ناوچەی (نەتا) کە سێ قەڵایان بەیەکەوە بوون و دوو قەڵای تریان کەوتۆتە ناوچەی (شق)، بەڵام قەڵاکانی (نەتا) بەم شێوەیە بە دوای یەکدا هاتبوون کە ناوی قەڵاکان بریتیبوون لە قەڵای (ناعم) (سەعب کوڕی موعاز) و (زوید) قەڵای نەدم یاخود (ناعم) بەهێزترین قەڵای خەیبەر بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە قەڵا بەهێزەکەوە دەستی پێکرد و کاتێك نزیك بوویەوە لێی, عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی نارد تاوەکو بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام، پاشان فەرمووی: ئەگەر ڕەتییان کردەوە ئەوکات جەنگیان لەگەڵدا بکە.

لەوانەیە خەڵکێك بپرسن ئەی ئێوە ناڵێن زۆرکردن لەدین وەرگرتن دا نییە! چۆن بە یەهوود دەڵێن ئەگەر موسڵمان دەبیت باشە، ئەگەر نا جەنگیان لەگەڵ دەکەین.

لە وەڵامیاندا دەڵێین ڕاستی ئەوەیە ئەوان کە جوولەکەن بۆ ئەوە سزا نادرێن کە جوولەکەن، بەڵکو لەسەر کارە خراپەکانیان جەنگیان لەگەڵ دەکرێت، هەموو ئەو تاوانانەی کە لە سەریان کۆبۆتەوە هۆکاری سزادانیانە کە خەریکی پلان و فیتنەکاری و کوشتن و لەناوبردنی خەڵك بوون، ئێستا بۆ پاکبوونەوە لەو خراپیانەی کە کردوویانە پێغەمبەری خوا ﷺ هەلێکی



تریان پێ دەبەخشێت بۆ ئەوەی کۆمەڵگەیەکی باش و تەندرووست و چاکەخوازیان لێدرووست بێت.

هەموو ئەو کارانەی کە ئەنجامیان دا لە کۆکردنەوەی هێز لە جەنگی ئەحزاب و گەمارۆی شاری مەدینە...هتد.

یەك هەلی تریان ماوە ئەویش پێغەمبەری خوا - پێیان دەبەخشێت، تاکو ئەو سزایە لەسەر خۆیان لابەرن، هەربۆیە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: ئەگەر هاتوو موسڵمان بوون ئەوا ئەو سزایەیان لەسەر لادەچێت و ئەوەی کردووتانە لە ڕابردوودا لەبیری دەکەین.

(إن أسلمتم رفعنا عنكم العقاب، ونسيناكم ماسبق)

ئەمەش لە ڕاستیدا گەورەیی و ڕەحمەت و بەزەیی دڵی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات.

بەڵام یەهوود جەنگی هەڵبژارد و وتیان بە هیچ شێوەیەك نایەینە ناو ئایینی ئیسلام و بڕیاری جەنگیان دا بەهێز و توانای قەڵاکانیاندا دەنازی، جەنگ دەستی پێ کرد.



## دەستپێکردنی جەنگ لە خەیبەردا

یەهوود لەسەر بڕیاردانی جەنگ بەردەوام بوون، زۆر جەختیان لەسەر جەنگ کردەوە، تەنانەت سەرکردە سەربازییەکانیان دەرچوونە دەرەوە بۆ جەنگکردن، هەروەکو پیشەی هەمیشەی دووکەس دەچنە ناو گۆڕەپانی جەنگ، جەنگ دەکەن وەکو پێشەکییەك بۆ هێرشی هەردوو سوپاکە.

پاشان یەکێك لە پاڵەوانەکانی یەهوود دەرچوو بۆ جەنگ داوای کرد کێ توانای جەنگکردنی هەیە لەگەڵیدا، یەکێك بوو لە بەهێزترین پاڵەوانەکانی یەهوود، لاشەیەکی گەورە و هێزێکی زۆری لە لاشەدا کۆببوویەوە، ناوی (مەرحەب) بوو.

کەسێکی موجاهید بۆی دەرچوو لە موسڵمانان بەناوی (عامری کوڕی ئەکوەع) هەردوو لا بۆیەك وەستانەوە، عامر هاوەڵێکی زۆر ئازا و بە جەرگ و بەهێز بوو، ئەوەندە بەهێز شمشێری داهێنایەوە بۆ مەرحەبی یەهوودی، مەرحەب خۆی لادا و لەبەهێزی پێدا کێشانەکەی دەستی خۆی کۆنترۆڵی نەما و شمشێرەکەی بەر قاچی خۆی کەوت و ئەژنۆی خۆی دوو کەرت کرد، بەدەستی خۆی خۆی شەهید کرد.

هاوەڵان هەموو گوێیان لێبوو وتیان بەدەستی خۆی خۆی کوشت، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی کە هەندێك لە هاوەڵان وتیان، کارەکانی لەدەستدا و بەدەستی خۆی خۆی لەناو برد و جەهەننەم جێگایەتی، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ کە گوێی لێبوو فەرمووی: بەڵکو عامری کوڕی ئەکوەع دوو پاداشتی هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بە هەردوو پەنجەی موبارەکی کرد و فەرمووی: دوو پاداشتی کۆکردۆتەوە هەوڵی دا لە نێوان کردار و زانستدا.[٦٢]

ئەوەی کە بەسەر عامردا هات یەکەم جاربوو لەناو عەرەبدا ڕوویدات، بۆیە کاریگەری زۆر نەرێنی کردە سەر ڕۆحی مەعنەوی سوپای موسڵمانان، بەڵام زۆری نەبرد قارەمانی ئیسلام عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بۆی دەرچووە مەیدان، جەنگ لەنێوان ئەو و مەرحەب دا دەستی پێ کرد، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب قارەمانی یەهوودی کوشت و توانی سەربکەوێت.

---

[٦٢] ـ (قال صلى الله عليه وسلم: إنَّ له لَأَجْرَيْنِ -وجَمع بيْنَ إصْبَعَيْهِ- إنَّه لَجاهِدٌ مُجاهِدٌ)، صحيح البخاري، رقم ٤١٩٦.



ئەمەش ئاماژەیەکی زۆر گەورە بوو بۆ سەرکەوتنی موسڵمانان، چونکە یەهوود بڕوای ئەوەیان نەبوو کەس لە موسڵمانان بتوانن مەرحەب بکوژێت، قارەمانی ئیسلام قارەمانی یەهوودی کوشت.

پاشان براکەی بەناوی (یاسر) دەرچووە مەیدان بۆ تۆڵە سەندنەوەی مەرحەب (زوبێری کوڕی عەوام) بۆی چووە مەیدان و ئەویش کوشتی، دوو قارەمانی یەهوود لەناو چوون، سێیەم کەس لە جەنگاوەرە ئازا و ناودارەکانی یەهوود دەرچوو بۆ تۆڵە سەندنەوەی (مەرحەب و یاسر) برای محەمەد کوڕی مەسلەمە بۆیان چووە مەیدان و سێیەم قارەمانی یەهوودیان کوشت.

ئەمەش سەرەتایەکی زۆر نایاب بوو بۆ موسڵمانان، بەتەواوەتی ئەژنۆی یەهوود شکا و ترس و لەرز کەوتە دڵیان و لەزرەی شمشێری موسڵمانان گوێی خۆیان دەخنی.

لە نێوان یەهوود و موسڵمانان جەنگ دەستپێیکرد، جەنگێکی زۆر سەخت و قورس و گران کە چەند کاتژمێرێك نەبوو بەڵکو چەند ڕۆژی خایەند، موسڵمانان بە تەواوەتی چوونە ناو قەڵای (ناعم) توانیان کۆنترۆڵی بکەن، ڕاستە جەنگەکانی پێشووتر وەکو بەدر و ئوحود چەند کاتژمێرێکی خایاند، بەڵام قەڵاکان گەورە بوون، یەهوودیش زۆر بوون، تا لە کۆتاییدا یەهوود قەڵای (ناعم)یان جێهێشت، چوونە ناو قەڵای (سەعب) بەڵام بە شەودا ڕایان کرد قەڵاکەیان بە چۆڵی بەجێهێشت و ڕایانکردە قەڵای سەعب کە قەڵای دووەمی ئەو ناوچەیە بوو، لە دوای کۆنترۆڵکردنی قەڵای ناعم، هێزێکیتر هاتە سەر هێزی موسڵمانان، سەرکەوتن! ئایا پێغەمبەر ﷺ بەوە وازیان لێ دەهێنێت؟

نەخێر بە دڵنیاییەوە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕانەوەی ئیعتیباری کەرامەتی دەوڵەت و موسڵمانانی لا گرنگە نەك قەڵا و سەروەت و سامان، هاتووە بۆ سزادانی سەرکردەکانی یەهوود، دەبێت بەهەمان شێوەی بەنی قەینوقاع یاخود بەنی نەزیر سزا بدرێت.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ گەمارۆی خستە سەر قەڵای (سەعبی کوڕی موعاز) گەمارۆی قورس و زۆر سەختی خستە سەر یەهوود، هەرچەند قەڵای سەعب زۆر قایم بوو بەڵام موسڵمانان وازیان لێ نەهێنا و بەردەوام لە جەنگ دابوون لەگەڵیاندا.



# تاقیکردنەوەی خوایی

ماکوان: لەگەڵ ئەوەی جەنگ قورس بوو موسڵمانان گەمارۆی ئەوانیان دابوو، خۆشیان خواردنیان کەم بوو برسێتی ڕووی تێکردبوون، لێرەدا تاقیکردنەوەی خوای گەورە دەست پێ دەکات، ئەم تاقیکردنەوەیە بەسەر زۆر سوپای پێغەمبەرانی تردا هاتووە، بۆ نموونە جەنگی نێوان (تاڵوت و جالوت) کە سوپاکە تینوویان بوو فەرمانیان پێکرا لە ئاوی ڕووبار نەخۆنەوە.

هەروەها لەکاتی گەمارۆدانی قەڵای (سەعب)دا کاری گران ڕووی کردە هاوەڵان و برسێتی زۆری بۆ هێنان، کە ئەوەندە برسییان بوو هیچ چارەیەکیان نەما، ئەو قەڵایەی یەکەم کە فەتح کرابوو یەهوود بە خاڵی بە جێی هێشتبوو.

کە برسێتی زۆری بۆ هێنان کۆمەڵێك لە هاوەڵان هەڵسان بە سەربڕینی گوێدرێژەکانیان کە هاوکاریان بوو لە جەنگەکەدا کەرەستە و چەکەکانیان پێدەگواستەوە، ناچار بوون بەسەربڕینی گوێدرێژەکانیان.

عەرەب پێشتر گۆشتی گوێدرێژی دەخوارد و خواردنی ئەسپی حەرام کردبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ کە بینی هاوەڵان ئاگریان کردۆتەوە، فەرمووی: بۆچی ئاگرتان کردۆتەوە واتا چ خواردنێك درووست دەکەن؟

هاوەڵان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لێنانی گۆشت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چ گۆشتێك؟

فەرموویان گۆشتی گوێدرێژ.

لەگەڵ ئەوەی سوپاکە هیچ خواردنی پێ نەبوو، ڕەوشەکە زۆر سەخت بوو لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گوێدرێژانە وەکو هێزی گواستنەوە بەکاریان دەهێنا، تا ئەو ساتەوەختەش گۆشتی گوێدرێژ حەرام نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ کە بیستی گۆشتی گوێدرێژە فەرمووی: وازی لێبهێنن و فەرمانی پێکردن خواردنی گۆشتی گوێدرێژ حەرامە بۆ کەسێك کە بڕوای بە خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، بۆیە حەڵاڵ نییە و وازی لێ بهێنن، بەڵام گۆشتی ئەسپ حەڵاڵە و هەرچەندە هاوەڵان ئەسپیان پێنەبوو لە هەمان کاتدا تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەخت بوو، هەموو برسی و لاواز بوون لە کاتی برسێتی گۆشتەکە لەسەر ئاگر بوو بۆن و بەرامی بڵاو ببووەوە، لەگەڵ ئەوەی هاوەڵان موشتاقی خواردنی بوون، کە حەرام کرا هەموو سوپاکە



گوێڕایەڵی بوون و هەموو بێجیاوازی فەرمانەکەیان پیادەکرد و سەرکەوتوو بوون تێیدا و وازیان لێی هێنا و بەبرسێتی مانەوە، یەك هاوەڵ گۆشتەکەی نەخوارد.

پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها گۆشتەکەی حەرام نەکرد بەڵکو ئەو قاپ و مەنجەڵەی کە تێیدا درووست دەکرا فەرمووی: پیسە و بیشکێنن، بۆ ئەوەی هیچ ئاسەوارێکی گۆشتەکە نەمێنێت، هەندێك لە هاوەڵان شکاندیان و هەندێکی تریان وتیان لەبەر ئەوەی قاپ و قاچاخمان کەم پێیە دەکرێت بیشۆرین؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەکرێت بیشۆرن.

هەر لەو سەردەمەدا کۆمەڵێك مونافیق بۆ ئەوەی گومان بڵاوبکەنەوە دەیانوت خوای گەورە چی لە قورئان دا بۆ باسکردووین ئەوەمان بەسە و هیچی تر وەرناگرین، تا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەروەکو قورئان خوای گەورە بەخشیوویەتییە بەندەکانی حەڵاڵ و حەرام ئەنجام بدە بە فەرمانی وەحی، دەبینن کەسێکی تێر و قسەزل لەسەر شان لێی پاڵکەوتووە دەڵێت: تەنها بەدوای ئەم قورئانەدا بڕۆن، هەرچی حەڵاڵ بوو شوێنی بکەون ئەوەی حەرام بوو وازی لێبهێنن، وا لەمڕۆوە لە سەرتان حەرامە خواردنی گوێدرێژی ماڵیی و زەواجی موتعە و گۆشتی خاوەن چڕنووکە درێژەکان...هتد.[٦٣]

خوای گەورە لە قورئان دا زۆر جۆر گۆشتی باس کردووە کە حەرامە.

﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣﴾﴾ [المائدة]

واتە: لەسەرتان حەرام کراوە خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو، ....

کەواتە قورئان و سووننەت هاوشانی یەکترن و بە هەردووکیان شەریعەتی ئیسلامیان تەواو کردووە، هەردوو سەرچاوەکەش خوای پەروەردگارە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٣] ـ (قال رسول الله ﷺ: ألا انّي أوتيت الكتاب ومثله معه, الا يوشك رجل شبعان على أريكته يقول: عليكم بهذ القرآن فما وجدتم فيه من حلال فأحلوه وما وجدتم فيه من حرام فحرموه, ألا لا يحل لكم الحمار الأهلي ولا كل ذي نب من السّبع)رواه أبو داود.



پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ئەو ڕووداوە ڕووی کردە خوای پەروەردگار و دەستی کرد بە نزا و پاڕانەوە کە خوای پەروەردگار هاوکاریان بکات.

لە هەمان کاتدا قەیرانێکی زۆر سەخت و دژواربوو بۆ هاوەڵان لەگەڵ ئەوەشدا هەموو بەرفەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺیان کرد، بۆیە پێغەمەری خوا ﷺ هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو کە خواردنیان بداتێ لەگەڵ ئەوەی گۆشتەکەی لێ قەدەغەکردن، تاکە ڕێگا ڕووی کردە خوای پەروەردگار کە هەر زاتی بەرزت دەتوانێت هەم کێشەکان چارەسەر بکات بە نزا و پاڕانەوە و بەرزکردنەوەی حاڵ و گوزەرانیان بۆ لای خوای پەروەردگار و فەرمووی: خوای پەروەردگار ئەوە حاڵ و گوزەرانمانە کە دەیبینیت منیش هیچ توانایەکم نییە، هیچ خواردنێك بەدەستمەوە نییە تا بیبەخشمە ئەو هاوەڵانەم، خوای مەعبوودمان فەتحی گەورەترین قەڵای یەهوودمان پێببەخشە کە بریتین لە خواردن و خواردنەوە دەوڵەمەنترین قەڵای جووەکانە[٦٤]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوعایەی دەکرد هەموو هاوەڵان لە پشتییەوە وەستابوون ئامینیان بۆ نزاکەی دەکرد، لەهەر کاتێکدا موسڵمانان ڕوویان کردبێتە خوای پەروەردگار هەرگیز خوای گەورە دەرگای خۆی داناخات بەڵکو بەپێچەوانەوە دەرگاکانی واڵا دەکات.

لە دوای بەرزکردنەوەی سکاڵا بۆ لای خوای پەروەردگار، بۆ ڕۆژی دووەم خوای گەورە سەرکەوتنی خۆی دەنێرێت. خوای گەورە فەتحی قەڵای (سەعب)ی پێبەخشین کە دەوڵەمەنترین قەڵای یەهوود بوو لە خواردن و کەرەستە و شتوومەك، هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەکی تێدا بوو.

سەرکەوتن و تێر بوون لەیەك کاتدا، ئەمەش ئەنجامی گوێڕایەڵی و پابەند بوون بۆ پێغەمبەرەکەیان و مەنهەجەکەیان، موسڵمانان سەرکەوتن بەسەر قەڵای دووەمی یەهوود کە زۆر سەخت بوو، بەڵام سوپاس بۆ خوای موتەعال توانیان بە تەواوەتی بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، لە دوای کۆنترۆڵکردنی ئەو قەڵایە موسڵمانان بەرەو قەڵای سێیەم ڕۆیشتن، بەناوی قەڵای (زوبێر) ئەو قەڵایەش لە ناوچەکەدا لە قەڵا قایم و بەهێزەکان بوو، ئەوەندە سەرباز و ئەسپی تێدابوو لە ژمارە نەدەهاتن، موسڵمانان نەیاندەتوانی بزانن چی تێدایە چونکە قەڵاکە شاخاوی بوو واتا لەسەر لووتکەی شاخێك بوونیات نرابوو زۆر سەخت بوو مرۆڤ بیگاتێ.

---

[٦٤] ـ (أللهم انّك عرفت حالهم وأن ليست بهم قوّة, وأن ليس بيدي شئ أعطيهم اياهُ, فافتح عليهم أعظم حصونها عنهم غناءاً وأكثرها طعاماً ووجكا)، ابن هشام، ج٣، ص ٧٩٥.



پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سێ ڕۆژ گەمارۆی دا، خوای گەورە کردی یەکێك لە یەهوودییەکانی ئەو قەڵایە ترس و لەرز کەوتە دڵی، دەتوانین بڵێین دیارییەکی خوایی بوو بۆ موسڵمانان، داوای ئەمانی کرد لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هاتە ناو موسڵمانان واتا موسڵمان نەبوو تەنها داوای ئەمانی کرد، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەمانی پێبەخشی.

ئەو یەهوودییە وتی: ئەی ئەبو قاسم[٦٥] ئەگەر تا چەند مانگێك گەمارۆی ئەم قەڵایە بدەیت جوولەکە بەلایەوە گرنگ نییە، چونکە خواردنی زۆریان لەبەر دەستدایە و بە شەویش ئێوە پێیان نازانن دێنە سەر کانی و ئاوێك و ئاو بۆناو قەڵاکە دەگوازنەوە، خۆ ئەگەر هاتوو ڕێگای ئاویان لێبگریت، تەنها تا چەند ڕۆژێك بەرگە دەگرن و ناچار خۆیان ئەدەن بەدەستەوە یان ڕادەکەن و قەڵاکەت بۆ چۆڵ دەکەن.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چووە سەر کانییەکە و تا توانیان ئاوەکەیان لێ بگرن و گەمارۆی کانییەکەی دا، ئیتر ئەوانیش بۆ جەنگ دەرچوون بۆ جەنگێکی زۆر سەخت، جەنگێکی زۆر سەختیان کرد لە کۆتاییدا موسڵمانان سەرکەوتن و ئەوانیش ڕایانکرد لەو قەڵاوە بۆ قەڵایەکی تر، بەڵام قەڵای زوبێر یەکێك بوو لە جوانترین و نایابترین قەڵاکان بە شێوەیەکی هونەری زۆر سەرجڕاکێش درووست کرابوو.

بەم شێوازە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سێ قەڵای بە تەواوەتی خستە ژێر دەستی خۆی کە بریتیی بوون لە قەڵاکانی (ناعم، سەعب، زوبێر) لە ناوچەیەك دابوون پێی دەووترا (نەتا).

بە دڵنیاییەوە سەرکەوتن نایەت تا موسڵمانان هۆکارەکانی نەگرنەبەر، لەم جەنگانەدا هەموو توانا و هێز و هۆکارەکانی جەنگیان گرتە بەرو کاری تەواوەتیان بۆ کرد، خوای گەورە دیاری و سەربازی خۆی دەنێرێت:

﴿... وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ...﴾ [المدثر]

واتە: ... کەس ژمارەی سەربازانی پەروەردگارت نازانێت جگە لە زاتی خۆی...

لە ڕاستیدا یەکێك لە سەربازەکانی خوای پەروەردگار ئەو کەسە جوولەکەیە بوو کە داوای ئەمانی کرد، کەس نازانێت ناوی چی بوو، هیچ کەس ئاگادار نییە ئایا هەر یەهوودی مایەوە یان موسڵمان بوو، کە هەموو نهێنی قەڵاکەی زوبێری ئاشکرا کرد.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

---

[٦٥] ـ مەبەستی پێغەمبەر بوو صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.



﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴿١٢٦﴾﴾ [آل عمران]

واتە: جا ئەو (هاوکاری) فریشتانە لەلایەن خواوە تەنها مژدەیەک بوو بۆ ئێوە، تادڵەکانتان پێی دامەزراوتر بێت، ئەگینا سەرکەوتن تەنها لەلایەن خوای باڵادەست و داناوەیە و هەر ئەو دەیبەخشێت.

لە دوای گرتنی ئەو سێ قەڵا سەرەکییەی یەهوود، جوولەکەکان ڕایانکردە ناو قەڵاکانی تریان، دوای ئەو سێ قەڵایە چوونە ناو قەڵای چوارەم بەناوی قەڵای (ئەبو ئەحەد) ئەم چەند قەڵایەی تر لە ناوچەیەکدان بە ناوی (شەق) قەڵاکانی پێشوو تر لە ناوچەری (نەتا) بوون، ناوچەی (شەق) دوو قەڵای بەهێزی تێدابوو بە ناوی (ئەبو ئەحەد و ئەبو نەزار).

جەنگێکی زۆر سەخت و دژوار ڕوویدا، خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانان، توانیان قەڵای ئەبو ئەحەد بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، یەهوودییەکانی قەڵاکە ڕایان کردە ناو قەڵای (ئەبو نەزار)، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك گەمارۆی قەڵای ئەبو نەزاریشیدا، ئەو قەڵایە زۆر ستراتیژی و گرنگ بوو لەگەڵ ئەوەش دا هەموو ئافرەت و منداڵانی یەهوود لەو قەڵایە دابوون، قەڵایەکی یەکجار بەهێز و قاییم بوو، گەمارۆی ئەم قەڵایە زۆر زیاتری خایاند لە چاو قەڵاکانی پێشووتر دا.

یەهوود پێی وابوو ئەستەمە موسڵمانان بتوانن فەتحی بکەن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ یەکەم جار لە مێژووی عەرەبدا جۆرە چەکێکی بەکارهێنا کە زۆر نوێ بوو، هەرگیز پێشووتر ڕووی نەدابوو، ئەویش بە کارهێنانی (مەنجەنیق) بوو، موسڵمانان توانیان لە قەڵاکانی تردا دەستی بەسەردا بگرن، پاشان بەکاریان هێناوە دژی یەهوود.

ئەم مەنجەنیقە لە قەڵای (سەعب کوڕی موعاز) موسڵمانان دەستیان گرت بەسەریاندا و ئێستا لە دژی قەڵای نەزار بەکاری دەهێننەوە.

موسڵمانان بە درێژایی چەند ڕۆژێك توانیان بە هۆکاری مەنجەنیقەکە لایەکی دیواری قەڵای نەزار بڕوخێنن و بچنە ناو قەڵاکە، موسڵمانان بە تەواوەتی دەستیان گرت بەسەر ئەو قەڵایەدا و لە جەنگێکی زۆر ئازایانە دا موسڵمانان سەرکەوتن و یەهوود ڕایکرد بۆ قەڵاکانی تر، هەموو ژن و منداڵ و کەس و کاری خۆیانیان بەجێهێشت و ڕایانکردە ناو قەڵاکانی (کەتیبە).

ئەم ناوچەیە کە ناسراوە بە ناوچەی (کەتیبە) سێ قەڵای گەورەی تێدایە بەناوی (قوموس و قوتەیح و سەلام) ئەم قەڵایانەش هاوشێوەی قەڵاکانی تر بەهێز و قایم بوون، بەڵام یەهوود تووشی داڕووخانی دەروونی و شکست ببوون، بە هۆکاری لەدەستدانی قەڵاکانی تریان،



هەروەها لە ماوەی چەند هەفتەی ڕابردوودا چەندین جەنگ ڕوویدا کە هەموو جەنگی سەخت بوون، لە هەموو جەنگەکاندا جوولەکە شکست لە دوای شکست بەسەریان دەهات، ئێستاش هەموو ماڵ و منداڵ و ئافرەتیان و قەڵایان لە ژێر دەستی موسڵماناندایە، بێئەوەی موسڵمانان دووچاری شکست ببنەوە هەر بۆیە خودای پەروەردگار ناوی بە (فتح قريب) دەهێنێت.

﴿وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ۖ نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ [الصف]

واتە: جا شتێکی تریش هەیە کە حەزی لێ دەکەن، ئەویش بەخشینی سەرکەوتنە لەلایەن خواوە کردنەوەی ولاتان و دەکانە، ( ئەو مژدەیە شایدی ئیمانداران).

موسڵمانان گەمارۆی یەکەم قەڵای ناوچەی کەتیبەیان دا ئەویش قەڵای قوموس بوو، ئەم گەمارۆیە (١٤) ڕۆژی خایەند، خوای گەورە ترس و لەرز و دڵە ڕاوکێی خستە دڵیان و هەموو قەڵاکانی ئەو ناوچەیە بێ جەنگ و کوشتار خۆیان دا بەدەستەوە و داوای سوڵحیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد.



# یەهوود داوای سوڵح دەکات

ماکوان: یەهوود لە دوای (١٤) ڕۆژ لە گەمارۆدانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰ داوای سوڵحیان کرد، کەسێك لە سەرکردەکانی بەناوی (کینانەی کوڕی ئەبو حوقەیق) کە برای سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیق بوو، کە پێشتر موسڵمانان کوشتبوویان هاواریکرد لە پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ وتی دەمەوێت قسەت لە گەڵ بکەم، ڕێگام ئەدەیت لەگەڵ ئەمان؟!

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ فەرمووی: بەڵێ.

هاتە خوارەوە لە قەڵاکە و گفتوگۆیەکی زۆریان کرد، بەڵام لە کۆتاییدا سوڵحەکە هەموو لە بەرژەوەندی موسڵمانان بوو.

پوختەی سوڵحەکە بریتییە لەوەی وەکو بەنی قەینوقاع و بەنی نەزیر کە بۆ پاراستنی خۆیان ماڵ و سامان و چەکەکانیان جێبهێڵن و بڕۆنە دەرەوەی خەیبەر، بۆیان نییە پارە و ئاڵتون و زیویش لەگەڵ خۆیان بەرن لەبەرامبەردا پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ منداڵ و ژن و کەسوکاریان بداتەوە، پیاوەکانیان لە مردن ڕزگاریان بێت و تەنها بە جلی خۆیان ئەڕۆنە دەرەوە.

یەهوود بەم سوڵحە ڕازی بوو کە لە ڕاستیدا ئەوپەڕی سەرشۆڕی و شکست و ملکەچییە، سەرکەوتنی گەورە و بێوێنەیە بۆ موسڵمانان.

مەرجەکەی پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ فەرمووی: هیچ کەس ناپارێزم واتە گەردەنی بەر شمشێر دەکەوێت ئەگەر هەرشتێك بشارنەوە ئەوە لە زیممەتی خوا و پێغەمبەرەکەی بەدوورن.[٦٦]

واتە لە مەرجەکەدا هاتووە هەر کەس ئاڵتون و زیو و پارە بشارێتەوە پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ دەیکوژێت.

هەموو ئەم مەرجەیان قبوڵ کرد ڕازی بوون بەمەرجەکان و خەیبەر جێ بهێڵن و بڕۆنە دەرەوە بە جلوبەرگی خۆیان و تەسلیمکردنی چەك بۆ پاراستنی خۆیان.

---

٦٦ ـ (وشرط الرسول صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ في هذه المعا هدة عليهم شرطا هاما فقال) : (وبرئت منكم ذمة الله وذمة رسوله إن كتمتوني شيئا).



بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ توانی لە ڕێگای یەهوودییەکەوە ئاشکرای بکات کە کینانەی کوڕی ئەبو حوقەیق پارە و ئاڵتوونی شاردۆتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و لێی پرسی ئایا تۆ هیچ پارەت شاردۆتەوە؟!

کینانە وتی: نەخێر.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەواتە ئەگەر پارە و ئاڵتوونەکانتمان دۆزییەوە ئەتکوژین؟!

کینانە وتی: بەڵێ ئامادەم بۆ کوشتن.

هەر ئەو یەهوودییە جێگاکەی ئاشکرا کرد، کە لەناو خاکەکەی کینانەدا شاردبوویەوە، چوون لە دوای گەڕانێکی دەریانهێنا، ئاڵتوون و پارەی زۆری شاردبوویەوە کە گەنجینەیەکی زۆر گەورە بوو.

بە هۆکاری ئەو سەرپێچییە سەرۆکی یەهوودی خەیبەر کوژرا و خێزانەکەی دەستبەسەرکرا، هۆکاری ئەم ڕووداوە درۆ و سەرپێچی خۆیان بوو.

پاشان دحیەی کەلبی داوای کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە خێزانی کینانەی پێ ببەخشێت، ئەویش ڕازی بوو، بەڵام یەکێك لە هاوەڵان و ڕاوێژکارانی بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: ئەوە کچی مەلیکی یەهوودە ناشێت بۆ خەڵکی تر بێت دەبێت لە ژێر سێبەری پێغەمبەر ﷺ دابێت، پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو لە دحیەی سەندەوە پاشان ئازادی کرد و داوای زەواجی لێ کرد ئەویش ڕازی بوو، بەم هاوسەرگیرییە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە زاوای یەهوود، یەهوود و موسڵمانان بەتەواوەتی کۆتایی بەجەنگی نێوانیان هات، ئەو ئافرەتەش ناوی خاتوو سەفییە کچی حوییەیی کوڕی ئەختەب بوو.[٦٧]

لە کۆتاییدا بووە خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ و بووە دایکی ئیمانداران و جارێك خاتوو حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتاب و خاتوو عائیشەی کچی ئەبو بەکر کە خێزانی پێغەمبەرن ﷺ وەکو گاڵتە پێکردن وتیان تۆ باوکت جوولەکەیە!

ئەویش پێی ناخۆش بوو چووە لای پێغەمبەر ﷺ و سکاڵای خۆی کرد.

---

[٦٧] ـ (لە بەرگی یەکەمی مەملەکەتی نوور بە درێژی باس کراوە).



پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەفییە تۆ باوکت موسایە و مامت haroونە و هاوسەرەکەت محەمەدە.

بڕۆ پێیان بڵێ من باوکم پێغەمبەرە و مامم پێغەمبەرە و هاوسەرەکەشم پێغەمبەرە.



# هەندێك ڕووداو لەكاتی جەنگی خەیبەردا

ماكوان: ئەوەی سەرنجی ڕاكێشام ئەوەیە، هەندێك ڕووداو لەكاتی جەنگی خەیبەر ڕوویداوە كە لە ڕاستیدا لە خەیاڵ خەیاڵترە و ئەوەندە خاوەنەكەیان پێغەمبەری خوا ﷺ، مۆراڵ و ئاكاری بەرزی ئیسلام ڕەوشتی جوان نیشان ئەدەن وا هەست دەكەی كە خەیاڵە، بەڵام سوێند بەخوا زۆر ڕاستە و ڕووی داوە.

بەندەیەكی ئەعرابی ڕەش پێست شوانی یەكێك لە یەهوودی خەیبەر دەبێت، لەكاتی برسێتی و ناڕەحەتی موسڵمانان كە گۆشتی گوێدرێژیان دەویست بخۆن و پاشانیش لێیان قەدەغە كرا، ئەو بەندە ڕەشپێستە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی دەمەوێت موسڵمان بم، خواناس موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند لە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی كە چەند سەر مەڕێك شوانیان دەكەم خاوەنەكەی یەهوودییە ئەگەر دەتانەوێت بتاندەمێ؟

لە كاتێك وا موسڵمانان هەموو برسیان بوو، بەڵام ڕەوشتی پێغەمبەری بەرز بەرزترە، فەرمووی: مەڕەكان بگەڕێنەوە بۆ خاوەنەكەی دوایی وەرەوە بۆ لامان، چونكە مەڕەكان لە زیممەتی ئەودابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو لەبەر ئەوەی جەنگیان لەگەڵ دەكەین مەڕەكانیان بۆ خۆمان دەبەین، نەخێر بەڵكو فەرمووی: مەڕەكان بەرەوە بۆ خاوەنەكەی پاشان بگەڕێوە بۆ لامان.

بەهەر حاڵ لەدوای سەركەوتنی موسڵمانان لە یەكێك لە قەڵاكانی یەهوود دا تەرمەكەیان دۆزییەوە، جوولەكەكان زانیبوویان موسڵمان بووە كوشتبوویان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو بەندە ڕەش پێستە (شەهیدە) لە كاتێكدا یەك سوجدە و نوێژی بۆ خوا نەكردبوو.

ڕووداوێكیتر كە زۆر سەرنجی ڕاكێشاوم، كەسێك لە عەرەبەكانی غەتەفان بوو هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: دەمەوێت موسڵمان بم، پاشان بەشداری كرد لە جەنگەكانی خەیبەر لە قەڵای نەزار دا، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەست كەوت و غەنیمەت بەشی خۆی بۆ جیاكردەوە، بانگی كرد فەرمووی: ئەوە بەشی خۆتە، كەسە موسڵمانبووە نوێكە وتی جا ئەوە چییە من ئەوەم بۆ چییە، واهەستی كرد كە داوای بەشی زیاتر دەكات، بەڵام مەبەستی ئەوە نەبوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە بەشی خۆتە، ئەویش وتی یا ڕەسولی خوا ﷺ من بۆ ئەوە نەهاتووم دەستی برد بۆلای قووڕگی و وتی هاتووم بۆ ئەوەی تیرێك بەر ئەو ملەم بكەوێت و شەهید بم!



پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئەگەر ڕاستگۆبی خوای پەروەردگار بە ڕاستگۆیی خۆتت لەگەڵدا دەکات، پاشان کەسەکە بەردەوام بوو تا لەیەکێك لە قەڵاکان دا پێکرا و ڕێك تیرێك بەر ئەو جێگایەی کەوتبوو کە خۆی دەستی بۆ بردبوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بینی فەرمووی: ئەوە! ئەوە! زۆر سەرسام بوو پێی کە ئەو کەسەش لە ژیانیدا نوێژێکی نەکردبوو سوجدەیەکی بۆخوا نەبردبوو کەچی پلەی شەهیدی برد.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ئەوەی کە فەرمووی: ئەوە! ئەوە! دیسانەوە فەرمووی: لەگەڵ خوا ڕاستگۆبە، بەراستگۆیی خۆتت لەگەڵ دەکات.



# هەوڵی کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ژەهر

ماکوان: لە دوای شکستی یەهوود و جەنگ و لەدەستدانی هەموو ماڵ و سامانیان، لە دوای ئەوەی بەسەرشۆڕی هەموو فەرمانێکی پێغەمبەری خوایان ﷺ قبووڵ کرد، چەند هەفتە و مانگێك جەنگ کرا یەهوود شکست لە دوای شکست بەسەری دا هات، لە ئێستادا یەهوود بیر لە کوشتنی پێغەمبەر ﷺ دەکاتەوە، ئەویش گروپێك لەناو خەیبەردا بەسەرۆکایەتی ئافرەتێك بە ناوی (زەینەبی کچی حارس) کە خێزانی سەلامی کوڕی مشکەم بوو کە پێشتر موسڵمان کوشتبوویان.

لە دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێگای وەحی و موعجیزەوە بۆی ئاشکرابوو، بە ئافرەتەکەی وت بۆچی ئەو کارەت کردووە، زۆر بە ڕاشکاوانە زەینەبی کچی حارس وتی: دەمویست بتکوژم، بەڵام خوای گەورە نەیهێشت بەسەرتا سەربکەوم.

دەیویست تۆڵەی مێردەکەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکاتەوە و لە هەمان کاتدا تۆڵەی قەومەکەشی.

بەهەرحاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەموو یەهوودم بۆ کۆبکەنەوە، پاشان هەموو یەهوودی خەیبەر کۆبوونەوە، هەڵبەت ئەوانەی کە لە ناوچەکەدا بوون خەریکی دروستکردنی خواردنە ژەهراوییەکە بوون کە مەڕێکی برژاو بوو ژەهراوی کرابوو بۆ ئەوەی دەرخواردی پێغەمبەر ﷺ بدرێت، بەهەرحاڵ هەموو ئەوانە کۆبوونەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر پرسیارێکتان لێبکەم بە ڕاستگۆیی وەڵامم ئەدەنەوە!؟

جوولەکەکان وتیان: بەڵی ئەی ئەبو قاسم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باوکتان کێیە؟!

جوولەکەکان درۆیان کرد و وتیان باوکمان فلانە کەسە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: درۆ دەکەن، بەڵکو باوکتان کەسێکی ترە و ناوی باوکی پێ وتن.

جوولەکەکان وتیان: ڕاستت وت ڕاستیەکەت زانی!



پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشە پرسیارێکی ترتان لێ بکەم بەڕاستگۆیی وەڵامم ئەدەنەوە و درۆم لەگەڵدا ناکەن؟

جوولەکەکان وتیان: ئەی ئەبو قاسم پێشتر درۆمان لەگەڵ کردی خۆت ڕاستییەکەت زانی، خۆت زانیت باوکمان کێیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کێ خەڵکی ناو ئاگرە و دەچێتە دۆزەخ!؟

جوولەکەکان وتیان: دەچینە ناو ئاگر ماوەیەکی کەم بەڵام دوای ئەوە ڕزگارمان دەبێت و خوا لێمان خۆشدەبێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەمتان داخەن، وەڵلاهی لە ناویدا هەرگیز ناچنە دەرەوە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر پرسیارێکیترتان لێ بکەم بەڕاستی وەڵامم ئەدەنەوە؟!

جوولەکەکان وتیان: بەڵێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چی وای لێ کردن ژەهرەکە بکەنە ناو ئەو خواردنە؟!

جوولەکەکان وتیان: ویستمان بزانین ئەگەر درۆزنیت ڕزگارمان بێت لە دەستت، خۆ ئەگەر پێغەمبەریش بیت هیچ زەرەر و زیانێکت پێناگەیەنێت.

بە تەواوەتی ئەو کۆمەڵەی یەهوود لە ڕێگای ژنەکەی سەلامی کوڕی میشکەم ئەو پلانەیان ئەنجام دا بوو دانیانا بە تاوانەکەیاندا، کە چۆن ئەو مەڕە برژاوەیان ژەهراوی کردووە، پێویستە هەموو کەس مێژووی یەهوود و مامەڵەیان بزانێت.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ۝٣٧﴾ [ق]

واتە: بەڕاستی ئا لەو بەسەرهاتانەدا یادەوەری هەیە بۆ کەسێک دڵێکی زیندووی هەنێت، یاخود گوێ بۆ قورئان ڕادێرێت، لەکاتێکدا ئامادەبێت بۆ فەرمانبەرداریی و کردنی هەموو کارێکی درووست.

لەگەڵ ئەوکارەی کە کردیان گەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموویان خۆش بوو لەبەر ئەوەی بە ڕاستگۆیی دانیانا بە تاوانەکەیان، پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز لەبەرخاتری خۆی بەدوای تۆڵەدا نەگەڕاوە و تۆڵەی نەسەندۆتەوە، ئەوەش ڕەحمەتی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە دەردەخات لە ژیانیدا.



تەنانەت لەو ژنەش خۆش بوو کە مەڕە برژاوەکەی خستە بەردەمی، ئەگەر پێوەری جەنگی پێغەمبەر ﷺ بکەین لەگەڵ هەر جەنگێکی تر کەلەسەر ئەم زەوییەدا ڕووی داوە دەبینین بە ڕەحمترین کەس بووە، جەنگەکانی هەموو پرەنسیپە ئەخلاقییەکانی تێدا ڕەچاو کراوە.

لە جەنگی جیهانیی دووەم دا تەنها لە ئەڵمانیادا ( ١٧ ) ملیۆن خەڵکی سڤیل لەو جەنگەدا کوژراوە، یاخود بۆردومانکردنی هێرۆشیما و ناکازاکی بەچەکی ئەتۆمی، یاخود کوشتنی هیندە سوورەکان بەدەستی ڕۆژئاوا کە زیاتر لە (٨٠ )ملیۆن خەڵکی ئەمریکا کوژران و چەندین لە ئەفریقیا و ئاسیا و ئوستراڵیا.

بێجگە لە جەنگی ئەفیونی یەکەم و دووەم لە چین بە ملیۆن خەڵکی چینی کوژرا بەدەستی بەریتانیا، کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی بەریتانی زیاتر لە (٩) ملیۆن خەڵکی هیندستانی کوشت، بێجگە لە جەنگی ئەمریکا لە عێراق و ئەفغانستان.

لە جەنگی خەیبەردا لە ماوەی زیاتر لە مانگێکی خایەند تەنها (٧٣) پیاوی یەهوودی و یەك ژن کوژرا، لە موسڵمانانیش (١٦) کەس شەهید بوون.

ئەو ژنەش کە کوژرا ئەو ئافرەتە بوو کە مەڕە برژاوەکەی ژەهراوی کردبوو خستییە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ و لێی خۆش بوو، بەڵام لەسەر کەسێک کوژرا بە ناوی (بیشری کوڕی بەڕائی کوڕی مەعرور)[٦٨] بوو ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر ﷺ پارچەیەك لە گۆشتەکەی خستە ناو دەمی کە مەڕە برژاوەکە هاتە دەنگ و وتی مەمخۆن، من ژەهراوی کراوم، بیشر دەڵێت لەبەر حورمەتی پێغەمبەر ﷺ نەمویست گۆشتەکە فڕێدەمە سەر سفرەکە و خۆم بڕشێنمەوە، لەبەر ڕێزی پێغەمبەر ﷺ گۆشتەکەم خوارد.

پاشان بیشری کوڕی بەڕائی کوڕی مەعرور کە شەهید بوو بە خواردنی ئەو گۆشتە لە حەقی خوێنی ئەو هاوەڵە دا کوژرایەوە.

ئەوە جەنگی خەیبەرە کە زۆرێك لە بێدین و ڕۆژهەڵاتناسەکان، دەیانەوێت بۆ مەرامی گڵاوی خۆیان بە سپۆنسەری عەلمانیەکان گومان لە دڵی خەڵکیدا درووست بکەن.

لە دوای شکستی یەهوود دەستیان کرد بە کۆچکردن لە مەنزڵگاکەیان، خەیبەر زۆر دەوڵەمەند بوو لە ڕووی زەوی کشتوکاڵییەوە، پاشان جارێکی تر گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٨] ـ بشر بن البراء بن معرور.



خوا ﷺ و وتیان دەرمانمەکەن ئێمە لەسەر ماڵ و سەروەتی خۆمان دەمێنینەوە و خاکی خەیبەر زۆرە ئێمە بۆت چاك دەكەین و بەروبوومی خەیبەر بۆ دەوڵەتی ئیسلامییە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بیرۆکەکەیانی بەدڵ بوو، بەڵام مەرجی بۆ دانان بۆ ئەوەی جارێکی تر بیر لە خۆ بەهێزکردن نەکەنەوە، مەرجەکەش ئەوەبوو دەتوانن بمێننەوە، بەڵام هەرکات پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەرچن دەبێت بڕۆن، پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕەحمتر بوو لەوان فەرمووی: بەروبوومەکەی لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دابەش دەکەین.

چونکە هاوەڵان سەرقاڵبوون بە جیهادەوە، پاشان بازرگانی و کاری کشتووکاڵی بۆ هاوەڵان زۆر سەخت بوو کاتی زۆری لێ دەگرتن لە کۆتاییدا لە جێگای خۆیاندا مانەوە، بەڵام موسڵمانان فەرمانڕەوایی خەیبەریان دەکرد و ئیدارەی ئەم ناوچەیە لەدەستی موسڵماناناندا بوو، یەهوود لە خەیبەر مانەوە هەتا وەکو سەردەمی ئیمامی عومەر، لە کاتی فتوحاتی ئیسلامی یەهوودی خەیبەر جاسووسی بۆ فارس و ڕۆم دەکرد و نهێنی موسڵمانانیان ئاشکرا دەکرد، گومانی زۆریان بڵاو دەکردەوە، ناچار ئیمامی عومەر کوڕی خەتاب، هەموویانی نارد بۆ ناوچەکانی تری ئیسلامی وەکو دیمەشق، فەلەستین، عێراق، میسر و....هتد.

بەم شێوەیە کۆتایی بە جەنگی خەیبەر هات، موسڵمانان سەروەت و سامان و غەنیمەتێکی زۆریان دەستکەوت لەو جەنگەوە، تا ئەو ڕادەیەی کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و خاتوو عائیشە فەرموویان: لە خورما هەرگیز تێرمان نەخوارد هەتاکو فەتحی خەیبەر کرا.

بە هەموو پێوەرێك سەرکەوتنێکی گەورە بوو، هەموو یەهوودی ناوچەکە وەکو یەهوودی (وادی قورا) لە هۆزی تیما و هەموو خۆیان دا بەدەستەوە بە دەوڵەتی ئیسلامی، لە دواییدا جوولەکەی (فەدەك)یش بەهەمان شێوە پاشان دیکۆمێنتی زۆر کەوتە دەست موسڵمانان و هەروەها کۆمەڵێك لە تەورات و لاپەڕەکانی تەورات دەستی بەسەردا گیرا، بۆ جاری سێیەم یەهوود هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئەو تەورات و وەرەقە و نووسراوانەیان کردەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەی دەیزانی هەموو گۆڕانکاری تێدا کراوە هەمووی دانەوە بێئەوەی یەك پارچەی لێ ون بکرێت، یاخود بیسووتێنێت لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای پێدان کە بەئارەزووی خۆیان ئازادانە پیادەی دینی خۆیان بکەن.

لە کاتێکدا لە وڵاتانی ڕۆژئاوا باسی ئازادی و مرۆڤدۆستی دەکرێت، ئەوان ڕێگا دادەنێن بۆ موسڵمانان چۆن دینداری بکەن و لافوگەزافی ئازادیش لێئەدەن، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا



ﷺ (١٤٠٠) ساڵ پێش ڕۆژئاوا پیادەی ئازادی و سەربەستی و ڕێزی ئایینەکانی گرتووە و پراکتیزەی کردووە و منەتیشی بەسەریاندا نەکردووە.

لە بیرمان نەچێت جەنگی یەهوود لەسەر بیروباوەڕ نەبوو، بەڵکو لەسەر خیانەت و پلان و کارە چەپەڵەکانیان بوو، کە سوپایان کۆکردەوە بۆ سەر موسڵمانان و پارە و سەروەتیان بە لێشاو خەرج دەکرد بۆ لەناو بردنی موسڵمانان، لەسەرەتاوە تا کۆتایی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سزادانیان دەرچوو لەسەر سەرپێچییەکانیان، لەوەی چەند جار هەوڵی کوشتنی پێغەمبەریان دا و هاوکاری دوژمنانی موسڵمانان بوون.

پێوەری جەنگی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ یەهوود دا بکەین، بە جەنگی ئێستای یەهوود لە فەلەستین کە چۆن منداڵ و ژن و پیر و جوان دەکوژێت و بێجگە لەوەی کە لە جیهاندا هەرچی کاری قێزەون و فەسادی ڕەچاو دەکرێت یەهوودە.



# دوای جەنگی خەیبەر

ماکوان: لە دوای جەنگی خەیبەر هەموو ناوچەکانی تر هاتنە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئیسلامی و هەموو خۆیان ڕادەستی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە خەیبەر و تەیما و فەدەك و وادی قوڕا.

هەموو ڕازی بوون بەو شێوە سوڵحەی خەیبەر نیوەی بەروبووم بۆ موسڵمانان, هەرچەندە یەهوودی وادی قوڕا هەندێك بەرگریان کرد لە کۆتاییدا ئەوانیش بەهەمان سوڵح ڕازیبوون.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی سەفەری ساڵی ٧ی کۆچی گەڕایەوە شاری مەدینە و ماوەی زیاتر لە مانگێکی پێچوو لەم جەنگە دا، لە کۆتاییدا پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ خەمی نەما لە مەترسی و خەتەرناکی یەهوود و بەتەواوەتی سەرکەوت بەسەریاندا.

ئێستا یەهوود کۆتایی هات و لەگەڵ قورەیش بۆ ماوەی (١٠) ساڵ پەیمان بەستراوە، ئەوەی کە ماوەتەوە تەنها غەتەفانە، پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لەوە کردەوە کە دەبێت ئەوانیش سزای خۆیان وەربگرن لەسەر ئەو (٦) هەزار سەربازەی کە کۆیان کردبووەوە بۆ سەر پێغەمبەر، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەوڵی دانانی پلانێکی حەکیمانە دابوو بۆ لێدانی غەتەفان، نەیدەهێشت هەروا بە ئاسانی بەسەریاندا بڕوات لەسەر ئەو هەموو خیانەت و زەندیقییەی کە ئەنجامیان دا لەگەڵ قورەیش و پاشان لەگەڵ یەهوود دا.

لە دوای بڵاووبوونەوەی هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان بەسەر یەهوود دا فەتحی قەڵاکانی خەیبەر ئەوەندەی تر موسڵمانانی بەهێزتر کرد و لە ناوچەکە دا دەسەڵاتیان زیادی کرد، قورەیش چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد زۆر ترسیان لێ نیشت و لەهەمان کاتدا زۆریان پێناخۆش بوو، ئیرەیی تەواویان بە موسڵمانان دەبرد.

منیش لە ناوچەی خەیبەرەوە گەڕامەوە بۆ ژێر دەواری نومێر و لە دوورەوە لە بەردەم دەوارەکە دا نومێر چاوەڕێی دەکردم، زۆر بە خۆشحاڵییەوە باوەشم پێیدا کرد و وتم ئەوە تۆ لە کوێیت پایزە برا.

نومێر: وەڵڵا ماکوان گیان ببوورە زۆر نەخۆش بووم، ئەی دەنگوباسی تۆ؟!

ماکوان: من هەروەکو خۆم لە زیندان دام، بەڵام ڕاگوازراوم بۆ زیندانێکی تر چاوەڕوانی گەڕانەوەم بۆ وڵاتی نەرویج، بەس پێم بڵێ ئەو ڕاغیبە کێیە؟!



نومێر: ئەوە کەسێکی بەتوانایە ئەویش وەکو تۆ زۆر حەزی بە ژیانی پێغەمبەرە ﷺ لێی وردبێتەوە، کەسێکی خواناس و زیرەکە.

ماکوان: بە دڵنیاییەوە لە شیتەڵکردنی ڕووداوەکان زۆر زیرەک و بەتوانا بوو، ئاگاداری وردو درشت بوو، ئەی ئێستا لە کوێیە؟!

نومێر: ئەویش هەروەکو خۆمان خاوەنی پرۆژەی تایبەتی خۆیەتی و ئەویش ئەرکی زۆر لەسەرە، هەرچەندە لە نەبوونی مندا، ئەو هەر لەگەڵتا دەبێت و هاوکاریت دەکات.

ماکوان: زۆر باشە خوا پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە، خۆمان پرۆژەکە بەیەکەوە بەڵکو تەواو بکەین، خۆ ئێستا تەندرووستیت باشە؟!

نومێر: بەڵی، سوپاس بۆخوا زۆر باشم، بەیانی بەیەکەوە دەڕۆین بۆ ناو شاری مەدینە و زیاتر سەرنجی ڕووداوەکان ئەدەین.

ماکوان: زۆر باشە پێویستە ئێستا شیتەڵ بۆ هێزی موسڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین، ڕووداووەکان زۆر گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە هەموو چەند مانگێکی ماوە موسڵمانان بڕۆن بۆ عومرە بەو پێیەی کە لە پەیماننامەکەدا هاتووە، ڕووداوەکان زۆر گرنگن.

هێزی دەوڵەتی ئیسلامی

ماکوان: لەگەڵ نومێردا هەندێك گفتوگۆمان کرد و پرسیاری لێکردم ماکوان؛ بەگشتی کاریگەری ئەم جەنگە چی بوو؟!

ماکوان: کاریگەری ئەم جەنگە زۆر گەورە بوو لەسەر عەرەب بە تایبەتی بۆ ناوچەکانی جیهان بە گشتی، ئەتوانین دابەشی بکەین بەسەر سێ خاڵدا.

یەکەم: موسڵمانان سەرکەوتن، لایەنی قوڕەیش وای لێهات کە هەموو لە دەوروپشتی وردە وردە کەم بوونەوە و ڕووەو موسڵمانان خەڵک دەهات، خودی قوڕەیش هەستی بە گەورەیی و عەزەمەتی دەوڵەتی ئیسلامی کرد، بەتایبەتی لە دوای فەتحی خەیبەر، قوڕەیش وا هەستی دەکرد کە هێزی جوولەکە لە خەیبەردا لەبن نایەت بە هۆکاری زۆری و دەوڵەمەندی و قایمی و هێزی قەڵاکانیان، چونکە بەهێزترین قەڵا و بینابوون لە ناو نیوەدوورگەی عەرەبدا، وایان هەست دەکرد کە جوولەکە بەهێزترین جەنگاوەرن لە جەنگکردندا شارەزا و خاوەن ستراتیژین، لەهەمانکاتدا خاوەنی چەکی بەهێز و زۆرن، شکستی خەیبەر تەنها بۆ جوولەکەکان نەبوو بەڵکو زۆر گەورە بوو بۆ عەرەبی ناوچەکە و شکست بوو بۆ قوڕەیش لەناو ماڵی خۆیدا،



قورەیش هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە موسڵمانان بتوانن بەسەر یەهوود سەربکەون، فەتحی خەیبەر زۆر ئەستەم بوو لەلای قورەیش.

دووەم: موسڵمانان لایەنی یەهوودیان شکست پێهێنا لە دوای خەیبەر یەکەم هێزی ناوچەکە و نیوەدوورگەی عەرەب موسڵمانان بوون، هیچ کەس نەیدەتوانی کێبڕکێ لەگەڵ موسڵماناندا بکات، موسڵمانان تەنها بە فەتحی خەیبەر وازیان نەهێنا، بەڵکو هەموو ناوچەکانی تەیما و فەدەك و وادی قورایان کۆنترۆڵ کرد، هەموو ناوچە و کۆمەڵگای یەهوود هاتە ژێر ئاڵای ئیسلام و حوکمڕانی ئیسلامی بوو لە باکووری شاری مەدینە دا.

سێیەم: هێزی موسڵمانان بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کرد و ڕۆژ بەڕۆژ لە زۆر بووندا بوون، لە ڕووی چەندێتی و چەندایەتی و ڕۆحی مەعنەویش فەتحی خەیبەر خێر و سوودی زۆری بۆ دەوڵەتی ئیسلامی لە شاری مەدینە دا بەدوای خۆیدا هێنا، تەنها لایەنی سەربازی نەبوو، بەڵکو لایەنی ئابووری دەوڵەت زۆر بەهێز بوو، خاتوو عائیشە دایکی ئیمانداران دەفەرمووێت لە دوای فەتحی خەیبەر تێرمان لە خورما خوارد، واتا موسڵمانان ئەوەندە لە ڕووی ئابوورییەوە پێشتر لاواز بوون تێر سکی خۆیان نان و خواردنیان نەبوو بیخۆن.



## زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی شاری مەدینە و موسلمانبوونی عەرەب

ماکوان: ژمارەی دانیشتوانی شاری مەدینە بە شێوەیەکی گشتی ڕۆژبەڕۆژ لە زۆربووندا بوو، ڕۆژانە خەڵکی موسڵمان دەبوون و هیجرەتیان دەکرد بۆ شاری مەدینە لە جێگا جیاوازەکانی نیوەدوورگەی عەرەبەوە خەڵکی دەهاتنە ناو شاری مەدینە و کۆمەڵگەی موسڵمانان بە شێوەیەکی یەکجار بەرفراوان بوو، گەڕەکەکانی مەدینە هەموو پر ببوون لە خەڵك و بازاڕ و کار و کردار لەو شارەدا بە تەواوەتی بووژابووەوە، لە سەرو ئەمانەوە لەکاتی فەتحی خەیبەر دا موسڵمانانی حەبەشە هەموو گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، بەسەرکردایەتی (جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیب) هەر کە بیستیان پێغەمبەر ﷺ لە جەنگدایە لە خەیبەر هەموو بەرەو خەیبەر ڕۆیشتن کە چوونە ئەوێ جەنگ تەواو ببوو، چونکە بە نیازی جیهاد بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی غەنیمەتی موسڵمانانی حەبەشەی دا، چونکە نییەتیان جیهاد بوو.

کۆڕای ئەم ڕووداوانە دوو هۆزی گەورەی عەرەب لە یەمەنەوە هاتنە ناو ئیسلام بە سەرکردە و خەڵکەکەیەوە هیجرەتیان کرد بۆ شاری مەدینە کە بریتیی بوون لە هۆزی (ئەشعەری) بە سەرکردایەتی (ئەبو موسای ئەشعەری) و هەروەها هۆزی ( دەوسی) بە سەرکردایەتی (توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی) لە دوای فەتحی خەیبەر و سوڵحی حودەیبییە موسڵمانان ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبووندا بوون لە ناو شاری مەدینەدا.

هەروەها موسڵمانانی زۆر لەشاری مەککەوە هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە لە دوای ڕووداوەکەی (ئەبو بەسیر) کە قوڕەیش تەنازولی کرد لە بەندێک لە بەندەکانی پەیماننامەی حودەیبییە.

هێزی موسڵمانان لە گەورەبوون دابوو دەوڵەتەکەیان لە بەهێزی دابوو، بە پێچەوانەوە ڕۆژ بە ڕۆژ قوڕەیش لە لاوازی دابوو، خەڵکی لێ موسڵمان دەبوو هەموو هیجرەتیان دەکرد بۆ شاری مەدینە.

پاشان ژمارەیەکی زۆر لە عەرەبی ناوچەکە موسڵمان بوون، هەموو هاتنە ناو ڕیزی موسڵمانان، هەموو بە ئاشکرا و بێ ترس موسڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیاند و لە دوای پەیماننامەی حودەیبییە ترسی قوڕەیشیان نەمابوو.




ئێستا ئەوەی ماوەتەوە غەتەفانە، ئەو هێزە مورتەزیقەیەی کە بەپارە جەنگ دەکات و بەکاردەهێنران لە جەنگی ئەحزاب دا دژی موسڵمانان لە لایەن یەهوودەوە کە (٦هەزار) سەربازیان پێکهێنابوو.

ئەم هێزە لە ناوچەکەدا لە قورەیش ترسناکتر بوون، پێویستە چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە.



ئێستا ئەوەی ماوەتەوە غەتەفانە، ئەو هێزە مورتەزیقەیەی کە بەپارە جەنگ دەکات و بەکاردەهێنران لە جەنگی ئەحزاب دا دژی موسڵمانان لە لایەن یەهوودەوە کە (٦هەزار) سەربازیان پێکهێنابوو.

ئەم هێزە لە ناوچەکەدا لە قورەیش ترسناکتر بوون، پێویستە چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە.



## ئامانجەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە ساڵی ٧ی کۆچیدا

ماکوان: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بە شێوەیەکی ستراتیژی بە پلانێکی تەرتیب دەجوڵێن و ئامانجەکانیان بەدی دەهێنن، کە کارێك ئەنجام دەدات بە دوایدا کارێکیتری ڕێکدەخست پێکانی ئامانجەکانی زنجیرە ئامانجێك بوون هەموو پێکەوە گرێ درابوون.

لە ڕاستیدا ئامانجی یەکەمی بریتی بوو لە فەتحی خەیبەر، بەکارهێنانی ئەو پەیماننامەی قورەیش سوود وەرگرتن لە کات.

ئامانجی دووەمی بریتیی بوو لە سنووردانان بۆ هۆزی غەتەفان و وەستانیان لە سنوورێکدا، ڕێگری لە ترسی غەتەفان.

پاشان تۆڵە سەندنەوە و پاراستنی کەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامی، هێزی بۆ ئامادە دەکرد کە بڕواتە سەریان و تەمێیان بکات.

جێگای خۆیەتی سەرنجتان بۆ شتێك ڕابکێشم، ئەویش ئەوەیە هێزی موسڵمانانە، ئەگەر قورئان کاریگەری هەبێت لەسەر دڵ و دەروونی خەڵکی بەگشتی بە دڵنیاییەوە هێزیش کاریگەری تایبەتی هەیە لەسەر دڵی هەندێك کەس، هێز و ڕووکەشی هێز کاریگەری تەواو لەسەر دڵ و دەروونی خەڵکی ناوچەکە دانابوو، سەرسام بوون بە عیزەت و توانای موسڵمانان، توانای سەربازی و ناردنی نوێنەری دەوڵەتی ئیسلامی بۆ هێز و ناوچە و دەوڵەتەکانی جیهان.

پاشان بەردەوامبوونی بانگەواز ژمارەیەکی زۆری موشریکی عەرەبی موسڵمان کرد، هەروەها نامەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هۆکاری هیدایەتی زۆر و هاتنی خەڵکی وڵاتان بوون بۆ ناو ئایینی ئیسلام، لە دیارترینیان دەوڵەتەکانی مونزیری کوڕی ساوا بوو کە خۆی و وڵاتی بەحرەین هاتنە ناو ئیسلام، وڵاتی بەحرەین بریتیی بوو لە ناوچەکانی نەجد و ئیماراتی ئێستا و قەتەر و کوێت و بەشێکی عێراق.

هەروەها وڵاتی یەمەن بە تەواوەتی ئیسلام بوون و لە دوای موسڵمان بوونی سامانی کوڕی بازانی فارسی، هەموو ناوچەی عومان هاتنە ناو ئیسلام بە سەرۆک و گەلەکەیەوە کە بریتیی بوون لە جەیفەر و عەبد.

لە بیرمان نەچێت یەمەن لە باشووری شاری مەککەیە بەحرەین و عومان لە ڕۆژهەڵاتی مەککەیە و شاری مەدینەش باکووری شاری مەککەیە ڕۆژئاواش ناوچەکانی خوزاعە و عەرەبەکانی کەناری دەریای سوورن هەموو بە گشتی موسڵمان بوون.



شاری مەککە چواردەور درابوو بە موسڵمانان هێزی ئیسلامی ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبوون دابوون، پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی بڵاوکردبووەوە بۆ بانگەواز و گەیاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، خەڵکی ئێستا بێترسان لە قورەیش موسڵمان دەبێ، ئامانجی گرنگ لەساڵی (٧ی کۆچی) بڵاووکردنەوەی بانگەوازی ئایینەکە بوو لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە بانگەوازەکە بەشێوەیەکی گشتی هەموو جیهانی گرتەوە.

لەم ساڵەدا ئامانجی سەرەکی بریتی بوو سنووردانان بۆ غەتەفان کە هۆزێکی گەورەی عەرەب بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی بە هێزی ئامادەکرد بۆ چوونە سەر هۆزی غەتەفان بە گشتی، بەڵام پێشتر (٦) مەفرەزە و سریەی کردە سەریان هەمیشە لەگەڵیان لە جەنگدا بوون، چونکە بەڕاستی خەڵکێکی شەڕەنگێز و ترسناك بوون و چەتە و ڕێگر بوون، بۆ پارە هەموو شتێکیان دەکرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە ڕێخستنی سوپا و چوونە سەر غەتەفان.

نومێر: با بڕۆین بۆ شاری مەدینە بزانین هەواڵ چییە و ئەگەر کرا لەگەڵ ئەو سوپایە با بڕۆین بزانین چی ڕوو ئەدات و ژمارە و سەرکردە و کەسەکانی ناو ئەو سوپایە کێن؟!

ماکوان: بە خۆشحاڵییەوە با بڕۆین، چونکە ئەم جەنگە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی سەرکردایەتی دەکات و خۆی لەگەڵ سوپاکەدا دەردەچێت.



# غەزوەی (ذات الريقاع)

ماکوان: ئەم غەزوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی سەرپەرشتی سوپا و جەنگی دەکرد، لە مانگی ڕەبیعی ئەوەلی ساڵی ٧ ی کۆچی لە دوای گەڕانەوەی لە خەیبەر لە ماوەیەکی کورت و خێرا بۆ ئەم جەنگە دەرچوون، موسڵمانان لە بزوتنەوەیەکی جیهادی بەردەوام دابوون، دانیشتن و تەقاعود بوون ناتوانن لە ناو موسڵماناندا نەبوو بەڵکو هەموو بە پیر و جوان و ژن و پیاو لە پێناوی خودا ئاواتەخوازی جیهاد بوون.

لەم جەنگە دا ئەبو موسای ئەشعەری و جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیب بەشدار بوون، سوپاکە بەڕێکەوت بەرەو ناوچەی غەتەفان، بۆ تۆڵە سەندنەوەی ئەو هاوکارییەی لەگەڵ قوڕەیش و یەهوود کردیان و شاری مەدینەی پێغەمبەریان ﷺ گەمارۆدا.

هۆکاری ئەم جەنگە ئەوە بوو لە دوای فەتحی خەیبەر غەتەفان خۆیان ئامادە کرد بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئازایەتییەکی بێوێنەدا خۆی تەشریفی برد و سەرکردایەتی سوپاکەی کرد، بۆ ئەوەی غەتەفان واهەست نەکات کە موسڵمانان لێیان دەترسن، سەرۆکەکەیان توانای ڕاستەوخۆی نییە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵکی غەتەفان.

سوپای موسڵمانان لە ناوچەکەدا دابەش ببوون، هەندێکیان لە شاری مەدینە دا بوون، هەندێکیتر لە خەیبەر و هەندێك مەفرەزە و سریە لە ناوچەکانی تردا وەکو وادی قوڕا و فەدەك و ئەیمان... هتد.

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای لە ناوچەکە دا بڵاوکردبووەوە، بۆ ئەوەی هیچ شتێکی نەخوازراو ڕوونەدات.

هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ (٧٠٠) هاوەڵی لە سوپاکەیدا کۆکردەوە بەرەو خاکی غەتەفان بەڕێکەوتن.

ئەم سوپایە بۆ ناو خاکی غەتەفان و خەڵکەکەی زۆر زۆر کەمە، بەڵام لە ڕاستی هێز و توانا و ئازایەتی و چاونەترسی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانان دەردەخات.

تەنانەت بە شەش هاوەڵ یەک وشتریان پێ بوو کە بەنۆرە سواری وشترەکان دەبوون، نێوانی مەدینە و غەتەفان بیابانێکی دوورودرێژە ماڵەکانی غەتەفان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی مەدینەیە، گەیشتن بۆ ناوچەکەیان چەند شەو و ڕۆژێك دەخایەنێت.



زۆرێك لە هاوەڵان هەر بە پێ دەڕۆیشتن، ئەوەندە بە پێ ڕۆیشتن تا پێستی قاچیان ڕۆیشت تەنانەت نینۆکی قاچیان هەڵکەنرا.

ئەبو موسای ئەشعەری دەفەرموویێت: هەر ٦ کەسمان وشترێکمان پێ بوو، تەنانەت قاچمان هەموو پێستی ڕۆیشتبوو نینۆکی قاچمان هەموو وەران و هەڵکەنران، هەر بۆیە جەنگ و غەزوەتەکە ناونرا بە (ذات الرقاع) واتا هۆکاری ئەوەی کە نەعلەکانمان بە پێوە نەما و هەموو دڕا و قاچمان پێستی پێوە نەما.[٦٩]

ئەم هەوڵ و کۆششەی هاوەڵان و پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓءَالِهِۦوَسَلَّمَ ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە تا چەند لە هەوڵ و جیهاد و خەبات دا بوون تا ئەم ئایینە بڵاوبکەنەوە، تا ئەو ڕادەیەی کە توێکلی قاچ پێست و نینۆکەکانیان پێوە نەماوە.

لە ساڵی ٧ی کۆچیدا بزوتنەوەیەکی جیهادی تەواو و بێوەستان، هەمیشە ئەو ساڵە بێوچان لە پێناوی خوادا لە جیهادا بوون، ئەگەر تەماشای سێ مانگی کۆتایی ساڵی ٧ی کۆچی بکەیت دەبینیت چەندە چالاکبوون پەیمانی حودەیبییە ڕوویدا، پاشان فەتحی خەیبەر کە زیاتر لە مانگێکی خایەند، سەرکەوتنێکی بێوێنەیان بەدەستهێنا و دوای چەند ڕۆژێك خێرا دەرچوون بۆ جەنگی غەتەفان، کە بەهێزترین و دڕندەترین هۆزەکانی عەرەب بوون.

پاشان گەڕانەوەی جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیب و هەوەها هاتنی سێ دەوڵەتی گەورە بۆ ناو ئیسلام، هۆزی ئەشعەری و هۆزی دەوس هەموو چالاکی گەورەی موسڵمانان بوو، وا لە ڕێگادان بەرەو جەنگی گەورەی غەتەفان.

هەرگیز لە ماوەیەکی کەمی ژیانی پێغەمبەری خوادا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓءَالِهِۦوَسَلَّمَ ئەو هەموو ڕووداوە گەورە و چالاکییانە ڕووی نەداوە، ئەمەش تەنها و تەنها تەفسیری ئەوەمان بۆ دەکات کە پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓءَالِهِۦوَسَلَّمَ و هاوەڵان چرکەساتیان بە فیڕۆ نەداوە.

هەمیشە لە بەخشینی ماڵ و سامان و ڕۆح دابوون، هەر بۆیە خودای پەروەردگار بەرەکەتی خستە ناو ژیان و کار و کردەوەیان، بەو ماوە کورتە توانیان گەورەترین ئامانج بپێکن، ئەگەر بە پێوەری ماددی بیری لێبکەینەوە و شیکاری بۆ بکەین، ئەستەمە و ئەقڵ پێی قبوڵ ناکرێت، بەهەموو پێوەرێك موعجیزەیە.

[٦٩] ـ قال أبو موسى الأشعري: (فِي غزوةٍ وَنحنُ ستةُ نفَر بينا بعير تعتقهُ فنقيت أقدامنا ونقيت قدماي وسقطن أظفاري وكنا نلق على أرجلنا الخرق, فسميت غزوة ذات الرقاع كما كنا نعص من الغرق على أرجلنا)رواه البخاري.



پێغەمبەری خوا ﷺ بە (٧٠٠) سەربازەوە لە غەتەفان نزیكبووەوە، ناوچەكەیان بەرفراوانە و خاوەنی سەرمایەی مرۆڤ و سوپا و هێزن، موسڵمانان ماندوو و شەكەت و برسی و تینوون، چونە سەر ماڵ و مەنزڵگا و سەربازگەیان، داخۆ دەبێت غەتەفانی بەهێز و بەتوانا چ جەنگێك بكات؟!

خوای گەورە ترس و لەرزی خستە ناو دڵی غەتەفان، لەو ڕەوشەی كە موسڵمانانی تێدایە لە جێگای دوورەوە هاتوون بۆ جەنگ كەچی غەتەفان نەك خۆیان ئامادە نەكرد بۆ جەنگ بەڵكو هەموو بڵاوەیان كرد و ڕایان كردە سەر شاخ و لەبنگرد و بەردەكاندا خۆیان حەشاردا، ئەم ڕەوشە هیچ تەفسیرێك هەڵناگرێت، تەنها ئەو تەفسیرەی بۆ دەكەین، كە پێغەمبەری خوا ﷺ هێزێكی بێوێنەی خوایی لەگەڵدایە و هەروەك دەفەرمووێت: ئەگەر ڕێگای مانگێك لە دوژمنەوە دووربم ئەوا دوژمن ترس و لەرز دەكەوێتە دڵی و سەردەكەووم.[٧٠]

هەر پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بگاتە سەریان، ئەوان هەموو ڕایانكرد, بۆ ئێمە نوێ نییە،خوای گەورە بۆ پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان هەمان كرداری بۆ ئەنجام دان كە پەیوەست بوون بە خوا و مەنهەجەكەی لە نموونەی بەدر و ئەحزاب و خەیبەر، هەركات موسڵمانان پابەندبوون بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ و ئاڕاستەكانی بە دڵنیاییەوە خوا سەركەوتن دەنێرێت و ترس و خەم و دڵەڕاوكێ دەخاتە دڵی كافران.

خوای گەورە لە سوورەتی آل عمران دەفەرمووێت:

﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًاۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٥١﴾ [آل عمران]

واتە: (ئەی گرۆی ئیمانداران دڵنیابن) لەمەودوا ئێمە: ترس و بیم فرێ دەدەینە دڵی ئەوانەی بێ باوەڕن، بەهۆی ئەوەی شەریك و هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداوە بێ ئەوەی خوا هیچ دەسەڵاتێكی پێدابن (بۆ دانانی هاوەڵگەری)، ئەوانە سەرەنجامی گەڕانەوەیان ئاگری دۆزەخە كە چەند ناخۆش و خراپە جێگەی ستەمكاران.

هەركات موسڵمانان پەیوەست بوون بە خواوە، خوای گەورە دیارییان پێشكەش دەكات، مەبەست لە دیاری سەركەوتنە بە سەربازانی خۆی، ئاخر ئەو شعوورنزمەی هەڵهاتن و ڕاكردنی غەتەفان لە بەرامبەر سوپایەكی كەمدا، تەنها دەتوانین بڵێین خوای گەورە موعجیزەی خۆی دەبەخشێت بە موسڵمانان.

---

[٧٠] ـ (نصرت بالرعب مسيرة شهر).



ژیانی ئەم هۆزە هەمیشە لە چەتەیی و جەنگ و ڕێگری دابووە بەم شێوە سەرشۆڕییە ڕایانکرد!

ئینجا کە ئەو شعوورە بۆ خەڵکی غەتەفان درووست بوو، هەموو بیریان لەوە کردەوە توانای ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانانیان نییە، پێویستە پەیمانیان لەگەڵ ببەستن ئەوەش بیرکردنەوەیەکی زۆر باش و ئەرێنی بوو لەلایەن غەتەفانەوە، چونکە بەڕاستی ترس وای لێکردن کە ئەژنۆیان شکا بەرامبەر موسڵمانان، حاڵی موسڵمانانی ڕەش و ڕووتیش لەوپەڕی لاوازی دابوو تەنانەت نەعلەشیان لە پێدا نەمابوو، پێستی قاچیان و نینۆکیان پێوە نەمابوو، بەڵام سەرکەوتنی خوای لە جێگایەکەوە دێت کە مرۆڤ هەرگیز پەی پێنەبردووە.

ڕاستە! ڕاستەوخۆ موسڵمان نەبوون بەڵام ئیتر بیریان کردەوە ئەم کۆمەڵە کەسە هەروا سادە و سانا نین دەستێکی گەورە دەیان پارێزێت!

دینەکەیان ڕاستە و هێزی خوایان لەگەڵدایە

﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَـٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ۝٤٢﴾ [فصلت]

واتە: هیچ ناحەقی و نادرووستی و ناتەواویەک ڕووی تێ ناکات لە هیچ کاتێکدا و لەهیچ لایەکەوە ڕەوانەکراو و نێردراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و داناییە و شایانی سوپاس و ستایشە.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە زانی هەموو ڕایانکرد گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، بەڵام کاریگەری زۆری بە جێهێشت لەناو غەتەفان.

لەگەڕانەوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ماندوو بوو لە جێگایەکدا سوپاکەی بۆ حەوانەوە و پشوودان مانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە بندارێك و شمشێرەکەی خۆی پێیدا هەڵواسی و لە تاو ماندوویێتی خەوی لێکەوت.

سوپاکەش لە کاتی گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە هەموو بڵاوەیان لێ کردبوو، ئەو ناوچەیە چڕ بوو بە دارخورما و داری تر، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ پاسەوانێکی نەبوو، سوپاش هەموو خەوی لێکەوتبوو، چونکە سوپای سەرکەتوو بەرەو شاری مەدینە دەگەڕانەوە و بۆ جێگا و مەنزڵگای خۆیان، بەڵام هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو یان لەوانەیە بۆ ئەوە بووبێت کە زیاتر موعجیزەی پێغەمبەر ﷺمان بۆ دەرکەوێت.

کەسێکی دەشتەکی لە غەتەفان شمشێرەکەی پێغەمبەری گرت بە دەستەوە و خستییە سەر سەری پێغەمبەرمان ﷺ بە ئاگاهات، (ئەعرابییەکە) واتە دەشتەکییە موشریکەکە وتی: ئەی محەمەد لێم دەترسی؟



پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر بەسادەیی فەرمووی: نەخێر لێت ناترسم.

خۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر ئاسان بوو بۆ کوشتنی لەوێدا بێ چەك و پاسەوان بوو، خۆ ئەو کارەی بکردایە دەبووە خاوەن شەرەفێکی زۆر گەورە لە ناو عەرەبی موشریك بە گشتی غەتەفان و قورەیش بەتایبەتی.

کابرای موشریکی دەشتەکی لە بیریچوبوو کە خودا دەیپارێزێت و ئاگاداری پێغەمبەرەکەیەتی و دەفەرمووێت:

﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ ۚ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾﴾ [المائدة]

واتە: ئەی پێغەمبەر و فرستادە، هەرچی فەرمان و پەیامێکت بۆ دابەزیوە لەلایەن پەروەردگارتەوە (بێ دوودڵی، بێ ماتڵی) ڕای بگەیەنە، خۆ ئەگەر بەو کارە هەڵنەسایت، ئەوە مانای وایە پەیامەکەیت (بەتەواویی) نەگەیاندووە (دڵنیاش بە) خوا دەتپارێزێت لە شەڕ و خراپەی خەڵکی، چونکە بەڕاستی خوا هیدایەت و ڕێنموویی قەوم و هۆزی بێ باوەڕان نادات.

گفتوگۆ لە نێوانیان دەستیپێکرد! بەوەی کە وتی لێم دەترسی کەچی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر لەسەر خۆ و بێترس و تێکچوون فەرمووی: نا لێت ناترسم.

ئەعرابییەکە وتی: کێ دەتوانێت لە دەستم ڕزگارت بکات!؟

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: (الله)، یەکسەر دەشتەکییەکە شمشێرەکەی لەدەست کەوتەخوار و پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵیگرتەوە، بۆی هەڵساوە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەعرابییەکەی دانیشاند و پێی فەرمووی: ئەی کێ ئێستا لە دەست من ڕزگارت دەکات.

نەیتوانی وەکو پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کابرای ئەعرابی بڵێ خوا، چونکە موشریک، بەڵام چاوی لە کەرەم و بەخشندەیی و ڕەحمی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو بۆیە وتی: پیاوی باش بەو وازم لێ بهێنە!؟

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: موسڵمان بە وازت لێ دەهێنم بڵێ (أشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله)

ئەعرابییەکە وتی: موسڵمان نابم بەڵام پەیمان (وعد) ئەدەم کە لە ژیانمدا جەنگ لە دژت نەکەم.



بەم پێیە موسڵمان نەبوو بەڵام وەعدی دا کە دژایەتی پێغەمبەر ﷺ نەکات پێغەمبەری خواش ﷺ ئازادی کرد و هیچ سزایەکی نەدا و فەرمووی: بگەڕێوە ناو کەسوکارت.

لە دوایيدا گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی، هاواری کرد ئەی خەڵکینە لای بەڕێزترین کەس و باشترین کەس هاتووم، من وا موسڵمان بووم ئێوەش لەگەڵمدا موسڵمان بن، ئەو ئەعرابییە ناوی (غوروسی کوڕی حارس)ە بە هۆکاری ئەو کەسە زۆرێك لە عەرەبەکانی غەتەفان موسڵمان بوون.

هەموو باسەکەی بۆ گەلەکەی گێڕاوە و باسی موعجیزەکەی کرد و زانیان کە ئەو ئازایەتییە لە گیانی هیچ مرۆڤێکی سادەدا نییە، پاشان کەوتنی شمشێرەکە لە دەستی و بەخشینی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە ئەوە لە پیشەی مەلیك و سەرۆك عەشیرەتەکاندا نییە، بەڵکو ئەوە پیاوێکی تەنها بەخشندە نەبوو، بەڵکو گەورەتر بوو لە بەخشندەیی، داوای پارە و سامانی لێنەکرد، بەڵکو داوای موسڵمان بوونی لێ کرد.

ئەعراب لە دوای ڕاکردنیان ئەم حاڵەتەی کە بینیان تەواو بیریان لەوە کردەوە کە بڕۆنە ناو ئیسلام.

هەر لە گەڕانەوی ئەو سوپایەی پێغەمبەری خوا ﷺ، شتێکی زۆر غەریب و سەرسووڕهێنەر ڕوویدا:

بۆ ڕۆژی دووەم لە دوای ئەوەی سوپاکە ڕێگای بەرەو شاری مەدینە دەبڕی بۆ پشووو دیسان هاوەڵان لایاندا و تا ماندوێتیان بحەسێتەوە.

پێغەمبەری خوا دیار بوو نەیدەویست ئەزموونی دوێنێ دووبارە ببێتەوە، چونکە پێدەچوو غەتەفان لێرە و لەوێ تۆڵە لە سوپاکە بکەنەوە، ئەگەر بە خەسارەتێکی کەمیش بێت لە موسڵمانان.

لە جێگای پشووەکەیدا پێغەمبەر ﷺ دوو هاوەڵی دانا وەکو پاسەوان، یەکەم بەناوی (عەبادی کوڕی بیشری ئەنساری) دووەمیان (عەمماری کوڕی یاسری موهاجیر) لە نێوانی خۆیان دا شەویان دابەش کرد بۆ پاسەوانی، عەباد بەنۆرە لەگەڵ عەمار دا پاسەوانیان دەکرد، عەباد ویستی لەکاتی پاسەوانییەکەیدا شەونوێژ بکات، لەو کاتەدا واتا لە نیوەی شەودا یەکێك لە موشریکەکانی غەتەفان تیری هاویشت بۆ عەباد و لە کاتی نوێژ دا پێکای، بەڵام نوێژەکەی نەبڕی و بەردەوام بوو لە نوێژکردن، پاشان موشریکەکە تیری دووەمی هاویشت و دیسان عەبادی کوڕی بیشری ئەنساری پێکا.



دوو تیری بەرکەوت بەڵام بەردەوامە لە نوێژ کردن و نوێژەکەی لا خۆشەویستە، خوێن بە گیانیدا دەچۆڕێ تیرەکان بەر پشتی کەوتبون، تیری سێیەمی هاویشت ئەویشی بەرکەوت، پاشان چووە سوجدە و نوێژەکەی کۆتایی هات، ئینجا عەمماری کوڕی یاسری هەڵساند، خێرا ڕاوینا و کەس نەیزانی ئەو کەسە کێبووە کە تیرەکەی هاویشتووە.

لە دواییدا عەممار وتی ئەی نەدەکرا خێرا هەڵم بسێنی و ئاگادارم بکەیتەوە؟!

عەباد وتی سوێند بە خوا لەبەر ئەوە نەبوایە کە پاسەوانم، بە مردنیش حەزم نەدەکرد ئەو سوورەتەی دەیخوێنم لە دەستم دەربچێت و تەواوی نەکەم، بەڵام فەرمانی پێغەمبەرم لەسەر بوو بۆ پاسەوانی، بۆیە ئاگادارم کردیتەوە.

ئەوە خشووع و گەردن کەچی هاوەڵان بوو لە خواناسی و نوێژ کردندا، ئیتر چۆن ئەعراب و موشریك پێیان سەرسام نابن، هاوەڵان لە نێوانی جیهاد و نوێژدا دوو کەسایەتی جیاواز بوون لە جەنگدا وەکو پڵنگ و لە بەندایەتی دا وەکو عابید نوێژیان دەکرد.

هێز و ڕەحمەت تێیاندا کۆبوبووەوە، چونکە مامۆستا و فێرکاریان پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ئەمەش ڕوویەکی تەواوی هاوەڵان بوو، بۆیە لە هەموو جیهاندا بە هەموو جۆرە ڕەگەزەکانی مرۆڤ هەموو خەڵکی پێیان سەرسام بوون و خۆشەویستی هاوەڵان لە دڵیاندا درووست بوو.

لە کۆتاییدا غەزوەی زاتولرقاع زۆر کاریگەری خستە سەر غەتەفان، بە باشە و لە هەمووی باشتر ئەوەبوو کە جەنگ ڕووی نەدا.

نومێر: بۆچی باش بوو کە جەنگ ڕووینەدا، مەبەستم ئەوەیە ئاسەوارەکانی چی دەبوو ئەگەر جەنگ ببوایە؟!

ماکوان: ئەگەر جەنگ ببوایە دەبووە هۆکاری دوژمنایەتی زیاتر، چونکە کەسێك باوکی یان کوڕی بکوژرێت زۆر بە درەنگ لە بیری دەچێت.

نومێر: ڕاستە ئەی چیتر ڕووی داوە؟

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە شاری مەدینە و ئەم غەزوەیە بووە هۆکاری گۆڕینی زۆری بیروباوڕ و بۆچوونی غەتەفان.



## دوای جەنگی غەتەفان چی ڕوویدا؟

ماکوان: پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ لە دوای غەزوەی غەتەفان کە ناونرا بە (ذات الرقاع) گەڕاوە شاری مەدینە، هەرچەندە سوپاکە جەنگی نەکرد و خەڵکی غەتەفان هەموو ڕایان کرد، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ بەوە وازی لێنەهێنان، بەڵکو بەردەوام لەو ساڵەدا شەش سوپای تری یەك لە دوای یەك بۆ ئامادە کردن و دەچوونە سەریان، ئەو سوپایەی کە دەیکردنە سەر لە (٢٠٠) موجاهید کەمتر نەبوون ئەگەر زیاتر نەبوونایە، سوپاکان بەم شێوەیە بوو:

سوپای یەکەم: بۆ ناوچەی (قەدید).

سوپای دووەم: بۆ ناوچەی (دەربە).

سوپای سێیەم: بۆ ناوچەی (بەنی موڕە).

سوپای چوارەم: بۆ ناوچەی (مینە).

سوپای پێنجەم: بۆ ناوچەی (یەمم).

سوپای شەشەم: بۆ ناوچەی (غایە).

بۆ شەش ناوچەی جیاواز هەر لە ساڵی ٧ی کۆچی دا بوو، بەڵام ئەم ناوچانە هەمووی لەژێر دەستی غەتەفان دابوون.

دەبینین پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ جەختی تەنها لەسەر غەتەفان بوو لە ساڵی ٧ی کۆچی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ ستراتیژی دابوو، ئیتر هیچ کام لە هێز و هۆزەکان بیر لەوە نەکەنەوە بۆ جەنگ ڕووکەنە شاری مەدینە، بە کردار ئەنجامی دا و سەرکەوتووبوو لە بەرامبەر عەرەبی غەتەفانی یەهوود دا.

لە کۆتایی ساڵی ٧ی کۆچی هێزی دەوڵەتی ئیسلامی و پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ یەکەم هێز بوو لە نیوەدوورگەی عەرەب دا، لەگەڵ ئەوەی هێزی سەربازی لە ناوچەکە دا بێڕکابەر بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ لایەنی بانگەوازی فەرامۆش نەکرد، چونکە ئەرکی گرنگی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ بانگەوازی ئیسلام بوو، بانگی خەڵکی بوو بۆ ناسینی خوای پەروەردگار لە نیوەدوورگەی عەرەبی و دەوروبەری دا یاخود بە گشتی لە جیهاندا.



کەواتە ساڵی ٧ی کۆچی ساڵی جیهاد و بانگەواز بوو، هەموو ئەم کارانەش بەرهەمی سوڵحی حودەیبییە بوو، سەرکەوتنی موسڵمانان بەرامبەر یەهوودی خەیبەر و تەیما و فەدەك و غەتەفان، ئەوەی پێشتر دەوترا هێزی موسڵمانان کەمن بەڵام ئێستا لە ناوچەکە یەکەمی بێڕکابەرن، کەواتە ساڵی ٧ی کۆچی خۆشترین ساڵی موسڵمانان بوو.



# عومرەی قەزا

مکوان: کۆتایی ساڵی( ٧ کۆچی)یە، موسڵمانان لە دوای ئەو هەموو سەرکەوتنە ئیتر وا موشتاقن بۆ عومرە و وادە و ماوەی ئەو عومرەیەیە کە لەپەیماننامەی حودیبییەدا مۆرکراوە.

لە بەندی پەیماننامەکەدا هاتبوو کە موسڵمانان کۆتایی ساڵی ٧ی کۆچی دەچنە ناو شاری مەککە بۆ عومرە لە ماوی سێ ڕۆژدا و تەنها چەکی موسافیریان پێ دەبێت، خەڵکی شاری مەککە شارەکە جێدەهێڵن.

وا ئێستا مانگی (ذي القعدة)ی لە ساڵی ٧ی کۆچییە کاتی ئەو عومرەیەیە کە موسڵمانان چاوەڕوانن.

دوو هەزار هاوەڵ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچوون بێجگە لە ئافرەت و منداڵ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە چەکی تەواوەوە دەرچوو لە کاروانێکی زۆر جوان و نایاب لە شێوەی سوپا.

هەرچەندە پەیماننامەکە وابوو کە نابێت چەکی تەواویان پێبێت، موسڵمانان بەڵکو تەنها چەکی موسافیری دەبەنە ناو مەککە.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ باوەڕی بە قورەیش نییە، لە غەدری قورەیش دەترسێت، بۆیە موسڵمانان بە چەکی تەواوەتی جەنگ دەرچوون، پڕ چەك بوون لە تیر و ڕم و درع و هەموو پێداویستییەکی جەنگ.

بەهەر ناوچەیەك دا دەڕۆیشتن خەڵکی دەهاتن تەماشای ئەو هێزەی موسڵمانانیان دەکرد کە چۆن بەیەك دەنگ هەموو دەڵێن (لبيك اللهم لبيك ...) واتا خوایە وا هاتین بۆ لات.

ئیتر ئەوەندەیتر عەرەب هێز و توانای موسڵمانانیان بۆ دەرکەوت، ئەم قافڵەی عومرەیە گەیشتە جێگایەك بەناوی (ذي الحليفة) کە کۆمەڵێك بیری ئاون ناسراوە (أبيار علي) لەوێدا پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان ئیحرامیان بەست کە بە پێ دە ڕۆژ ڕێگایە بۆ شاری مەککە، هەر لەوێوە بە (تەلبیە) واتا (لبيك اللهم لبيك..) ڕۆیشتن تا نزیك مەککە.

داخۆ چەندە چرکەساتی گرنگ و خۆش بێت بۆ موسڵمانان وا نزیك ( ٨ ساڵە) ئەو شارەیان جێهێشتووە کە مەنزڵگایانە و پڕیەتی لە یادگاری وماڵی خوای لێیە.



کە خۆشەویسترین جێگا و شوێنە لە دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ وا پێغەمبەر ﷺ بە سەربەرزی و شکۆ دەگەڕێتەوە بۆ جێگا خۆشەویستەکەی! بەڵی ڕۆژانیان بەڕێ کرد بە ناڕەحەتی وا ڕۆژی خۆشیە! بەڵام کۆتایی هەر بۆ خواناسانە.

زۆر جیاوازە حاڵ و گوزەرانی (٧ ساڵ) لەمەوبەری موسڵمانان و ئێستا!

پێغەمبەر ﷺ بە هیجرەت لێیدەرچوو کە بە شوێنیدا دەگەڕان لێرە و لەوێ و لە ئەشکەوتەکان دا خۆی دەشاردەوە ، تەنانەت جێ پێیەکانێشی دەشاردەوە وا ئەمڕۆ بە دوو هەزار شێرە کوڕ دەگەڕێتەوە ناو شاری مەککە، کە وڵاتی خۆیەتی و بۆ ئەوەی هەموو عەرەب و جیهان بزانێت.

لەبەرچاوم دایە کە ئەو پۆڵە هاوەڵانە چۆن هاوار دەکەن دەڵێن:

لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك).

بەڕاستی هیچ هاوبەشی نییە (حقا لا شريك لك)

بەڕاستی سوپاسگوزاری هەر بۆ زاتی بەرزتە خوای موتەعال و بەڕاستی و بە یەقین هەرچی موڵکە هەر زاتی بەرزت خاوەنیەتی.

(٧ ساڵ) بەر لە ئێستا هەموو شاری مەککە بە شوێن پێغەمبەردا ﷺ دەگەڕان تا بیکوژن و یاخود بیگرن، تا بتوانن پاداشتی (٢٠٠ ) وشتر وەربگرن بەڵام ئێستا هەموو ڕێگا و شاریان چۆڵ کرد بۆ ئەوەی پێغەمبەر محەمەد ﷺ بگەڕێتەوە ناوی، بەڵکو بە عیزەت و سەربەرزی و هاواری یەکتاپەرستی و بە چەك و شمشێرەوە هاتەوە.

خەڵکی پێشتر هەرگیز بەبیریدا نەدەهات کە گەورەترین شاری نیوەدوورگەی عەرەبی و گەورەترین هۆز لە ژمارەدا نا بەڵکو بە هۆکاری کەعبە بەڕێزترین هۆزبوون، دەگوترا کێ دەتوانێت فەتحی بکات.

بەڵام لە دوای ئەم عومرەی قەزایە کە دوو هەزار کەس چووە ناو شارەکە خەڵکی شار چۆڵیان کرد، هەرخۆی بۆ خۆی ڕاهێنانی ئەو خەڵکە بوو بۆ ڕاکردن ئاخر کام ئەقڵ ئەوەی پێ قبوڵ دەکرێت، کە خەڵکی شار بکەیتە دەرەوە بۆ ئەوەی هێزێکی تری تێدا بمێنێتەوە!

ئەوە ئەوپەڕی گێلی موشریکەکان بوو، وا لە دوورەوە لەسەر شاخەکان خەڵکی شاری مەککە تەماشای موسڵمانان دەکەن لەماوەی ئەم سێ ڕۆژەدا چۆن بە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بە جەماعەت نوێژ دەکەن، توانای هیچیان نییە و لە ناو کەعبەدا ئاڵای تەوحید بەرزدەکەنەوە.



پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ دەیزانی کە خەڵکانێك هەن تەنها و تەنها بەهێز و توانای سەربازی سەرسام دەبن و دەگەڕێنەوە بۆ ئەم ئیسلامە، تەنها پێوەری هێز ڕێز و ئیحترامیان بۆ درووست دەکات.

عوسمانی کوڕی عەففان ڕاستی فەرموو: وتی ئەوەی کە هێزی خوای گەورە و سوڵتانی دەیکات، بەهێزی قورئان ناکرێت.[٧١]

چونکە خەڵکی مەککە لە کاتی عومرەی قەزادا بە گوێگرتن لە قورئان سەرسام نەبوون ئەگەرچی قورئان سەر و توانای مرۆڤە، بەڵکو بە هێز و توانا و چەکی موسڵمانان سەرسام بوون، ڕاستە قورئان موعجیزەیە بەڵام هەموو کەس پەی بەو موعجیزە نابات، بەڵکو چاوی مرۆڤەکان خوێندنەوەی خێرا بۆ هێز و تواناکان دەکات.

پێغەمبەری خواش صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ زۆری لا گرنگ بوو کە سیمای هێزی موسڵمانان دەربکەوێت، زۆری لا مەبەست بوو کە خەڵکی مەککە هێز و توانای موسڵمانان بە چاوی خۆیان ببینن، زۆر هەوڵی دا بە گوێرەی توانایان هێزی خۆیان نیشان بدەن ئەویش بریتیی بوو لە چەند سیمایەکی هێز.

سیمای یەکەم: نیشاندانی چەك و توانای سەربازی کە بە چەکی تەواو هاتن بە ڕێگاوە، بەڵام چونکە لە پەیماننامەکە دا هاتبوو، پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ خاوەنی گفت و پەیمانی خۆی بوو چەکی لە دەرەوەی شاری مەککە دا بەجێ هێشت و (٢٠٠) هاوەڵی بەدیار چەکەکانەوە دانا بە سەرکردایەتی محەمەد کوڕی مەسلەمە.

کە هەندێك لە عومرە تەواو بوون دەچنە جێگای ئەوان و ئەوانیش عومرە ئەنجام ئەدەن چونکە دەبوو پاسەوانێکی زۆر بە دیار چەکەکانەوە دابنێت و خۆیان بە چەکی موسافیری بڕۆن و عومرە بکەن، لە شاری مەدینەوە بۆ شاری مەککە بە چەکی تەواوەوە هاتن، بە دڵنیایەوە چاوەکانی قوڕەیش و دەزگای هەواڵگریان زانیبوویان موسڵمانان چەکی تەواو و زۆریان پێیە.

بۆیە قوڕەیش خێرا کەسێکی نارد بۆلای پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ لە بارەی چەکی تەواوەوە بە پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ یان وت لە پەیماننامەکەدا هاتووە تەنها بە چەکی موسافیر بێنە ناوەوە؟!

---

[٧١] ـ (إن الله ليزعُ بالسلطان مالا يزعُ بالقرآن).



پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چەكەكان لە دەرەوەی شاری مەككە بەجێ دەهێڵم بەڵام لە غەدر و پەیمانشكاندنی قورەیش متمانەم نییە، ئەم وتە و كردارەی ترسی زۆر خستە دڵی قورەیش.

سیمای دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ بە سواری وشترەكەی چووە ناو شاری مەككە و هاوەڵان هەموو شمشێرەكانیان بەرزكردبووەوە بە چواردەووری پێغەمبەردا وەكو پاسەوان هەڵدەخولان، ئەمەش مەشهەد و دیمەنی زۆر ترسناك بوو بۆ قورەیش، كە ئەم هەموو شمشێرە وەكو ئاوێنە بە تیشكی زۆر ڕووناكی ئەدات لە هەموو شاخ و دۆڵی قورەیش لە ناو شار و لە هەموو جێگاكاندا لە شاری مەككەدا.

سیمای سێیەم: هەموو بەیەك دەنگ هاواریان دەكرد (لبيك اللهم لبيك) دەنگی هاوەڵان زۆر ترسی خستە ناو گەورە و بچوكی قورەیش، (٢ هەزار) كەس هاوار بكەن داخۆ چ سەدایەكی خۆش هەبێت بۆ ئارامی دڵی خوا ناسان و چ ترس و حەسرەتێك بێت لە دڵی كافراندا كە باسی تەوحید و خوای پەروەردگارە.

سیمای چوارەم: لە پێش ڕێزی موسڵمانانەوە (عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحە) سروود و هۆنراوەی دەوت، لامان سەیر نەبێت كە لەو جێگایەدا چۆن هۆنراوە و سروود دەوترێت؟!

بەڵام لەبەر ئەوەی سیمای كلتوری عەرەب بوو كەرەستەی بانگەواز و ڕاگەیاندنی ئەو سەردەمە بوو، كاتێك كە هۆنراوە و سروودیان دەوت هەموو دەوەستان گوێیان لە عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحە دەگرت ئەویش دەیفەرموو

خلوا بني الكفار عن سبيله مصطفى ئەو شیعرە عەرەبیەكەی هەلەیە دواتر بەبیرم بێنەوە

اليوم نضربكم على تنزيله

ضربا يزيل الهام عن مقيله

ويزهل الخليل عن خليله[٧٢]

كافرەكان لەسەر ڕێی پێغەمبەر لاكەون — گشت خێرێك لە ڕێگەی ئەو دایە

خوای میهرەبان پەیامەكەی نارد — ئایەتەكان بۆ پێغەمبەر خوێندراوەوە

خوایە من باوەڕم بە فەرموودەكان هەیە — ڕاستی لە پەسەنكردنی ئەم دایە

---

[٧٢] ـ رواه الترمذي والنسائي.



| | |
|---|---|
| شەهیدبـــوون لەپێـــناوی باشتـــریـــنە | ئەمڕۆ سزاتان دەدەین بەفەرمانی |
| لێدانێـــکی بـــە ئازار و ئـــەشـکەنجە | دۆست لە دۆست سەری سوڕ دەمێنێ |

دەیزانی چی هەڵدەبژێرێت بۆ وتن لەو جێگایە دا و پاشان خۆی ڕێگای دەکردەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ به ئاشکرا دەیوت ئەوەی غەدر بکات لە پێغەمبەر ﷺ بە شمشێر لە گەردەنی دەدرێت.

عومەری کوڕی خەتاب لەو جێگایەدا شیعر و سروودی پێ قبوڵ نەکرا و وتی ئەی کوڕی ئەبو ڕەواحە، لە ناو کەعبە و لەبندەستی پێغەمبەری خوا ﷺ سروود و هۆنراوە دەڵێیت؟!

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی داوە و فەرمووی: وازی لێبهێنە ئەوەی دەیکات زۆر زوو دەچێتە دڵی ئەسڵی، تیژترە لە هاویشتنی تیر (خل عنه فلهو أسرع فيهم من نضح النبل)

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی کە ئەوە زووتر دەچێتە ئەقڵ و هۆشی قوڕەیش و زوو هەستی پێدەکەن، چونکە ئەو چەند پیتە هۆنراوەیە لە تیر و ڕم تیژتر بوو بۆ دڵی قوڕەیش، لەوە جێگایە دا بەهێزترین چەك بوو.

سیمای پێنجەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە لە ٧ دەورەی (سووڕانەوە لە چواردەوری ) کەعبە لە سێ دەورەی یەکەمی دا بە خێرای ڕابکەن، ئەمەش بە هەمیشەی بوو بە سوونەتێك بۆ ئێمە، (٢هەزار) کەس ڕابکات نیشانەی هێز و توانایە!

سیمای شەشەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن کە شانی ڕاستیان لەگەڵ قۆڵی ڕاستیان دا لە ئیحرامەکە بهێننە دەرەوە، تا قوڕەیش هێز و بازووی موسڵمانان ببینێت، توانای ماسولکەیی موسڵمانان بۆ دوژمن دەربکەوێت و هەست بە بەهێزی موسڵمانان و تواناکانیان بکرێت، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کە ئەمڕۆ هێز و بازو و توانای خۆی دەردەخات.

(رحم الله امرأ راهم اليوم من نفسه قوة)

ئەم دەرخستنی هێز و توانایەش لە ڕاستیدا هۆکاری لە پشتەوە بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هێز و تواناکانتان دەربخەن لە کاتی بەجێهێنانی عومرەکەتاندا، چونکە لە شاری مەککەدا وا بڵاوکرابووە کە موسڵمانان تووشی لاوازی و نەخۆشی و دەرد و تا بوون.



بەڵام کاتێك کە موشریکەکان هێز و بازوو و ماسوولکەی موسڵمانانیان بینی، بە سەرسووڕمانەوە وتیان ئەمە ئەوانە بوون کە تووشی نەخۆشی بوون هێز و بازوویان بەو شێوەیەیە؟!

ئیتر زۆرکاریگەری هێز و بازووی موسڵمانان لەسەر قوڕەیش درووست بوو.

سیمای حەوتەم: بریتیی بوو لە نوێژی جەماعەت بە پیاو و ژن و منداڵەوە لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا ناو حەرەم دا، ئەمەش زۆر کاریگەری درووستکرد لە کاتێکدا هەموو بەیەکەوە دەوەستان و ڕیز دەبوون (الله اکبر) یان دەکرد و بە ئیمامەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وێنە و سیمایەکی هێزی گەورەی درووستکرد لە دڵی موشریکەکاندا کە موسڵمانان چەندە ئیداری و ڕێك و پێکن و بەیەك ئاراستە کار دەکەن، خەڵکی هەموو سەرسام بوون پێیان.

سیمای هەشتەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە (بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی) کە بڕواتە سەر کەعبە و بانگ بدات.

ئەمەش لەرزاندنی ناخی هەموو قوڕەیش بوو، لە ڕووی نەفسییەوە قوڕەیش کە بیلالی حەبەشیان بینیی لە شاری مەککەدا پێشتر کڕین و فرۆشتنی پێ دەکرا، بەڵکو لەسەر شەقامەکاندا ئازار و ئەشکەنجە دەدرا، بەدەستی قوڕەیش و بە حەبل و گوریس دەبەستراوە و ڕایاندەکێشا بەناو خەڵکدا و گاڵتەیان پێدەکرد و بەردیان دەخستە سەر سکی وا ئێستا دەڕواتە سەر کەعبە کە بەرزترین جێگای سەرزەوییە و خوای گەورە عیزەتی بیلالی داوە بە بەرزکردنەوەی بانگەکەی کە بڕواتە ئەو جێگایە، ئەمە بە تەواوەتی قوڕەیشی لە ناخدا لاواز کرد و ڕزاندی، بیلال کە عەبدێکی حەبەشییە و هاوار و بانگی موسڵمانان بەرز دەکاتەوە و شایەتی بۆ یەکتاپەرستی و پێغەمبەرایەتی محەمەد ﷺ ئەدات، هەروەها کۆتایی بانگەکەش هەر بە تەوحیدە، ئەمە بەتەواوەتی ناخی قوڕەیشی داڕووخاند.

سیمای نۆیەم: هەموو مامەڵەی هاوەڵانیان دەبینی لە بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺدا چەندە بە گەردنکەچی و خشوع بوو ڕێزێکی بێپایانی پێغەمبەریان ﷺ دەگرت، بیرتانە کە گەورە و شاری طائیف لەکاتی گفتوگۆیدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە پەیمانی حودەیبییەدا چی وت بە قوڕەیش (عورووەی کوڕی مەسعوودی سەقەفی) وتی: کەچی مەلیك و پاشایەکم نەدیوە ئەوەندە ڕێزی لێبگیرێت وەکو هاوەڵانی محەمەد ﷺ دەیکەن، قوڕەیش بۆی دەرکەوت کە ڕێزی موسڵمانان ڕێزێکی پتەو و بەهێزە، هەموو لەئاستی سەرۆکەکەیاندا گوێڕایەڵن، ئەمەش هۆکارێکی تر و سیمایەکی تری بە هێزی موسڵمانانە.



سیمای دەیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ وێنەیەکی تری زۆر بەهێزی نیشاندا ئەویش بریتیی بوو لەوەی هاوسەرگیری کرد لەگەڵ خاتوو (مەیمونەی کچی حارس)، ناوی (مەیمون) لە زمانی عەرەبیدا واتا (پیرۆز).

ئەمەش بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەوپەڕی ژیانی ئاسایی خۆی پیادە دەکات و ژن دەهێنێت و ئاهەنگ دەگێڕێت، لە ناوشاری مەککەدا لە هیچ ناترسێت، لە هەمووی گرنگتر پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەرداری ژیانی سیاسی خۆی نەبوو، بەڵکو بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەی بانگێشتی هەموو سەرکردەکانی قورەیشی کرد بۆ نان خواردن و وەلیمەکەی.

بەڵام موشریکی مەککە چاویان هەڵنەهات بەو خۆشی و شادییەی پێغەمبەر ﷺ، تیرەی قورەیش ڕەتیان کردەوە بڕۆنە ئاهەنگەکەی.

چونکە قورەیش باش لە پەیامەکەی پێغەمبەر ﷺ تێگەیشتن، مامەڵە دەکات لە شاری مەککەدا وەکو ئەو خاوەنی ماڵە و قورەیش میوانە، بەڵام جێگا و مەنزڵگەی خۆیەتی.

بەڵکو لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو خاتوو مەیمونەی کردە هاوسەری خۆی کچی حارس بەنی عامرە کە هۆزێکی عەزیز و بەهێزن، هۆزی بەنی عامر لە ناو خۆیان و لە ناو عەرەبدا شانازییان ئەوە بوو کە تا ئێستا ئافرەتیان بە کۆیلە و کەنیزە نەبراوە!

ئەمەش مانای ئەوە بوو ئەم هۆزە پەیوەندی خزمایەتی و تێکەڵبوون لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەبەستن لە ڕێگای نەسەبەوە.

لە هەموو گرنگتر خاتوو مەیمونە دایکی ئیمانداران پووری خالیدی کوڕی وەلیدە و خوشکی (دایکی فەزڵە) کە خێزانی عەباسی مامی پێغەمبەرە ﷺ.

ئەمەش هاوسەرگیرییەکی سیاسی و بانگەوازێکی کۆمەڵایەتی بوو، لەو کات وساتەدا ئەوپەڕی حیکمەت و هێزی موسڵمانانی نیشاندا و کاریگەری زۆری خستە سەر موشریکەکانی قورەیش.

بەم (دە) خاڵەی کە باسمان کرد و شیتەڵمان کرد پێغەمبەری خوا ﷺ سیمای هێز و توانای نیشانی قورەیش دا و زیاتر ئەستێرەی موسڵمانان گەشایەوە، عومرەی قەزا بە بەرزی و ئیجابی بۆ موسڵمانان تەواو بوو، یاخود عومرەی قەزیە یان عومرەی قەساس یاخود عومرەی سوڵح هەموو ئەم ناوانەی هەیە (القضاء، القضية، القصاص، الصلح) ئەم عومرە موبارەکە لە ساڵی ٧ کۆچی دا کۆتایی هات.



لە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شاری مەدینە، خێرا سوپای ئامادە کردەوە بۆ سەر ناوچەی غەتەفان، لە ماوەی دوو مانگدا یاخود کەمتر دوو سریەی نارده سەریان، لەگەڵ گەڕانەوەی واتا زیلحجەی ساڵی ٧ کۆچی و پاشان مانگی سەفەری ساڵی ٨ کۆچی، وەکو پیشەی هەمیشەی خەڵکی غەتەفان هەڵدەهاتن لە موسڵمانان و بەتەواوەتی فشاری خستبووە سەریان.

ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە هێز و توانای موسڵمانان بزانن هەرگیزا و هەرگیز جارێکیتر بیر لە جەنگ کردن لەگەڵ موسڵمانان نەکەنەوە.

ئەمەش ئەو مەنتیق و لۆژیکەیە هەندێک لەلایەن خەڵک و دەوڵەت پیادەی دەکەن، چونکە لۆژیکی هێز یەکلاکەرەوەی کێشەکانە، هەرلایەك هێزی نەبێت هیچ نرخ و بایەخی (ئەرزشی) بۆ دانانرێت، قسە ڕۆیشتوو نابێت لە ناو خەڵکی دا، ناتوانێت سەر بەرزبکاتەوە، تەنانەت بەرگری لەخۆی و خەڵکەکەش بکات.

سێ لە سەرکردەی گەورەی قوڕەیش موسڵمان دەبن

ماکوان: لە مانگی سەفەری ساڵی ٨ کۆچی گەورەترین ڕووداو ڕوودەدات، ئەوەیش سێ سەرکردەی سەربازی و سیاسی سەنگەری خەباتیان دەگوازنەوە بۆ ناو موسڵمانان و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیەنن.

ئەو سێ کەسە نەك دەبنە هۆکاری ئەوەی نەخشەی نیوەدوورگەی عەرەب بگۆڕن، بەڵکو نەخشەی هەموو جیهان دەگۆڕن، دوو شارستانییەت ئەدەن بە ناخی زەویدا، تا ئەمڕۆش کاریگەری سەربازی و سیاسییان هەیە.

ئەو سێ ئیملاقە بریتییە لە: (خالیدی کوڕی وەلید، عەمری کوڕی عاس و عوسمانی کوڕی تەڵحە) ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت.

لە هەمان کات دا سێ سەرکردەی گەورە و خاوەن بڕیارن لە ناو شاری مەککە دا، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە هەر سێکیان لە یەك ڕۆژدا موسڵمان بوون لە مانگی سەفەری ٨ کۆچی دا.

بەڕاستی سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ موسڵمانان.

تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جگەرگۆشەکانی قوڕەیش هاتنە ناومان[٧٣]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٣] ـ (إن مكة قد ألقت إلينا بأفلاذ أكبادها).



ئەو سێ کەسە کە موسڵمان بوون سەنتەری گەورەی هێز و توانای قورەیش بوون لە ڕووی سیاسی و سەربازی، سیرەی پێغەمبەریان ﷺ بردە قۆناغێکی ترەوە چونکە هەر سێ کەسەکە خەڵکی میحوەری بوون.

نموونەی خالیدی کوڕی وەلید، توانی خاکی عێراق و فارس و میزۆپۆتامیا و ئەرمینیا و زۆرێکی تر لە وڵاتانی ئاسیا فەتح بکات بێجگە لە سوریا و فەڵەستین، هەروەها عەمری کوڕی عاس توانی وڵاتی میسر و وڵاتانی ئەفریقا فەتح بکات، بەتایبەت ئەم دوو کەسە دەستکەوتێکی زۆر گەورە بوون بۆ موسڵمانان.

هێزێکی تری گەورە بوون هاتنە سەر موسڵمانانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ناوی لێناون کە پێشتر ئەو ناوانەی لە کەس نەناوە.

ئەو دوو کەسە ئەوەندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگ و خۆشەویست بوون، خالیدی کوڕی وەلیدی ناونا بە شمشێری خوا و بە عەمری کوڕی عاسی فەرموو: خەڵکی موسڵمان بوون بەڵام عەمر ئیماندار بوو، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عەمری کوڕی عاس ساڵح ترین پیاوی قورەیشە.



# هۆکاری موسڵمان بوونیان

ماکوان: هەردوو قارەمانی گەورە خالید و عەمر، چەندین ساڵ لە ڕێگەی دینی خوای گەورەدا بوون دژی موسڵمانان، پێویستمان بە شیتەڵکردنێك هەیە تا لە وێستگەی ژیانیان دا هەڵوێستەیەك بکەین.

چی وایکرد کە ئەم دوو کەڵە پیاوە بیر لە ئیسلامەتی و موسڵمان بوون بکەنەوە؟ لە ڕاستیدا هۆکاری هێز و توانای موسڵمانان بوو ئەمانەی سەرسام کرد، قیادە و سەرکردایەتی سەربازی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو خالید و عەمری بەخۆی سەرسام کرد، لە سەردەمی خۆیان دا هەردووکیان قیادەی سەربازی بوون نەك لە ناو قورەیش بەڵکو لەناو عەرەب و جیهاندا ناسرابوون، بەڵکو خۆی بینیوە کە فەشەلی هێنا و شکستی خوارد لە جەنگی ئوحود دا بەرامبەر بە پلان و نەخشەی سەربازی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەگەر هەڵەی موسڵمانان نەبوایە لە ئوحود دا هەرگیز خالید نەیدەتوانی پشتیان لێ بگرێت، خالید زانی ئەوە شکستی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نەبوو، بەڵکو سەرپێچی موسڵمانان بوو، بۆیە شکستیان خوارد.

هەروەها بینی هەموو عەرەب لە جەنگی ئەحزاب دا بۆی کۆبۆتەوە توانای جەنگیان نەبوو لەگەڵدا، هەروەها لە حودەیبییە زانی پلانەکەی شکستی خواردبوو لەگەڵ هەموو ئەمانەدا سەرسام بوو بە ڕەوشت و مامەڵەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، خالید زانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەرکردەیەکی سەربازی حەکیم و بە توانایە زۆریش بەهێزە و ڕەوشتی بەرزە و لە سەروو هەموو گومان و دوودڵییەکەوە.

هەروەها عەمری کوڕی عاس بەهەمان شێوەی خالید سەرسام بوو بە ڕەوشتی و هێز و توانا و حەکیمی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ، زانییان ئەمانە لە هەموو مرۆڤێکدا کۆنابێتەوە ئەگەر پێغەمبەر نەبێت، لە کاتێکدا عەمری کوڕی عاس لەسەر دەستی پاشای حەبەشە ئەسحەمەی حەبەشی[٧٤] موسڵمانان بوو، ئەو بانگەوازی عەمری کرد بۆ ئیسلام.

پێش ئەوەی درێژە بدەم بە باسی عەمری کوڕی عاس پێکەوە تەماشایەکی ژیانی خالید و موسڵمان بوونی بکەین و هۆکارەکانی بزانین.

خالید لە دوورەوە لەکاتی عومرەی قەزا دا تەماشای پێغەمبەر و موسڵمانانی دەکرد! لە دوورەوە لە پڕ لەناو خەڵکەکەدا قسەیەکی زۆر سەیری کرد و وتی: هەموو کەسێکی ئاقڵ و

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٤] ـ اصحمة الحبشي.



خاوەن ژیری و زیرەك دەبێت بزانێت کە محەمەد ﷺ نە جادووبازە نە شاعیر، بەڵکو ئەو قسانەی کە دەیکات هەموو کەلامی خوای پەروەردگارە.[٧٥]

لەو کاتەدا خالید زۆر سەرسام بوو بە هێز و توانای موسڵمانان، عیزەتی ئیسلام وای کرد لەو جێگایەدا ئەو قسەیە بکات، لە کاتێکدا گەورەترین سەرکردە و سەربازی مەککەیە، تەمەنی ٤٧ ساڵە لە هەموو تەمەنیدا هەمیشە سەرکردەی سوارچاکانی قورەیش بووە، لە هەمانکاتدا دەترسێت لە کورسی و پلە و پایەکەی لە دەست بدا و بڕواتە ناو موسڵمانان.

هەوەها باوکی خالید گەورەی قورەیش بوو، بەڵام خالید زۆر گۆڕا سەرسام بوو بە سەرکردایەتی و هێزی موسڵمانان، هەر لەوجێگایەدا لەبەرچاوی هەموویان دا وتی: بە ڕاستی ئەوەی کە خاوەنی ئەقڵ بێت دەبێت شوێنی پێغەمبەر ﷺ بکەوێت.[٧٦]

ئەم وتەیە بۆ قورەیش زۆر ترسناکە و کە ئەبو سوفیان گوێی لێبوو خێرا بانگی کرد بۆ ئەوەی دڵنیابنەوە، ئەوە بەڕاستی قسەی خالیدی کوڕی وەلیدە؟!

کاتێك خالید هاتە لای هەمان قسەی دووبارە کردەوە، دڵنیایی دایە ئەبو سوفیان کە ئەوە قسەی منە و لێی پەشیمان نیم.

ئەبو سوفیان پاڵێکینا بە خالیدەوە ویستی لێی بدات، لەوکاتەدا عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل کەوتە نێوانیان.

چونکە هەردووکیان هاوڕێی کۆنی یەکتر بوون، عیکریمە ئەبو سوفیانی گرت و وتی: لەسەرخۆبە ئەبو سوفیان، سوێند بەخوا ئەوەی خالید وتی من دەمێکە دەمەوێت بیڵێم بەڵام بەخوا لە ترساندا دەرمنەئەبڕی، ئەوەی کە خالید وتی منیش بڕوام وایە بڕۆمە ناو دینەکەی.

لەوێدا بۆمبێکی ئەتۆم بوو بۆ ئەبو سوفیان و قیاداتی قورەیش، دوو سەرکردەی سەربازی گەورە ئەو قسەیە بکەن، ئەبو سوفیان تووشی شۆك بوو.

پاشان بەردەوام بوو لە قسەکانی وتی: دەتانەوێت خالید بکوژن لەسەر وتەکەی، تەماشاکەن هەموو خەڵکی مەککە وا شوێنی کەوتوون.[٧٧]

---

[٧٥] ـ (لقد استبان كل ذي عقل أن محمداً ليس بساحر ولا شاعر وأن كلامه من كلام رب العالمين).

[٧٦] ـ (فحقا على كل ذي لب أن يتبعه).

[٧٧] ـ (قال عيكرمة: مهلاً يا ابا سفيان فوالله خفت للذي خفته, أنْ أقولَ مثلما قال خالد وأكونَ على دينهِ) أنتم تقتلون خالداً على رأي رآه؟ وهذه قريش كلها تبايعت عليه, والله لقد خفت أنْ لايحول الحول حتى يتبعه أهل مكة كلهم).



هەموو سەرسام بوون بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و هێزی موسڵمانان.

بەڵام وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموویت:

﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّاۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ١٤﴾

[النمل]

جا ئەوانەی هەر ڕق ئەستوورییان کردو باوەڕیان پێی نەبوو، بە زۆرداری و خۆبەزلزانی، لە کاتێکدا لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد حەقیقەتەو ڕاستە، دە تەماشا بکە و سەرنج بدە بزانە سەرەنجامی تاوانباران و گوناهکاران چۆن بوو (چۆن تۆڵەمان لێ سەندن).

هەموو دەزانن کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕاستە و حەقە، بەڵام هەیە وەکو کیسرا لوت بەرزە و هەیە وەکو قەیسەری ڕۆم لە کورسییەکەی دەترسێت و هەشە بە توانا و ئازایە هیدایەتەکە زوو وەردەگرێت.

هەر خالید بوو لە کاتی سوڵحی حودەیبییەدا ویستی لەکاتی نوێژ بەسەر موسڵماناندا بدات و هێرش بکات، نوێژی ترس دابەزی و وتی ئەم کۆمەڵە پارێزراون کەسێك لە سەروو توانای مرۆڤەکانەوە چاودێریان دەکات، خالید پیاوێکی بەهۆش و بیر بوو، لەکاتی هاتنی موسڵمانان بۆ شاری مەککە و بۆ بەجێهێنانی عومرە، سەرسام بوو بە یەك ڕیزی و هێز و توانایان، سەرباری هەموو ئەمانە، نامەیەك و پەیامێکی لەلایەن پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێدەگات کە نامەکە براکەی بۆی دەنووسێت بەناوی وەلیدی کوڕی وەلید کاتێك کە وەلیدی برای لەگەڵ موسڵمانان دێتە ناو شاری مەککە بۆ بەجێهێنانی عومرە، دەچێتەوە ماڵی خۆیان و بەدوای خالیدی برایدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی بانگی بکات بۆ ئیسلام، لەوکاتەدا نامەکەی بۆ بەجێدەهێڵێت لە نامەکەدا دەڵێت:

بسم الله الرحمن الرحيم، لە پاشاندا دەڵێت زۆرم لا سەیرە کە کەسێکی ئاقڵ و خاوەن هۆشی وەکو تۆ نەهاتۆتە ناو ئیسلام، براکەم خالید کوا ئەقڵ و هۆش و ژیریت، خەڵکی وەکو تۆ چۆن خۆی وێڵ دەکات لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام؟! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەم ڕۆژانەدا هەواڵی پرسی فەرمووی: کوا خالید؟ لەو وەڵامەدا وتم ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خوای گەورە هیدایەتی ئەدات و بەم نزیکانە دێت.

پاشان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بە سەرسوڕمانەوە نموونەی خالید چۆن خۆی وێڵ و گێل دەکات لە ئیسلام، خۆ ئەگەر بهاتایە ناو موسڵمانان و ئەو توانا و هێزەی لە ئیسلامدا بەکاربهێنایە باشترە لەوەی لەناو موشریکەکاندا بێت، خۆ ئەگەر وای کرد جێگا و مەکانەتی لای



ئێمە پارێزراوە و لە پێشترە لە خەڵکی تر، براکەم خالید زوو وەرە بۆ لامان با چەکەکانت لەدەست دەرنەچێت  کە جێگای چاکەن [٧٨]

خالید کاتێك گەڕاوە نامەکەی بینی ئەوەندەی تر موشتاق بوو کە بڕوات بۆ لای موسڵمانان و ئیسلام بوونی خۆی ڕابگەیەنێت، خالید خۆی دەڵێت زۆر چالاك بووم کە زانیم پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پرسیووم، پاشان ئەو شەوە خەونم دی لە خەوئمدا لە جێگایەکی زۆر تەسکدا بووم، پاشان لە خەونەکەم دا وەکو فراوانبوون جێگاکەم بۆ فراوان بوو، کە چوو بۆ شاری مەدینە ئەم خەونەی بۆ ئەبو بەکر  گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەوە خوای گەورە تۆی خستۆتە جێگای فراوان کە هیدایەت و نووری ئیسلامە، ئەو جێگا ترس و ناڕەحەتی و شیرکە.

ئینجا تەماشای حیکمەتی پێغەمبەر ﷺ بکە بە خالید دەفەرمووێت، ئەگەر هێز و تواناکانت لە ئیسلامدا بێت تۆ دەبیتە سەرکردە!

چونکە تۆ سەرکردەیەکی گەورە و سەربازێکی بەتوانا و سوارچاکێکی مەیدانی, ئەگەر چی دواکەوتوویت بەڵام پەلە بکە چونکە جێگات پارێزراوە لە ناو موسڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامی.

هەموو ئەم وشانە چووە ناو دڵی خالید و کلیلی دەرگای هیدایەتی بوو، قسەی نەرم و نیان و دڵدانەوەی خالید بوو لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ لە هەموو گرنگتر قسەی براکەیەتی کە پێی دەڵێت براکەم خێراکە چەندین کاری باش و چاك ماوە بیگریت, تا لەدەستت نەچووە وەکو پێشووتر، چەندین جەنگ و جیهاد کە پێویستی بە خالیدە لە دەست خۆتی مەدە.

خالید کە نامەکەی بینی  و خوێندییەوە زیاتر چالاکبوو بۆ چوونی بۆ شاری مەدینە.

ئینجا خالید خۆی کۆکردەوە توێشووی ڕێگای ئامادە کرد کە بڕوات بۆ مەدینە و هیجرەت بکات.

سبحان الله نەیدەویست بەتەنها بڕوات لەیەکەم هەنگاوی موسڵمانبوونی بڕیاری بانگەوازی دا وتی: دەمەوێت هاوەڵم هەبێت کە دەڕۆم بۆ شاری مەدینە.

تووشی سەفوانی کوڕی ئومەییە بوو پێی وت ئەی باوکی وەهەب نابینی لە چ حاڵێکداین، چەند کۆمەڵەیەکی کەممان ماوەتەوە، زەوی لە چواردەورماندا بچووک بۆتەوە و قوڕەیش هیچ هێز و توانای نەماوە، محەمەد ﷺ ئەستێرەی بۆ ئاسمان کشاوە و عەرەب و

---

[٧٨] ـ وقد سألني رسول الله صلى الله عليه وسلم عنك، فقال :أين خالد؟ فقلت: يأتي الله به، فقال :ما مِثْلُهُ جهل الإسلام، ولو كان جعل نِكَايَتَهُ وَجِدَّهُ المسلمين على المشركين كان خيرا له ولقدمناه على غيره،فاستدرك يا أخي ما قد فاتك، وقد فاتتك مواطن صالحة، فلما جاءني كتابه نشطت للخروج وزادني رغبة في الإسلام) رواه البيهقي.



عەجەم شوێنی کەوتوون، ئەگەر ئێمەش شوێنی بکەوین، ئێمە لە پێشترین بۆ دواکەوتنی محەمەد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ.

سەفوان بە توندی ڕەتی کردەوە و وتی ئەگەر کەس نەما ئەوا من ماوم کە هەرگیز شوێنی ناکەوم.

چونکە سەفوان باوکی بەدەستی مسوڵمانان کوژرا بوو بیری لای تۆڵە سەندنەوە بوو، هەرچەندە خالیدیش باوکی لەگەل باوکی سەفوان لە بەدردا کوژرا بوون، بەڵام خوای گەورە هیدایەتی خستە دڵی خالید، هەرچەندە سەفوان دوای فەتحی مەککە موسڵمان دەبێت، خالید سەفوانی جێهێشت و بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ.

پاشان تووشی عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل بوو، خالید بانگی کرد بۆ ئیسلام و وتی وەرە بڕۆین بۆ شاری مەدینە، ئەویش بەهەمان شێوەی سەفوان ڕەتی کردەوە وتی من موسڵمان نابم، بەڵام خالید هیچ نائومێد نەبوو بەردەوام بەدوای هاوڕێدا دەگەڕێت بۆ سەفەرەکەی یاخود کۆچەکەی، بەردەوام هەرکەسی دەبینی لە هاوڕێکانی بانگی دەکرد بۆ موسڵمان بوون، تا خوای گەورە کردی تووشی بوو بە تووشی عوسمانی کوڕی تەڵحە، ئەوەی بۆ سەفوان و عیکریمەی باسکرد بۆ ئەویشی باس کرد، بەڵام عوسمان خێرا وڵامی دایەوە ئامادەیی دەربڕی بۆ موسڵمان بوون.

هەردووکیان ئامادەی دەرچوون بوون کە بڕۆن بۆ شاری مەدینە و بە ئاشکرا و بێ پەردە موسڵمانبوونی خۆیان لەبەردەم پێغەمبەردا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ڕابگەیەنن.



# چۆن عەمری کوڕی عاس موسڵمان بوو

ماکوان: ماوەیەکی زۆر عەمری کوڕی عاس لە ژیانیدا ڕەتی دەکردەوە کە موسڵمان ببێت، کاتێك موسڵمان بوو تەمەنی ٥٧ ساڵ بوو، واتا تەمەنێکی زۆری لە دژایەتیکردنی ئیسلام دا خەرج کردبوو، ماوەیەکی دوورو درێژ نزیکەی ٢٠ ساڵ دژایەتی ئیسلامی کرد، بەڵام چی وای لە عەمری کوڕی عاس کرد بیر لە ئیسلام بکاتەوە، ئەویش جێگا و مەکانێکی زۆر گەورەی هەبوو لە ناو قورەیشدا هەمان کێشەی خالیدی هەبوو پێشتر کە موسڵمان بێت چونکە باوکی واتە عاس کوڕی وائیل لە دوژمنە سەرسەختەکانی ئەم ئیسلامە بوو، هۆکارێك بوو لە دواکەوتنی ئەم ئیسلامە، کاتێك کە بەشداربوو لە جەنگی ئەحزاب دا.

عەمری کوڕی عاس دەڵێ: لە دوای ئەوەی کە گەڕاینەوە لە ئەحزاب خەڵکی قورەیش داوای ڕای منیان کرد، منیش وتم سوێند بەخوا من وای دەبینم کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەڵاتی محەمەد ﷺ بەرز دەبێتەوە.

عەمر بە حەکیمی عەرەب و زیرەك و سیاسەتمەداری قورەیش هەژمار دەکرا، ئەویش چاوودێر بوو بۆیە وتەکەی لە فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ نزیك بوو فەرمووی: (ئێمە دەڕۆینە سەر دوژمن ئەوان ناتوانن بێنە سەرمان) ئەو پێی وابوو کە ڕۆژانی داهاتوو بۆ پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان دەبێت.

هەر بۆیە بڕیاریدا مەککە جێبهێڵێت و سەری خۆی هەڵبگرێت لە داخی موسڵمانان ڕووە و هاوڕێ کۆنەکەی کە پاشای حەبەشە بوو کەوتە ڕێ بەرەو وڵاتی حەبەشە.

خۆی دەڵێت بڕیارم دا بڕۆم بۆلای هاوڕێ بەوەفا و خۆشەویستەکەم نەجاشی.

وتم دەچمە لای ئەو بزانم کاری محەمەد ﷺ بە کوێ دەگات، ئەگەر محەمەد ﷺ سەرکەوت ئەوا من لای نەجاشیم و لە ژێر دەستی ئەودا دەبم، خۆشحاڵ ترم تابیمە ژێر دەستی محەمەد ﷺ.

تەماشای ئەو هەموو ڕق و کینەیە بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرامبەر چیدا خۆشی نازانێت، بەڵام شەیتان زاڵبوو بەسەریدا بەتەواوەتی دوایی دەڵێت: خۆ ئەگەر هۆزەکەم سەرکەوت بەسەریدا باشتر ئەو کات دەگەڕێمەوە ئەمەش هەڵوێستەکی زۆر نەشیاو بوو بۆ عەمری کوڕی عاس، دەیزانی مەکانەت و جێگای پارێزراوە لە ناو قورەیش دا.



لە دوای ئەو ڕاو بۆچوونەی کۆمەڵێك لە پێستەی ئاژەڵی کۆکردەوە و بردی بە دیاری بۆ ئەسحەمی نەجاشی پادشای حەبەشە.

ئەم ڕووداوە کە ڕووی دا لەو کاتەی کە عەمری کوڕی عاس گەیشتە لای نەجاشی هاوکات بوو لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ نەجاشی، پاشان داوای کرد کە جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب و موسڵمانان بگەڕێنەوە عەمری کوڕی عاس دەڵێت لای نەجاشی بووم کە (عەمری کوڕی ئوممەییە) نوێنەری دەوڵەتی ئیسلامی هاتە لای نەجاشی.

عەمری کوڕی عاس دەڵێت، داوام کرد لە نەجاشی کە هاوکاریم بکات بۆ کوشتنی عەمری کوڕی ئوممەییە، دیارە ئەوکات سوڵحی حودەیبییە ڕووی نەدابوو، وتم بە نەجاشی ئەوە نوێنەری دوژمنێکی ئێمە لێرەیە یارمەتیم بدە با بیکوژم چونکە زۆرێک لە قیادات و خانەدان و گەورەکانی ئێمەیان کوشتووە؟!

نەجاشی زۆر لە عەمری کوڕی عاس تورەبوو تورەبوونێك کە زۆر بە هێز بوو، عەمری کوڕی عاس دەڵێت حەزم دەکرد زەوی شەق بوایە بڕۆشتمایە بە ناو ناخی زەویا.

عەمر پاساو بۆ قسەکەی دەهێنێتەوە و دەڵیت: جەنابی مەلیك نەمزانی وا پێتناخۆشە دەنا هەرگیز ئەو داوایەم لێ نەدەکردی.

عەمر نەیزانی کە نەجاشی موسڵمان بووە ژێر بە ژێر و ئاشکرای نەکردووە بۆیە نەجاشی بەهەلی زانی کە بانگەوازی عەمری کوڕی عاس بکات بۆ ئیسلام، بە عەمری وت دەتەوێت نوێنەری کەسێکت بدەمێ بیکوژیت کە لەلایەن خواوە ئەو وەحییەی بۆ دێت کە بۆ موسا هاتووە دەکرێت نوێنەرەکەی بکوژیت!؟

عومر دەڵیت: ئەی جەنابی مەلیك بەڕاستی وایە وەحی بۆدێت و ئەو پێغەمبەری خوایە؟!

نەجاشی : ئەی ماڵوێران عەمر ئەگەر گوێم بۆ ڕاگری و بەقسەم بکەیت دەڕۆیت خێرا شوێنی دەکەویت، بەخوا سەردەکەویت بەسەر هەموو دوژمن و نەیارەکانی دا هەروەك چۆن موسا سەکەوت بەسەر فیرعەون و سەربازەکانی دا.

لەوکاتەوە ئیسلام کەوتە دڵی عەمری کوڕی عاس، وەکو فلاش باکێك بیری کەوتەوە کە ڕەوشت و هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ﷺ چۆنە و هەموو ئەوەی پێشتر کەڵەکە ببوو لای وا ئێستا هەڵاوێری دەکات و دەزانێت ژیانی پێغەمبەر ﷺ هەموو جوانی و چاکی و ڕاستگۆییە، لە پڕ ڕاستییەکان لەبەرچاوی ڕوون بوویەوە.

نەجاشی وتی: بەیعەتم ئەدەیتێ لەسەر ئیسلام !؟



عەمری کوڕی عاس وتی: تۆ موسڵمان بوویت و لەسەر دینی محەمەدی صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ؟!

نەجاشی وتی: بەڵێ.

عەمری کوڕی عاس دەستی خستە ناو دەستی نەجاشی و موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند و بەیعەتی دا بە نەجاشی.

کەواتە عەمر لەسەر دەستی نەجاشی موسڵمان بوو، ڕەزامەندی خوا لەهەردووکیان بێت، ڕایکرد چوو بۆ لای لە دژی ئیسلام بەڵام هەر لای ئەو موسڵمان بوو، ئەمەش قەزا و قەدەری خوای گەورەیە و کە ستراتیژی ئەم کەونەی پێ ڕێکخستووە، خوای گەورەش لە سورەتی القصص دا دەفەرمووێت:

﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٥٦﴾ [القصص]

واتە: بەڕاستی ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی خۆشت دەوێت، بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێت دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و ئیمانی پێدەبەخشێت، خوایش ئاگادارە بەوانەی کە ڕێبازی هیدایەتیان گرتۆتە بەر.

عەمری کوڕی عاس گەڕاوە بۆ شاری مەککە بۆ ئەوەی ڕایبگەیەنێت کە موسڵمان بووە، ئەو لە بەردەم نەجاشی موسڵمان بوو، بەڵام نییەتی وابوو کە کۆچ بکات بۆ لای پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ و ئیسلام بوونەکەی خۆی ئاشکرا بکات.

گەیشتە شاری مەککە چەند ساتێکی کەم تێیدا مایەوە واتا شەوی تێدا نەکردەوە، پاشان خۆی بەرەو شاری مەدینە ئامادەکرد، لە ڕێگادا گەیشت بە خالیدی کوڕی وەلید و عوسمانی کوڕی تەڵحە، پرسیاری کرد لە خالید و وتی: ئەی باوکی سولەیمان بۆکوێ دەچیت؟!

خالید بەوپەڕی ڕاشکاوانە وەڵامی دایەوە و وتی: سوێند بەخوا بۆم ڕوون بۆتەوە ڕێگای ڕاست لەلای ئەو پیاوەیە مەبەستی پێغەمبەری خوا بوو صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ دەڕۆم تا موسڵمانبوونی خۆم ڕابگەیەنم.

عەمریش وتی: سوێند بەخوا منیش هەر بۆ موسڵمانبوون دەچم و ئیسلامی خۆم ڕابگەیەنم.



# سێ سوارچاکەکە گەیشتنە شاری مەدینە

ماکوان: هەرسێ سەرکردە و سوارچاکی قورەیش گەیشتنە شاری مەدینە، پێش ئەوەی بگەنە ناو شار لە نزیك شاری مەدینەدا لە جێگایەك پێی دەوترێت (الحرة) لەو جێگایەدا خۆیان ئامادە کرد بگەنە خزمەت پێەمبەری خوا ﷺ خالید بە جوانترین شێوە خۆی گۆڕی، دەڵێت باشترین جلم لەبەرکرد بەهەرحاڵ گەیشتنە ناو شار و وەلیدی برای خالید پێشوازی لێکردن و وتی: خێراکەن پێغەمبەر ﷺ چاوەڕێتان دەکات.

پێش هاتنیان پێغەمبەری خوا ﷺ زانیبووی کە دێن و بە ڕێگاوەن، بۆیە چاوەڕوانیان بوو.

خالید دەڵێت: کە وتی چاوەڕێتانە لەخۆشیدا بە پەلە ڕۆیشتمە خزمەتی هەر لە دوورەوە بینیم پێدەکەنێت، تا لێی نزیك بوومەوە و سەلامم لێ کرد و وتم السلام علیك ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وعلیکم السلام، بە جوانترین شێوە و بە زەردەخەنە پێشوازی کردین.

خالید یەکسەر وتی: أشهد ان لا اله إلا الله وأنك رسول الله.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوپاس بۆخوا کە هیدایەتی دایت، لە کەسێکی ئاقڵی وەکو تۆ هەر ئەوەم چاوەڕوان دەکرد موسڵمان بیت لەسەر خێر و چاکە بێت.

خالید: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەند جێگایەکدا دژت وەستامەوە تۆ لەسەر حەق بوویت، لە خوا بپاڕێرەوە لێم خۆش بێت!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر هاتنە ناو ئیسلام ئەوەی ڕابردوو دەمرێت.

خالید: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعام بۆ بکە خوا لێم خۆش بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای موتەعال لەخالید خۆشبە لەو ڕێگرییانەی کە کردوویەتی لە ڕێگەی دینەکەتدا.

پاشان خالید باوەشی کرد بە هاوڕێ کۆنەکەیدا و بووە برا و پشتیوانی هاوەڵان، پاشان عەمری کوڕی عاس هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەستی ڕاستم بدەرێ تا بەیعەت بدەم.



پاشان دەستی پێغەمبەری گرت و بە توندی گوشی...

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: چییە عەمر بۆ وا دەستم دەگوشی؟!

عەمر وتی: ئەمەوێت مەرجێکت لەگەڵ بکەم.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: مەرجەکە چییە؟!

عەمر وتی: تەنها لێم خۆش بە.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەی نەتزانیوە بە هاتنە ناو ئیسلام هەموو تاوانەکانی ڕابردوو دادەڕوخێت، هیجرەت بە هەمان شێوە تاوانی ڕابردوو هەموو دەسڕێتەوە، هەروەها حەجکردنیش هەموو تاوانێك لەسەر خاوەنەکەی لادەبات.

پاشان عوسمانی کوڕی تەڵحە هاتە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەویش موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، کە لەڕاستی دا عوسمان هێزێکی سیاسی زۆر گەورە بوو بۆ دەوڵەتی ئیسلامی.

ئەم سێ قیادە گەورەیەی شاری مەکە بەهێزترین و قورسترین سوارچاکی قوڕەیش بوون لە مانگی سەفەری ساڵی ٨ ی کۆچی موسڵمانبوون، هەموو ئەمانەی کە ڕوویاندا کاریگەری پەیمانی حودەیبییە و عومرەی قەزایە لە دواییدا هەر ئەم کەڵە پیاوانەن وڵات لە دوای وڵات فەتح دەکەن.

لە دوای ئەم ڕووداوانە کە هەمووی دڵخۆشکەر بوون، بەڵام لەماوەی داهاتوودا گەورەترین سوپا بۆ موسڵمانان کۆدەبێتەوە، پێشتر لامان زۆر بوو سوپایەك (٤ هەزار) بێت لامان زۆر گەورە بوو، لەوە سەیرتر لامان (١٠هەزار) کەس بۆ موسڵمانان لە جەنگی ئەحزاب.

ئەم جارە (١٠٠هەزار) سەرباز لەلایەن قەیسەری ڕۆمەوە ئامادە دەکرێت بۆ جەنگی موسڵمانان، (١٠٠ هەزار) عەرەبی باکووری نەجد واتا عەرەبی شام. بە هەردوو لا (٢٠٠ هەزار) سەرباز، بۆ سێ هەزار موسڵمان لە ناوچەیەك دا بەناوی (موئتە) کە لە وڵاتی ئەردەنی ئێستادایە، گەورەترین جەنگ ڕوویدا لە مێژووی موسڵمانان و لە هەموو عەرەبدا جەنگی وا گەورە ڕووی نەداوە.



# جەنگی موئتە

ماکوان: لە ڕاستی دا دەوڵەتی ئیسلامی لە ساڵی ٧ی کۆچی دا بەرەو بەهێزیی دەڕۆیشت، ڕۆژبەڕۆژ بەرەو سەر دەڕۆیشت، سەروەری دوای سەروەری تۆماری دەکرد، لە دوای فەتحی خەیبەر و هەموو ئەو سوپایانەی کردیە سەر غەتەفان و عومرەی قەزا و موسوڵمان بوونی سێ قیادەی گەورەی سیاسی و سەربازی قورەیش خالید و عەمر و عوسمان، ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت.

زۆرێك لە خەڵکی زۆر دڵپڕقین بوون کە دەوڵەتی ئیسلامی ئەو سەروەری و فراوانبوونەی بە خۆیەوە دەبینی، ئەگەر چی ئەو خەڵکانە زۆر دووربوون لە دەوڵەتی ئیسلامی و هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان لەگەڵیدا نەبوو، زۆر بەخیل و ئیرەبەر و حەسوود بوون بەو دەوڵەتە گەنجە لە شاری مەدینە، هەوڵیان ئەدا هەرچۆنێک بێت شەڕی پێبفرۆشن و زەرەر و زیانی لێبدەن تەنانەت گەیشتە ئەو ئاستەی کە خوێنی زۆری موسڵمانان بڕێژن.

هەموو ئەم ڕووداوانە لە باکووری شاری مەدینە ڕوویدا یان باکووری نیوەدوورگەی عەرەب، ئەو ناوچەیە جێگا و ئیهتیمامی (گرنگی پێدانی) زۆرێك لە هێزەکانی عەرەبی شام و عێراق و ئەردەن بوون کە هۆزی زۆر گەورە بوون لەو سەردەمە دا، ناوچەیەکی بێشوومارریان داگیر کردبوو لە بەناوبانگترین ئەو هۆز و عەشیرەتانە (هۆزی لەخم، جوزام، بەلقین، بەهرا، بەلا، غەسان، قوزاعە) زۆریتر لە دانیشتوانی ئەو ناوچانە بە ملیۆن ژمارە دەکرێت، هەموو عەرەبی نەسرانی بوون و سەر بەدەوڵەتی ڕۆمی قەیسەر بوون، ڕۆم ئیدارەی هەموو ئەو ناوچانەی دەکرد، بەگشتی گەورە و سەرۆکی هۆز و عەشیرەتەکان هەموو کاریان بۆ هیرەقل دەکرد و فەرمانبەری ئەو بوون، هەروەکو پیشەی دەوڵەتی بچووك کە هەمیشە فەرمانبەری زلهێزەکانن.

هۆکاری جەنگی موئتە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٦ و ٧ی کۆچی کە کۆمەڵێك لە باکووری شاری مەدینە، زۆر کاری نابەجێ و دەستدرێژی و مامەڵەی ناشایستەیان دەکرد بەرامبەر بە موسڵمانان.



# هۆکاری جەنگی موئتە چی بوو؟

ماکوان: لە مانگی جەمادی کۆتایی لە ساڵی ٦ی کۆچی هۆزی جوزام ڕێگەیان گرت بە دحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبی، هەموو دیاریەکانیان لێسەند، پێشتر بە دووروودرێژی باسمان کرد بەم هۆکارە مەفرەزە و سرییەکی گەورە بەسەرکردایەتی (زەیدی کوڕی حارس) بۆ ئەو ناوچەیە نێردرا، ناوچەکە ناسرابوو بو (حیسس) بە (٥٠٠)سەربازەوە، توانی ئەو ناوچەیە هەموو بهەژێنێت و کەس نەتوانێت لەبەردەمیاندا خۆی بگرێت، سەرکەوتنێکی زۆر نایابیان بەدەست هێنا.

هەروەها ڕەتکردنەوەی ئیسلامبوونی خۆی لەلایەن هیرەقلەوە لەگەڵ ئەوەی کە بڕوای تەواوی بە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەبوو، زۆری نەمابوو کە ببێتە پادشا و قەیسەرێکی موسڵمان، بەڵام لە دوای کوشتنی ئوسقووفی ڕۆم ئەویش ترسا، دیاربوو ڕۆم بەدوای جەنگەوە بوون دژی ئەم پێغەمبەرەوە و دەوڵەتەکەی.

لە هەمانکاتدا هەڵوێستی (حارسی کوڕی ئەبو شەمر) گەورە و پادشای دیمەشق، بڕیاری دابوو کە سوپا بکاتە سەر شاری مەدینە دژی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ، بەڵام هیرەقل وەستاندی و ڕێگری لێکرد.

هەموو ئەم ڕووداوانە لەسەر یەك کەڵەکە ببوون و چاوەڕوانی پێداکێشانێکی گەورەی دەکرد لە نێوان عەرەب و موسڵمانان دا.

لە ناوچەکانی باکوور، پاشان هۆزی (قوزاعە) لە مانگی (ربیعولئەوەل) ساڵی ٨ی کۆچی دا (١٥) هاوەڵی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَیان شەهید کرد بە غەدر لەو (١٥) هاوەڵە کە سەرکردایەتیان لەلایەن (کەعبی کوڕی عومەیری ئەنساری و عەمری کوڕی غەفاری) کە دوو هاوەڵی زانا بوون لە قورئان و شەریعەت لەگەڵ هاوەڵانی تردا بۆ بانگەواز چووبوونە ناوچەکە کە ناسرابوون بە مەفرەزەی (زات ئیتڵاح).[٧٩]

لە دوای ئەم ڕووداوانە خیانەتێکی زۆر لە کە شەرحەبیلی کوڕی عەمری غەسانی دەرکەوت کە فەرمانبەری هیرەقل بوو.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نامەیەکی بانگەوازی نارد بۆ پادشای (بووسرا) لە وڵاتی ئەردەنی ئێستا، نوێنەری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و دەوڵەتەکەی هاوەڵی بەڕێز (حارسی

---

[٧٩] ـ ذات أطلاح.



كوڕی عومەیر) بوو لەسەر ڕێگاكەی دا شورحەبیلی كوڕی عەمری غەسانی لە ناوچەی (بەلقا) لە ئەردەن دەستبەسەری كرد و پاشان بەستییەوە و ملی پەڕاند و شەهیدی كرد.

لەو سەردەمە و لە هەموو سەردەمێكدا بە هەموو پێوەرێك كوشتنی سەفیر و نوێنەر كارێكی قێزەون و خراپ بوو، ئەم كوشتنە سەرپێچی هەموو عورف و یاسایەكی نێودەوڵەتی ئەو سەردەمە بوو، ڕووشاندنی كەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، لە هەمووی ناهەموارتر و خراپتر دەوڵەتی ڕۆم بڕیاری دەركرد كە هەر موسڵمانێك بگرێت لە شام و ناوچەكان دا دەیكوژێت!

تەنانەت والی (موعان) لە ئەردەن موسڵمان بوو، ڕۆم و عەرەب لەو ناوچەیە كوشتیان و هەروەكو چۆن ئوسقووفیان كوشت بە خەنجەر.



# هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر دەوڵەتی ڕۆم

ماکوان: لەگەڵ ئەم هەموو ڕووداوانەی ڕووی دا پێغەمبەری خوا ﷺ هەروا دەستەوئەژنۆ دانەنیشت، بەڵکو هەڵوێستی جددی وەرگرت، پێویست بوو ڕەدئیعتیبار بۆ دەوڵەتەکەی بگەڕێنێتەوە و بیپارێزێت.

دەبێت چارەسەری باکووری نیوەدوورگەی عەرەبی بکات، بۆ ئەو بانگەوازکارانەی دەڕۆن بانگەواز دەکەن، هەروەها دەبێت ڕێگای بازرگانی نێوانی مەدینە و شام بپارێزێت.

کێشەکە لەوە دایە ئەگەر هاتوو ڕۆم و عەرەبە نەسرانییەکان گەمارۆ بخەنە سەر ڕێگاکانی بازرگانی شام و موسڵمانن ناتوانن بڕۆن بۆ باشووری قوڕەیش، کەواتە دەبێتە هۆکاری خنکاندنی ناوچەی موسڵمانان، کەواتە دەرگاکانیان لێ بگیرێت کێشەکە زۆر ترسناکە و خەتەرە، هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە جددی وەریگرتوو، کاری تەواوی لەسەر کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە لێکۆڵینەوە لەسەر عەرەب و ڕۆم لەو ناوچانەدا و بە وردی و شیتەڵی کرد تابزانێت چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ زانی عەرەبی باکوور دوو بەشن، کێشەی گەورەی بۆ درووست دەبێت لەگەڵ دوو ئیمپراتۆری گەورە کە فارس و ڕۆم بوون

بەشی یەکەم: عەرەبە نەسرانیەکانن لە هاوپەیمان و ئەڵقە لەگوێی دەوڵەتی ڕۆمن، هەموو کار بۆ هیرەقل دەکەن، نموونەی (لەخم و غەسان...هتد)

بەشی دووەم: هۆزی قوزاعەیە کە (١٥) هاوەڵی پێغەمبەری خوایان ﷺ شەهید کردووە، ئەمان بە پێچەوانەوە موشریکن و پێشتر لەگەڵ دەوڵەتی فارس دا بوون، بەڵام ئێستا پەیوەندییان بە کەسەوە نەماوە، سەربەخۆن لە دوای سەرکەوتنی ڕۆم بەسەر فارس دا.

دوو کێشەی زۆر گەورە بوون پێویست بوو پێغەمبەر ﷺ بەچاوی ئیعتیبار تەماشایان بکات و یەکە یەکە بڕواتە سەریان تا دەوڵەتەکانی پشتیان نەئاڵۆزێن کە هەردوولا خاوەنی ملیۆن سەربازن.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا بیری کردەوە لەگەڵ عەرەبەکانی ڕۆم لەوانەوە دەست پێبکات دا کە نەسرانی بوون لە باکووری شاری مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ جەختی کردەوە و بڕیاریدا کە سوپا بکاتە سەریان، لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی



ئەگەری زۆری هاوپەیمانی عەرەب و ڕۆم لەو ناوچەیەدا هەیە، هەربۆیە هەڵسا بەچەند پلانێك.

پلانی یەکەم: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بە کۆکردنەوەی گەورەترین سوپا و بەهێزترین سوپای ئیسلامی بۆ دەرچوون لە شاری مەدینە کە سەربازەکانی ئەو سوپایە گەیشتن بە ( ٣ هەزار) موجاهید، ئەمەش گەورەترین هێزە موسڵمانان کۆیبکەنەوە لە دەرەوەی شاری مەدینە جەنگ بکەن.

پلانی دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ لەم سوپایەدا زەیدی کوڕی حارسی کرد بە ئەمیری یەکەمی و دوو جێگیری ئەمیری تر بۆ دانا، فەرمووی: ئەگەر زەید کوژرا جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیب دەبێتە ئەمیر، ئەگەر جەعفەر کوژرا عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە دەبێتە جێگرەوەی.

هەربۆیە یەکەم جار زەیدی کردە سەرۆکی سوپاکە لەبەر ئەوەی لە ساڵی ٦ی کۆچییەوە مەشقێکی مەیدانی زۆر باشی کردبوو، هەر زەیدیش بوو سەرۆکی مەفرەزەی (حیسمی) بوو، سەرکەوتنی باشی بەدەستهێنا و هەموو ناوچەکە شارەزا بوو، هەروەها سەرکردایەتی و٥ سوپای تری کردبوو.

هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جێگری بۆ دانان لەبەرئەوەی هەستی بەوە کردبوو کە جەنگی خەست و قورس ڕووئەدات، گریمانی شەهید بوونی تیا دانابوو.

یەکەم جارە بەم شێوەیە سوپا ڕێك بخات سێ ئەمیر دانێت، پێدەچێت هەر بە وەحی بووبێت، چونکە هەر ئەوجارە ڕووی داوە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ دا.

پلانی سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سوپاکەدا خالیدی کوڕی وەلیدی نارد، بەڵام وەکو سەرباز دەکرێت لەبەر هۆکاری ئەوە بووبێت هیچ پلەیەکی وەرنەگرت چونکە هەمووی سێ مانگ بوو موسڵمان ببوو هەربۆیە نەبووە سەرکردەی سوپاکە، دیارە تا ئێستا شارەزا نییە لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ سەرباز و موجاهیدانی موسڵمان دا.

ئەمەش یەکەم تاقیکردنەوەی خالیدە، یاخود یەکەم چالاکی خالیدە لەناو ئەو سوپا موبارەکە.

سوپا ئامادە بوو بەو شێوەیە دەرچوو لە شاری مەدینە سێ هەزار موجاهید بۆ جەنگی عەرەبەکانی باکووری نیوەدوورگەی عەرەب، لەگەڵ ئەوەی ڕێگا دوورو و درێژە و زۆر سەختە کە زیاتر لە (١٠٠٠کم) دوورە لە شاری مەدینە، پاشان ئەو ناوچە بیابانێکی فراوان و وشکە، لە هەموو سەختتر وەرزی هاوینە و ناوچەکە سووتێنەرە چونکە لە مانگی ئاگستی (ئاب) ساڵی



٦٢٩ز. بەرامبەر (جەمادی کۆتایی ساڵی ٨ی کۆچی) لەگەڵ ئەو هەموو لەمپەرانەدا سوپاکە دەرچوو، بەڵام باری دەروونی موسڵمانان زۆر بەرز و بەهێز بوو هەموو بەو پەڕی شەوق و زەوق و خۆشی و بە ئومێدی شەهید بوون و لە هەمان کاتدا سەرکەوتن دەرچوون. پێغەمبەری خوا ﷺ ئامانجی ئەم سوپایەی دیاری کرد، ئامانجی ئەم سوپایە بریتیی بوو لە دوو ئامانجی سەرەکی:

ئامانجی یەکەم: بانگەوازی هەموو ئەو هۆز و عەشیرەتانە بکەن بۆ ئیسلام، چونکە ئیسلام بوون لای پێغەمبەر ﷺ گرنگتربوو تا جەنگ کردن لەگەڵیاندا، ئەمەش هەوڵی هەمیشەیی پێغەمبەری خوایە.

ئامانجی دووەم: کوشتنی شەرحەبیلی کوڕی عەمری غەسانی و هاوکارەکانی، ئەویش لەبەر ئەوەی نوێنەرەکەی پێغەمبەر ﷺ یان شەهید کرد.



## وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ سوپاكە

ماكوان: لەگەڵ ئەوەی جەنگەكە گەڕانەوەی سومعە و ئیعتیبارە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی و پاراستنی كەرامەتی و تۆڵەسەندنەوەیە لە خیانەتكاران و ملهوڕان بەتایبەتی لە شەرحەبیلی كوڕی عەمر و هۆزەكەی لەبەرامبەر كوشتنی هاوەڵی بەڕێز (حارسی كوڕی عومەیر).

بەڵام سوپای موسڵمانان خاوەنی پرنسیب و ڕەوشتی تایبەتی خۆیەتی، دەبێت پارێزەری ئەو یاسا و ڕێساو ڕەوشتە بەرزانە بێت كە لە جەنگدا پیادە دەكرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جەختی لەسەر پابەند بوون بە شەریعەت و یاسا و ڕێساكانی جەنگ دەكرد.

بێگومان ئەمەش وێنەیەكی شارستانییەتی قووڵمان نیشان ئەدات كە لە مێژوودا هاوشێوەی دەست ناكەوێت، تەنانەت لە هەموو جیهاندا بە ئەمرۆشەوە لە سەدەی ٢١.

پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی كرد بۆ سوپاكەی و فەرمووی:

بڕۆن بە ناوی خوای پەروەردگار لەسەر ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز پیر و پەككەوتە نەكوژن، یاخود كەسێك كە خۆی بۆ بەندایەتی ساغكردۆتەوە (جا هەر دینێك بێت)، مناڵ نەكوژن، ژن نەكوژن، زیادەڕۆیی نەكەن لە پێناوی دەستكەوت و غەنیمەت، چاكەخواز بیت و بە دوای چاكە و كاری چاكدا بگەڕێن، چونكە خوای پەروەردگار چاكەخوازانی خۆش دەوێت یاری بە لاشەی هیچ كەس مەكەن، لاشەی هیچ كوژراوێك تێكنەدەن.[٨٠]

ئەمە پرەنسیپ و ئەخلاقی سەربازی موسڵمانانە كە تەنها ئەم فەرموودەیەی پێویستی بە هەڵوێستەكردن هەیە و پێویستی بە چەندین كتێب هەیە لە سەری بنووسرێت، بەڵام بەداخەوە دەبێت ڕەچاوی ئەو كەسانە بكەم كە ئەم كتێبە دەخوێننەوە، ئەگەر لەبەر خوێنەر نەبوایە دەبوو ئەم كتێبەی دەینووسم بەلایەنی كەم (٢٠ )بەرگ بوایە، بەڵام دەبێت ڕەچاوی گیرفانی خوێنەری كورد بكەم و هەروەها توانای گشتی خەڵكی كە خوێنەرە.

هەموو ئەم وەسیەتانە بۆ سوپاكە بۆ تۆڵە سەندنەوە دەڕوات، بۆ سەندنەوەی كەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامی جەنگ دەكات.

---

٨٠ ـ (انطلقوا باسم الله وبالله وعلى ملة رسول الله, ولا تقتلوا شيخاً فانياً ولا طفلاً صغيراً ولا امرأةً, ولا تغلوا وضموا غنائمكم وأصلحوا واحسنوا, انّ الله يحب المحسنين, ولا تمثّلوا..) رواه مسلم وأبوداود.



کاتێك ئەم سوپایە کەوتەڕێ هەرگیز بیری لەوە نەکردبووەوە ڕۆم لە جەنگدا بەسەربازییەوە بەشدار دەبێت، وا پەی دەبرا کە ئەوان بێلایەن دەمێننەوە نابن بە بەشێك لە جەنگەکە، ئامانجی سوپاکە تۆڵە سەندنەوەیە لە شەرحەبیلی کوڕی عەمر، موسڵمانان وابیریان دەکردەوە خۆ ئەگەر سوپا کۆبێتەوە لەوانەیە دوو ئەوەندە یاخود چوار ئەوەندەی سوپای موسڵمانان بێت.

ئەم سوپایە بەدوای ژیاندا نەدەگەڕا بەڵکو بۆ مردن دەجەنگی و قیامەت ئامانجی تەواوی ئەم سوپایە بوو، هەموو ئاواتە خوازی شەهیدبوون بوو، بە هەموو پێوەرێك بە دوای مردنەوە بوون.

عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە یەکێك لە ئەمیرەکانی ئەو سوپایە لە ڕێگادا دەستی بە گریان کرد، نەك لەبەر ئەوەی دەترسێت بەڵکو ترسی قیامەتی لە دڵ دا بوو، هاتن پرسیاریان کرد وتیان بۆچی دەگریت؟ لەبەر ئەوەی مردن لە ڕێگادایە و دنیات خۆشدەوێت؟!

لە وەڵامدا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە فەرمووی: سوێند بەخوا دونیا و خۆشییەکانی وەکو پووش وایە و لام هیچ ئەرزشی (نرخ) نییە، بەڵام لە قورئان دا هاتووە و گوێم لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو کە ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە و دەیفەرموو:

﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾﴾ [مريم]

واتە: ئێوە (خەڵکینە) کەستان نییە تێپەڕنەکات بەسەر دۆزەخدا، ئیمانداران بۆ ئەوەی زیاتر بۆ ئەوەی زیاتر قەدری بەهەشت و ڕەحمەتی خوا بزانن، کافران بۆ ئەوەی بکەونە ناوی) ئەم پێشهاتە شتێکی بڕیاردراوە هەر جێبەجێ دەکرێت.

جا نازانم کە دەچمە ناوی یان پیایدا تێپەڕ دەبم.

ئەمەش تەواوی خواناسی و ئیمانی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە دەردەخات، لە پەیمانی عەقەبەوە تاکو ئەو ساتە وەختە هەر لە جیهاد دابووە.

لە بەدردا بەشدار بوو، لە ئوحودا بەشدار بوو لە وانە بوو کە ڕاینەکرد، لە ئەحزاب بەشدار بوو لە حودەیبییە و ئەهلی ڕزوان بوو، بە شمشێر و هۆنراوە هەمیشە بەشدار بووە، باشترین ڕاگەیاندکاری دەوڵەتی ئیسلامی بوو لە عومرەی قەزا دا هۆنراوەکانی تیر و شمشێر بوون بۆ دڵی موشریکەکانی قورەیش، لەگەڵ ئەوەدا بیری لەوە دەکردەوە داخوا دوایی چۆن بەسەر پردی سیرات دا تێپەر دەکات، ئایا دەکەوێتە ناوی یان دەردەچێت!

چونکە ئاوات و ئومێد و هیوای شەهیدی بوو، بۆ شەهیدی دەگریا و دەیوت بە هۆنراوە:

لَكِنَّنِي أَسأَلُ الرَحمَنَ مَغفِرَةً     وَضَربَةً ذاتَ فَرغٍ تَقذِفُ الزَبَدا



أَو طَعنَةً بِيَدَي حَرّانَ مُجهِزَةً　　　بِحَربَةٍ تُنفِذُ الأَحشاءَ وَالكَبِدا

حَتّى يُقالَ إِذا مَرّوا عَلى جَدَثي　　　أَرشَدَهُ اللَّهُ مِن غازٍ وَقَد رَشَدا

تا ئەمڕۆش هەرکەس بە لای گۆڕەکەیدا ڕەت دەبێت دەڵێت:

(أرشدك الله من غاز وقد رشدا)

هەر بۆیە ئیمامی ئەبو بەکر دەفەرمووێت: هەر کۆمەڵێك ئامانجیان مردن بوو خوای گەورە ژیانیان پێ دەبەخشێت.

سوپایەك لە پێناوی خودا بجەنگێت و ئاواتی مردن بێت، ئەستەمە بڕوخێت و بدۆڕێت لەمردنیش ناترسێن، خۆی ئامانجیان مردنە، کەواتە سوپای ئیسلام هەرگیز و هەرگیز شکست ناخوات ئەگەر لەسەر مەنهەج بێت.



# سوپای ئیسلام گەیشتە ناوچەی (معان)

ماکوان: سوپای موسڵمانان گەیشتە ناوچەی (معان) لە وڵاتی ئەردەنی ئێستا و لە بەرواری جەمادی یەکەمی ساڵی ٨ ی کۆچی لە گەشتێکی زۆر سەخت و دژوار و گەرمدا.

ئەوەی کە موسڵمانانی تووشی شۆك کرد، ئەوەبوو کە هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهات بوو، بینییان وڵاتی ڕۆم سوپایەکی بێشوومارى ئامادەکردووە کە خۆی ئەدات لە (١٠٠هەزار) سەرباز، بێجگە لەم سوپایە سوپای عەرەبی نەسرانی لەگەڵیاندا ئامادە بوو کە ئەویش مەزندە دەکرێت بە (١٠٠هەزار) سەرباز بە هەردوولا (٢٠٠ هەزار) سەرباز کۆبووبوونەوە، موسڵمانانیش (٣ هەزار) سەرباز بوون.

ژمارەیەکی یەکجار زۆرە، ئەوەی کە هەموو لایەکی سەرسام کرد سوپای ڕۆمەکانە کە بەشدارە بەو ژمارە زۆرە، نەك لەبەر زۆری ژمارەکە بەڵکو ئامادەیی بۆ جەنگ جێگای سەرنج و تێڕامانە، کە بۆ سێ هەزار سەرباز ئەو هەموو سوپایە کۆکراوەتەوە! دیارە ئەوانیش واتا ڕۆم وایان پەی بردووە کە ژمارەی موسڵمانان خۆی ئەدات لە (١٠٠هەزار) سەرباز بۆیە ئەو سوپا پڕچەك و هێزە ئامادە کراوە دژیان.

تەنانەت ئەوەی جێگای سەرنجە عەرەبی ئەو ناوچەیە هەرگیز ئەوەندە یەگرتوو نەبوون تا ئەوەندە سەربازە کۆبکەنەوە، دیارە کە هیرەقل هانیداون و بەقسەی قەیسەر ئاوا کۆبوونەتەوە، خوای گەورە لە سورەتی المعارج دەفەرمووێت:

﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾﴾ [المعارج]

واتە: ئەو ڕۆژەی بە پەلە لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، دەڵێی بۆ لای بت و پەرستراوەکانیان ڕادەکەن

لە خاکی مەعان (٢٠٠ هەزار) سەرباز چاوەڕوانی سوپای ئیسلامین کە بریتیی بوو لە (٣٠٠٠سەرباز)، سوپای ڕۆم هەموو مەسیحین، ئەو ژمارە زۆرە بووە شۆك بۆ موسڵمانان.

سوپای ئیسلام لەو ڕەوشە ترسناکە دا خێرا مەجلیسێکی ڕاوێژیان بەست کە پیشەی سوپای سەرکەوتوو شوورایە، بۆ ئەوەی تاوتوێ ڕەوشەکە بکەن و بزانن چی بکەن و چۆن هەنگاو هەڵبنێن، لە ئەنجامدا سێ بۆچوونی تێدا دەرچوو کە هەریەکە لەوی تر جیاواز تر بوو.

ڕا و بۆچوونی یەکەم: کۆمەڵێك لە موسڵمانان پێیان وابوو کە بە زووترین کات نامە بنێرن بۆ پێغەمبەر ﷺ و لە ڕەوشەکەی هێزی دوژمن ئاگاداری بکەنەوە ئایا جەنگ بکەن



یاخود پاشەکشە بکەن، بێگومان شاری مەدینە ماوەی ٢ هەفتە ڕێگا دوورە لەو جێگاوە، تاکو نامەکە دەگات و دەگەڕێتەوە مانگێکی پێ دەچێت، ناکرێت یەك مانگ چاوەڕێ بکرێت بۆ ئەوەی وەڵامیان لای پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ بگەڕێتەوە، خۆ ئەگەر موسڵمانان چاوەڕوان بن بە دڵنیاییەوە ڕۆم چاوەڕوان ناکات و هێرش دەکات.

ڕا و بۆچوونی دووەم: سەرۆکی سوپاکەی (زەیدی کوڕی حارس) وای پێباش بوو کە پاشەکشە بە سوپاکە بکات و نەچێتە ناو ئەو جەنگەوە چونکە لە توانایاندا نییە، کۆمەڵێکی هاوەڵان لەسەر ئەم ڕایەی زەیدی کوڕی حارس بوون کە بگەڕێنەوە بۆ شاری مەدینە، ئەم جەنگە دۆڕاندن و لەناوچوون مسۆگەرە.

ڕا و بۆچوونی سێیەم: ڕا و بۆچوونی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بوو ئەمیری سێیەمی سوپاکە، پێی وابوو دەبێت جەنگ بکەین بێ دوودڵی و ڕووبەڕوویان ببنەوە، هەڵساوە لە ناو مەجلیسەکەدا و فەرمووی:

ئەی گرۆی موسڵمانان، ئەوەی پێتان ناخۆشە کە جیهاد و قیتالە ئێمە بۆ ئەوە هاتووین، ئێمەی موسڵمان بە هێز و توانا و چەك جەنگ ناکەین بە ژمارەی زۆری و کەمی جەنگ ناکەین، بەڵکو بەئایینی خوا لەگەڵیاندا دەجەنگین کە خوای پەروەردگار بەم ئایینە سەربەرزی کردووین، با بڕۆین بۆ جەنگ یان سەردەکەوین یان شەهید دەبین، لە هەردوو حاڵەتەکەدا براوەین.

عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە پوختەی وتەکانی بنەمای بنەڕەتی جیهاد و کۆششکردنە لە پێناوی خوادا، کەی موسڵمانان بەهێز و زۆربوون سەرکەوتوون، بەڵکو پشتبەستن بەخوا سەریان دەخات، دوای ئەوەی هەرچی لە توانایاندا بوو کۆی بکەنەوە، پاشان سەرکەوتن لای خوای پەروەردگارەوەیە.

هەروەها لەوەی وتەکانی بەدی دەکرێت، موسڵمانان بە ئایینی خوای گەورە دەجەنگێت، ئەوە چەکی سەرەکی ئیماندارانە و کۆتایی وتەکانی یان سەرکەوتنە یان شەهید بوونە.

هەموو لەسەر ڕاکەی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کۆك بوون و بڕیاری جەنگیان دا، ئەم بڕیارەش بۆخۆی جێگای شۆك بوو بۆ من کە سێ هەزارکەس ڕووبەڕووی (٢٠٠هەزار) کەس ببنەوە!



# هەڵوێستەیەك لەسەر بڕیاری جەنگ لە موئتە

ماکوان: گومانی تێدا نییە بڕیاری بە کۆمەڵی هاوەڵان لەسەر جەنگ، مانا و واتایەکی زۆر گەورە و پڕ خێر و چاکەیە، بەڵگەیە لە داوای ئەخیرەت و نەویستنی دونیا لە هەمانکاتدا واتای ئیخلاس و ڕاستگۆییە و خۆساغکردنەوەیە بۆ دینی خوا و دڵیان پڕ لە ئیمان و خۆشەویستی خوای پەروەردگار.

ئازایەتی هاوەڵان بێوێنەیە زۆر لەوە زیاتر و بەرزتر و گەورەترە ئازایەتیان کە من و تۆ بیری لێ بکەینەوە و یاخود سەدان نووسەر لەسەری بنووسن هێز و توانای جیهاد و جەنگیان بێ سنوورە و وێنا ناکرێت.

هەروەکو ئاماژەم پێدا گومان لە ئازایەتی و ڕاستگۆیی و ئیخلاسی ئیمانداران نییە، بەڵام دەبێت بزانین و تێبگەین چۆن بڕیاری جەنگیدا، ئایا بڕیارێکی ڕاست و درووست بوو؟ یاخود ئایا دەبوو جەنگ بکەن یان پاشەکشە بکەن؟

لە دوای لێکۆڵینەوە و ڕۆچوون و قووڵ بوونەوە بەناو بیری هاوەڵاندا، بەڵێ بە دڵنیاییەوە بڕیارێکی زۆر ڕاست و تەندرووست بوو، بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ فەرموودەیەك یاخود کۆمێنتارێکی (وتە) نەرێنی نەبوو لە سەریان، بەڵکو نەیفەرموو هاوەڵان دوور و نزیك هەڵەبوون لە بڕیارەکەیاندا، تەنانەت نەیفەرموو چاکتر بوو جەنگ نەکەن، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەر شتێک مونکەر و خراپ بێت دەستبەجێ ڕاستی دەکاتەوە، خراپەکە دەستنیشان دەکات، بڕیار لەسەر باشە ئەدات لە سوننەتەکەیدا، بۆ ئەوەی خەڵکی پیادەی بکات.

مانای وایە هەرکاتێك موسڵمانان تووشی حاڵەت و ڕەوشی لەو جۆرە بوونەوە دەتوانن جەنگ بەکەن، بەڵام چۆن بتوانین پارسەنگ ڕابگرین، لەگەڵ ئەوەی سوپاکە بەرەو لە ناوچوون ئەڕوات و لەگەڵ بڕیاری ڕاستیان لە کاتێکدا ئەو سوپایە دڵی سوپای دەوڵەتی ئیسلامییە ئەگەر لە ناوچوو زۆر ترسناکە.

بڕیارەکە بە دڵنیاییەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە دای ڕاست و درووست بوو، چونکە لە ناو سوپاکەدا توانا و هێزی سەربازی زۆر گەورەی تێدا بوو، لەوانە خالیدی کوڕی وەلید، کە بەتوانا و ئوستازی (شارەزا) جەنگ و بوارەکانی سەربازی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی زۆر واقعی و واقیعناس بوو، بەڵام خالید هیچ کۆمێنت و وتەیەکی نەبوو بەڵکو ئامادە بوو بۆ جەنگ، هەروەکو ئاماژەم پێدا ئەم سوپایە موڵکی ئەو قیادانە نییە، بەڵکو موڵکی دەوڵەتی



ئیسلامیە و خوا نەخواستە تیابچن کارێکی زۆر خراپە و کارێکی زۆر نەرێنی لێ دەکەوێتەوە، لە کاتێکدا کۆڵەگەی دەوڵەتی ئیسلامییە بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە سوپای ڕۆم یەکجار زۆرە جەنگ کردن زۆر باشترە، ئەگەری سەرکەوتن زۆرترە تا پاشەکشەی بێجەنگ، دیسان پسیارەکە خۆی دووبارە دەکاتەوە دەڵێت: چۆن سێ هەزار دەتوانێت ڕووبەڕووی (۲۰۰ هەزار) ببێتەوە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە سێ تەفسیر لای ماکوان هەڵدەگرێت.

ئەگەری یەکەم: پێدەچێت موسڵمانان نەیانزانیبێت کە ژمارەیان ( ۲۰۰ هەزار) سەربازە لەوانەیە بە( ۷ جار) ئەوەندەی سوپاکەی خۆیان تەماشایان کردبێت یاخود ۱۰ جار و هەروەها یاخود زیاتر، بەڵام هەرگیز بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە بەدەقیقی (۲۰۰ هەزار) سەربازن بۆیە بڕیاری جەنگیان داوە، پێشتر دەیانزانی بە ژمارەی زۆر موسڵمانان سەر ناکەون، ئەزموونیان هەبوو بەرامبەر موشریکەکان کە ژمارەیان زۆر بوون بەڵام سەرکەوتن بەسەریاندا، بەهێز و توانای خوای پەروەردگار.

ئەم دوو ئایەتەیان لەبەرچاو گرتووە خوای گەورە دەفەرموویت:

﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلْجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغْتَرَفَ غُرْفَةًۢ بِيَدِهِۦ ۚ فَشَرِبُوا۟ مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ قَالُوا۟ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴿٢٤٩﴾﴾ [البقرة]

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴿٦٥﴾﴾ [الأنفال]

واتە: ئینجا لەکاتێکدا تالوت سەربازانی جیاکردەوە و پێی وتن (وا ئێمە دەڕۆین)، بێگومان خوا (لە ڕێ گوزەرماندا) تاقیتان دەکاتەوە بە ڕووبارێک (دوای ماندوو بوون و تینوویەتی)، جا ئەوەی لێی بخواتەوە (ئەوە سەربازی) من نییە و (بگەڕێتەوە) و ئەوەی ئەیچێژێت یان تەنها لوێچێک بەدەستی خۆی بخواتەوە ئەوە بەڕاستی سەربازی منە و (دەپەڕێتەوە و دەڕۆین، جا لەگەڵ ئەو ڕوونکردنەوەیەشدا) زۆربەیان (لە ئاوی ڕووبارەکەیان) خواردەوە، کەمێکیان نەبێت، جا کاتێک لێی پەڕینەوە خۆی و ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو لەگەڵیدا (هەندێکیان) وتیان: ئەمڕۆ (زەحمەتە بەم ژمارە کەمەوە) دەرەقەتی جالوت و سەربازانی بێین، (بەڵام) ئەوانەی دڵنیا بوون



بە خزمەتی پەروەردگاریان دەگەن وتیان: (مەترسن) چونکە چەندەها جار دەستەی کەم، زاڵ بوون بەسەر دەستەی زۆردا بەفەرمانی خوا و خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە.

واتە: ئەی پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هانی ئیمانداران بدە لەسەر جەنگ (دژی ئەوانەی کە کۆسپن لە ڕێبازی گەیاندنی پەیامی خوادا) ئەگەر بیست کەسی خۆڕاگر هەبێت لە ئێوە، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسدا، خۆ ئەگەر سەد کەس لە ئێوە هەبن، ئەوە بەسەر هەزار کەس لەوانەی کە بێ باوەڕن زاڵ دەبن، چونکە بەڕاستی ئەوانە کەسانێکن کە تێناگەن (چ هێزێک پشتیوانیی لە ئێوە دەکات)

هەربۆیە موسڵمانان بڕیاری جەنگیاندا توانای ئەوەیان نەبوو بە باشی بزانن ژمارەی سوپاکە چەندە، هەرچەندە لە ناو موسڵماناندا، دەشێت یەك کەسیان بە (١٠٠٠کەس) هەژمار کردبێت وەکو ئیمامی ئەبو بەکر دەفەرمووێت: قەعقاع کوڕی عەمری تەمیمی و بەهەزار پیاوە، ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب لە حەقی ئازایەتی عوبێدەی کوڕی صامت و زوبێری کوڕی عەوام و مەسلەمەی کوڕی مووخەلەدو میقدادی کوڕی عەمر دەفەرمووێت: هەر یەك لەمانە بە هەزار پیاوە یاخود دەڵێت خالیدی کوڕی وەلید بە یەك ملیۆن پیاوە!

زۆر ڕوون و ئاشکرایە ئەوانەی لە جەنگی موئتە بەشدار بوون هەموو ئیماندار و چاونەترس و ئازا و خواناس بوون.

هەر یەکێك لەو موسڵمانانە بەرامبەر بە دەیان و سەدان و هەزارانی کافرانی ڕۆم و عەرەبی هاوپەیمانیانن.

لێرەوە تێدەگەین بەڵی بەڕاستی بڕیاردانی جەنگ بڕیارێکی زۆر تەندرووست بوو، هەروەکو ئاماژەم پێدا پێدەچێت وایان زانیبێت (٣٠ بۆ ٤٠ هەزار) کەسن، لەبەر ئەوەی ئەو ژمارە زۆرە بۆ موسلمانان ئەستەمە بیزانن ئەگەر مێژوو بۆ ئێمەی نەگێڕایەتەوە، هەروەها ئەوان شارەزای ئەو ناوچەیە نەبوون لە دەشت و دۆڵ و گرد و ڕێگا و بانیاندا.

ئەگەری دووەم: پێم وایە مێژوونووسان زیادەڕەویان کردووە لەو ژمارەیەدا کە دەڵێن ( ٢٠٠ هەزار) کەس بوون، بەڵی بە دڵنیاییەوە چەند جار لە هێزی موسڵمانان زۆر تر بوون، بەڵام (٢٠٠ هەزار) لە کتێبەکان بۆ ئێمەیان باسکردووە جێگای سەرنجە.

ئەگەری سێیەم: کە من خۆم ئەم ئەگەرەم لە هەردوو ئەگەرەکەی تر پێ بەهێزترە بەڵێ بە دڵنیایەوە (٢٠٠ هەزار) سەرباز بوون ڕۆم و هاوپەیمانی، بەڵام موسڵمانان بۆیە بڕیاریاندا کە جەنگ بکەن، ئەگەر پاشەکشەیان بکردایە هەموو بە لەناوچوون و سەربڕین دەڕۆیشتن و سوپای ڕۆم دەوری ئەوانەی ئەدا و ئەوکات کوشتنی هەموو سوپاکە ئاسانتر بوو، ئەوکات جەنگ دەبووە قەسابخانەی موسڵمان و هەموو کۆتاییان پێدەهات.



بۆیە باشترە جەنگ هەڵبژێرین، خۆڕاگربین و بەرگری بکەین، ئەم بڕیاری جەنگە وەکو ئەوە نییە بڕیاری پاشەکشە بدەیت، چونکە بڕیاری جەنگ پلان بۆ سەرکەوتندا دەڕێژێ، لە جیاتی ئەوەی پلان بۆ پاشەکشە و بەرگری دابڕێژێ، بڕیاری پاشەکشە واتا ڕاستەوخۆ شکستە، بە پێچەوانەوە کە سوپای ڕۆم و عەرەبی هاوپەیمانی زانییان سوپای موسڵمانان بۆ مردن جەنگ دەکات، ناچار دەبوون لە جەنگی مەرگیان خۆیان بپارێزن و ڕێگەیان بۆ بکەنەوە بۆ دەرچوون، چونکە ئەوەی بۆ مەرگ جەنگ بکات بیری لای زۆرترین کوشتارە لە دوژمن، ئەمەش ڕزگاربوونی موسڵمانانە.

کەواتە بیرۆکەی پاشەکشە هیچ چاکە و باشەیەکی نییە بێجگە لە نەهامەتی و ماڵ وێرانی سوپای موسڵمانان، بەڵام لە ڕووی شەرعییەوە هیچ کێشەیەکی تێدا نەبوو ئەگەر پاشەکشە بکەن چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾﴾ [الأنفال]

واتە: هەرکەس لەو ڕۆژەدا ڕابکاتە دواوە و پشتیان تێبکات ئەوە بەڕاستی لەگەڵ خەشم و قینی خوادا گەڕاوەتەوە و سەرئەنجام جێ و ڕێگەی دۆزەخە کە ناخۆشترین جێگە و سەرئەنجامە، مەگەر مەبەستی بەکارهێنانی هونەری جەنگ بێت یاخود مەبەستی شوێن گۆڕین و جێ گۆڕین و جێ گۆڕکێ بێت بۆ لای دەستەیەکی تر.

لەم ئایەتەدا خوای گەورە بە تەواوەتی چۆنییەتی پاشەکشەی دیاری کردووە، ئەگەر پاشەکشە پلانێکی جەنگە و خۆئامادەکردنەوەیە بۆ جەنگ هیچ کێشەیەکی نییە.

واتا سوپاکە دەگەڕێتەوە بۆ ناو سوپای سەرەکی و سەرلەنوێ بە پلان و چەکی باشتر و هێز و وزەی بەهێز تر دەگەڕێنەوە بۆ جەنگ، واتا سوپای موسڵمانان لەم جەنگەدا دەگەڕێنەوە بۆ شاری مەدینە، یاخود بۆ هەرجێگایەکی تری ئەردەن، یان بۆ ناو پێدەشت و گردەکان لە ڕووی شەرعییەوە هیچ کێشەیەکی تێدانییە.

واینابینم موسڵمانان وا هەستیان کردبێت هەموو سوپاکە لە ناودەچێت بۆیە بڕیاری جەنگیان دا، بۆیە بڕیاری ڕاکردنیان نەدا، بڕیاری جەنگ و پاشەکشەکردن بەشێوەیەکی پلەبەندی و ستراتیژی و سەربازیانە، هەربۆیە ئەو بڕیارە ئازایانەیان دا بۆ ئەوەی سوپاکە لەناو نەچێت.

یاخود هەرسێ قیادەی موسڵمانان بەتەواوەتی ژمارەی ڕۆم و عەرەبی هاوپەیمانیان بە ڕاستی ژماردووە زانیوویانە، بۆیە پێیان وابووە ئەستەمە پاشەکشە، بۆیە جەنگیان هەڵبژاردەی کۆتاییە.

خۆ ئەگەر ڕایانکرد و گەڕانەوە ئەوا بەدڵنیاییەوە کاریگەری باشی نابێت، ئەمان بۆ تۆڵەسەندنەوە هاتوون و کەچی هەڵهاتن ئەوا ئەوەندەی تر کەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامی دەڕووشێنن، ئەو هەموو ڕێگایەیان بڕی بوو پاشان ڕایان کرد.



# هەڵبژاردنی جێگای ستراتیژی جەنگ لە موئتەدا

ماکوان: لە دوای ئەوەی موسڵمانان بە کۆمەڵ بڕیاری جەنگیان دا، ئینجا بە دوای جێگادا گەڕان بۆ ئەوەی جەنگی تێدا بکەن، موسڵمانان پێش ڕۆم جێگایان هەڵبژارد، موسڵمانان بۆ جەنگ موئتەیان هەڵبژارد، لەو جێگایەدا سەربازگەیان خست و خۆیان بە تەواوەتی ئامادە کرد و مەتەرێز و سەنگەریان لێدا.

ناوچەی موئتە دەکەوێتە وڵاتی ئەردەنی ئێستا و لە باشووری پارێزگای کەرک-ی ئێستایە، کە ناوچەکەم بینی بەڕاستی گەورەترین ستراتیژی سەربازی موسڵمانانی نیشاندا و بەهەموو پێوەرێك موعجیزە بوو.

هەموو جێگاکە دەشت و بیابانێکی بەرفراوان بوو هیچ شاخ و گرد و بەرزی سروشتی تێدا نەبوو، هەموو ناوچەکە زەوییەکی تەخت و بەرفراوانبوو، موسڵمانان بۆیە ئەو جێگایەیان هەڵبژارد لەبەر چەند هۆکارێك:

هۆکاری یەکەم: هەڵبژاردەی ئەو ناوچە بیابانییە و پێدەشتە بۆ موسڵمانان زۆر باش بوو، چونکە کەمین و توانای دوژمن نەبوو خۆیان بۆ کەمین بشارنەوە، خۆ ئەگەر ڕۆم توانای کەمین و خۆشاردنەوەی هەبوایە لەو ناوچەیە زۆر خراپ بەسەر موسڵماناندا دەشکایەوە و بۆ سوپای موسڵمانان کارەسات درووست دەبوو.

هۆکاری دووەم: ئەو ناوچانە بریتیی بوون لە تەختی و بیابان، سوپای موسڵمانان زۆر بەباشی دەیانتوانی لە سەحرا و گەرمیدا جەنگ بکەن و ڕاهاتبوون، بەڵام سوپای ڕۆم بە پێچەوانەی سوپای موسڵمانان، نەیدەتوانی لەو بیابانەدا جەنگ بکات، ڕاهاتبوون بە جەنگ لە ناوچەی سەوز و فێنك و شاخاوی و دارستان وەکو ناوچەی شام و تورکیا، ئەو ناوچەیە گەرمییەکەی سووتێنەر بوو.

هۆکاری سێیەم: پشتیان هەموو بیابان بوو واتا باشووری موئتە بیابانێکی بەرفراوانبوو ڕۆم جوورئەتی نەبوو بڕواتە ناو قوڵایی بیابان، بەو پێیەی سوپای موسڵمانان کەی بیانەوێت دەتوانن پاشەکشە بە سوپاکەیان بکەن.

هۆکاری چوارەم: لەو ناوچەیەدا هەندێك قەڕەم و گژوگیای سەحراوی باڵایان کردبوو، سوپای ئیسلامی دەیان توانی لە شەودا خۆیان لەو جێگایەدا بشارنەوە بۆ پاشەکشە تاڕادەیەك لە سوودی سوپای ئیسلامی دابوو.



یاخود لەبار بوو بۆ دانانی کەمین بۆ موسڵمانان دژی ڕۆم، بەڵام ئەو کەمە گژوگیایە و قەڕەمە کەوتبووە پشتی سوپاکەوە.

هۆکاری پێنجەم: بەو پێیەی ئەوناوچە بیابانە هیچ بەربەستێکی سروشتی تێدا نییە، تا ببێتە جێگای بەرگری بەرگری لە سەربازی هەردوولا، ئەوەی ئەتوانرێت هەبێت تەنها شمشێر و قەڵغانەکەیەتی، جا ئالێرەوە ئازایەتی موسڵمانان و هێز و توانا و خۆساغکردنەوەیان دەردەکەوێت، دەبینرێت کێ بەتوانا و بەهێز و ئازایە، گومانی تێدا نییە ئەم بەشە لە سوود و قازانجی موسڵمانانە، چونکە ئەوان لە سوپای بەرامبەر زۆر بەهێزتر و ئازاتر بوون.

سوپای موسڵمانان لە پێناوی خوا و ڕەزامەندی خوای پەروەردگار دەجەنگن، بەڵام سوپای ڕۆم ئامانجیان نییە، نازانن لەبەر چی دەجەنگن!؟

هەموو لە پێناوی قەیسەر و خۆشییەکانی قەیسەر دەجەنگن.

کەواتە هەڵبژاردنی خاکی دەشت و بیابان نیشانەی ئازایەتی موسڵمانان دەردەخات.

سەعاتی سفر و دەستپێکی جەنگ

موسڵمانان ئامادەبوون خۆیان ڕێکخست لە موئتەدا و وا سەعاتی سفر نزیکە و بەهێزترین و سەختترین جەنگ لە سیرەتی پێغەمبەری نازدارە ﷺ جەنگ دەستپێکرد، شەپۆلی هێرشی ڕۆم دەستپێکرد، موسڵمانان وەکو شاخ و بەرد و تاوێر وەستانەوە، پیاوانێك بوون جێگر و خۆگربوون، لەمەیداندا وەکو شێر و پڵنگ شەپۆلی ڕۆمیان ئەبڕی، لەو سەردەمەدا کۆمەڵێك پیاون وەستانەتەوە بەرامبەر بەهێزترین سوپای جیهان.

دەنگی هاوار و سەدای (الله اکبر)ی موسڵمانان لە مەیداندا بەرز بوویەوە هاواری تەکبیریان زیرە و ترسی خستبووە دڵی دوژمن، وەکو تیر و ڕمی تیژ بە ناو جەرگەی سوپای ڕۆمدا هاتوچۆیان دەکرد، جەنگێك بوو موسڵمانان هاوشێوەی ئەو جەنگەیان نەدیبوو، تەپوتۆز و خۆڵ لە ئەردەن بەرز بوویەوە چاو چاوی نەدەبینی، زرەی شمشێر و دەنگی تەکبیری موسڵمانان و هاوار و قیژەی کوژراوانی ڕۆم، هەروەها درووشمی (لا اله الا الله) و پاشان شیعری موسڵمانان و حەماسی بەرزیان و هەموو هاندانیان بوو بۆ بەرزکردنەوەی وشەی ( الله) و ناوی ئیسلام، خوێنێکی یەکجار زۆر ڕژا لە جەنگی موئتەدا بەتایبەت هەموو چرکە ساتێکی ڕۆم مردنی بوو، توانای گەرما و تەپوتۆز و هاواری تەکبیری موسڵمانانیان نەبوو.



## یەکەم شەهیدی جەنگی موئتە

ماکوان: لەو جەنگە دا ئەوەندە سەخت بوو هەناسەدانیش کاتی بۆ دانرا بوو، بە هەموو پێوەرێك سەختترین جەنگی سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، یەکەم شەهید لە مەیدانی موئتەدا سەرکردەی یەکەمی سوپاکە بوو، پیاوی ئازا و چاونەترس گەنجی خواناس (زەیدی کوڕی حارس).

ئەو قارەمانە موجاهیدە خۆشەویستەی پێغەمبەری خوا ﷺ رووە و دوژمن شەهید بوو پشتی نەکردە دوژمن لە دوای ژیانێکی پڕ جیهاد لە شاری مەککە و مەدینە و هەمیشە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺدا بوو، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ تەبەنی کرد و کردییە کوڕی خۆی، بەڵام لە دواییدا ئەو یاسایە هەڵوەشایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری خۆشدەویست، یەکەم کەس بوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ چوون بۆ تائیف.

وا لە خاکی موئتە دا یەکەم شەهید سەرکردەی یەکەمی سوپاکەیە لە پێش هەموو سەربازانی موسڵمان خوێنی ڕژایە ناو خاك و ڕاستەوخۆ لە خاکی جیهادەوە بۆ بەهەشتی فیردەوسی بەرز.

ئەم شێرە موجاهیدە لە ساڵی ٦ی کۆچییەوە خۆی ئامادەکردووە بۆ شەهیدی مەفرەزە و سریە لەسەر سریە بۆی ڕێکخرا و سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتنی بەدەست هێنا، تا لە کۆتایی نەك هەر سەرکەوت، بەڵکو براوەی یەکەم شەهیدی برد، ژیانی هەموو هیجرەت و کۆشش و بانگەواز و بەندایەتی و سەرکردایەتی و خۆساغکردنەوە بوو بۆ بۆ ئایینی ئیسلام، هەرچەندە من خۆم چاو پر لە گریانم بۆ ئەم شێرە پیاوە، بەڵام لە ڕاستی پێویستی بە گریان نییە، چونکە بۆ زەید خۆشترین چرکەساتی ژیانییەتی کە شەهید بوو.



# دووەم شەهیدی جەنگی موئتە

ماکوان: لە دوای شەهید بوونی زەیدی کوڕی حارس لەسەر فەرمانی پێغەمبەر ﷺ جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیب، ئاڵاکەی هەڵگرت و دەستیکرد بە جیهاد، ئەم قارەمانە گەنجە هیچ درێخی نەکرد لە جەنگەکەدا وەکوو پڵنگ و ڕەشەبا ڕووە و ڕۆم ڕ [illegible] ئەوانی ئەبڕی، چاونەترس و بەهێز و ئازا و خواناس، تەمەنی ١٥ ساڵ بوو کە پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ حەبەشە، لە ساڵی ٧ی کۆچی گەڕایەوە شاری مەدینە و ئەوکات پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی خەیبەر دابوو، پاشان دانەنیشت و چاوەڕێی خانەنشینی نەکرد بەڵکو هەموو ژیانی لە جیهاد و خەبات و بانگەواز دابوو.

لەم جەنگەدا لە دوای شەهید بوونی زەید خێرا ئاڵاکەی هەڵگرت و نەیهێشت بکەوێتە سەر خاك، ئەو جەنگەی ئەو کردی هاوشێوەی نەبوو، ئاڵاکە بە دەستی ڕاستی بوو بەدەستی چەپ شمشێری پێ بوو، دەستی ڕاستی پەڕی، بە دەستی چەپ ئاڵاکەی بەرزکردەوە، پاشان دەستی چەپی پەڕێندرا بە ددان گرتی پێش ئەوەی شەهید بێت، خێرا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی برای فریای ئاڵاکە کەوت و بەرزی کردەوە ئەویش شەهید بوو، جێگەی (٥٠) شمشێری پێوە بوو یەك شمشێر بەر پشتی نەکەوتبوو.

ئەمەش مانای ئەوەیە ڕووە و دوژمن جەنگاوە پشتی هەرگیز نەکردۆتە دوژمنەکەی، بەهەمان شێوە لە خاکی موئتەوە ڕاستەوخۆ بۆ بەهەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جەعفەرم بینی لە بەهەشتە دەفڕی لەم دار بۆ ئەو دار خوێنی لێدەچۆڕا، خوای گەورە لەجیاتی هەردوو قۆڵی دوو باڵی پێ بەخشی پێی بفڕێت لە بەهەشت دا بۆیە ناونرا بە (ذوالجناحین) واتا خاوەنی دوو باڵەکە.

گرنگە هەموو کەس بزانێت سەرکردە لە سەرەتادا شەهید بوون پێش سەرباز، ئەمەش واتای دڵسۆزی قیادەیە بۆ سوپا و سەربازەکانی، ژیانێکی زۆر لە خەبات و جیهاد پاداشتەکەی لە کۆتاییدا بەهەشتە.



# شەهیدی سێیەم

ماکوان: لە دوای جەعفەر خێرا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەە ئاڵای سوپای موسڵمانانی بەرزکردەوە، ئەم سەرکردە بەڕێزە لە هەموو جەنگەکانی موسڵماناندا بەشدار بوو لەیەك جەنگ دوانەکەوتووە.

عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەەی خەزرەجی ئەنساری، ئاواتە خواز بوو شەهید ببێت و هەرگیز نەگەڕێتەوە بۆ شاری مەدینە، هەر ئەم قیادە گەورە بوو کە سوپاکەی هاندا بۆ جەنگ و جەنگێکی ئەنجامدا بەگوێرەی پێویست بوو، تەنانەت ڕۆمیش پێی سەرسام بوون، تا لە کۆتاییدا ئەویش شەهید بوو لە دوای شەهیدبوونی کەسێکیتر لە سوپاکەی هاوەڵان بەناوی (سابتی کوڕی ئەقرەم) ئاڵاکەی بەرزکردەوە.



# خالیدی کوڕی وەلید سەرکردایەتی سوپا و جەنگ دەکات

ماکوان: لە دوای شەهیدبوونی عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەە، گەنجێك بە ناوی سابتی کوڕی ئەقرەمی بەدری (واتا بەشدار بوو لە جەنگی بەدردا)، هاواری کرد وتی ئەی گرۆی موسڵمانان، کەسێکی شیاو بۆ ئەم سەرکردایەتییە هەڵبژێرن، هەموو سەرقاڵی جەنگ بوون، وتیا: خۆت ئاڵاکە هەڵبگرە ببە سەرکردە!؟

لە وەڵامدا وتی: من کاری وام پی ناکرێت، خالیدی بینی کە هەڵمەت دەبات وەکو شێر بەملاولای خۆی دا سوپای ڕۆمی وەکو پووش و پەڵاش دەخستەوە، چووە لای ئەو سەرکردە موعجیزەیە و ئاڵاکەی دایە دەستی، پێی وت تۆ لەجەنگا شارەزاتری لە من!

خالید تەمەنی لە ناو موسڵمانان دا سێ مانگ بوو وتی: ئاخر تۆ لەمن موستەحەقتری و شیاوتری بەو ئاڵایە، تۆ لە جەنگی بەدریش دا بەشدار بووی!؟

سابت هاواری کرد و وتی: خێرا کۆببنەوە لە خالید با ئاڵاکە هەڵبگرێت کۆمەڵی موسڵمانان لێی کۆبوونەوە ئاڵاکە درایە دەستی خالید.

خالید بۆ پاکردنەوەی (٢٠ ) ساڵی ژیانی لە ناو گومان و کوفردا ئاڵای جیهادی بەرزکردەوە و بووە سەرکردەی سوپای موئتە.

ئەمەش یەکەم جەنگە لە ئیسلامدا سەرکردایەتی دەکات، ئەم جەنگەی خالید کردی هیچ کەس نەیتوانیوە بیکات، لە ڕۆژی موئتە دا (٧) شمشێر لە دەستی دا شکا و ئەوەندەی لە سوپای ڕۆم کوشت هیچ کەس لەدەستیدا خۆی نەدەگرت شمشێرێکی بەکارهێنا کێشی لە سەروو ١٥ کیلۆ گرام بوو، ناسرابوو بە شمشێری (یەمانی)، تەنها ئەم شمشێرە بەدەستییەوە مابوو، بەڵام ئەوەندەی کوشت لە ڕۆم، کە سوپای ڕۆم دەیانبینی بە شمشێرەکەی دەیناسییەوە هەموو لە دەستی هەڵدەهاتن.

ئەوەندە خۆڕاگربوو بە خۆڕاگری ئەو هەموو سوپای موسڵمانان خۆیان ڕاگرت و ئەوەندەی تر هێز و وزە و توانایان بۆ گەڕایەوە، وەکو شێر لە بەردەم تۆفانی ڕۆمان خۆی گرت، ئەم حاڵە و ڕەوشە بەردەوام بوو تا تاریکی سەرەتای شەو، سێ هەزار سەربازی موسڵمانان بەرامبەر (٢٠٠هەزار) لەسوپای ڕۆم.

(چۆن ئەم دینە بە ئێمە گەیشتووە و ئێمەش چۆن بەرخودی لەگەڵ دەکەین؟!

پلانێکی زیرەکانەی خالید بۆ پاشەکشە



ماکوان: لە عادات و جەنگی کۆندا بە شەودا جەنگ نەدەکرا، هەردوو لا بۆ پشوو دەگەڕانەوە ناو سەربازگەکەیان.

بەڵام موسڵمانان بۆ ساتە وەختێکیش پشوویان نەدا، ڕۆم لە شەوەکەیدا لەپشوودا بوون، بەڵام خالید دەستی کرد بە داڕشتنی پلانێکی نوێ بۆ ڕزگارکردنی سوپاکە لە جەنگی ڕۆم، هەڵسا بە دانانی پلانێکی زۆر ناوازە، ئامانجی خالید لەوەدابوو کە بە ڕۆمی نیشان بدات موسڵمانان یارمەتی هێزی نوێیان پێگەیشت، تاکوو ترس و دڵەڕاوکێ بخاتە ناو ڕیزەکانی ڕۆم و هاوپەیمانە عەرەبەکان.

دوێنێ لەگەڵ ٣٠٠٠ سەرباز دا جەنگیان دەکرد، لەو سەربازانە جەهەننەمیان دی، جا ئەگەر هێزی تریان بۆ بێت لە جەهەننەم خراپتر بە ڕۆم دەکەن، بۆ ئەم مەبەستە خالید پلانێکی گرتەبەر لەوانە:

پلانی یەکەم: فەرمانی دا بە بەشێك لە سوپاکەی کە ئەم شەو لە خاکی جەنگدا واتا لەو مەیدانەی کە جەنگی تێدا دەکرێت غار بدەن بۆ ئەوەی زۆرترین تەپ و تۆز درووست بکەن تا ڕۆم وابزانێت سوپای نوێ بۆ موسڵمانان هاتوون و مەیدانەکە دەناسن و بۆ بەیانی خۆیان ئامادە دەکەن.

پلانی دووەم: گۆڕانکاری کرد لە ڕێکخستنی سوپاکەدا، لەلای ڕاست هەمووی هێنایە لای چەپ، بەشی دواوەی سوپای خستە پێشەوە پێشەوەشی خستە دواوە، بۆ ئەوەی ئەگەر بەیانی ڕۆم تەماشای سوپاکەیان کرد وا بزانن سوپای نوێیەو لەوەی دوێنی ناچێت، لەوانەیە ئیتر یەقینیان بۆ درووست بێت کە هاوکارییان بۆ هاتووە.

پلانی سێیەم: لە دوای سوپاکەوە خالید لە دوورەوە کۆمەڵێك لە موسڵمانانی نارد بۆ ئەوەی لە جێگایەکی بەرز واتا گردۆڵەیەك ئاگر بکەنەوە بەدرێژایی ناوچەکە پاشان غوبار و تەپوتۆزی زۆر درووست بکەن، بۆ ئەوەی ڕۆم بە تەواوی دڵنیا بێت کە هێز و هاوکاری زۆر بۆ موسڵمانان هاتووە.

پلانی چوارەم: خالیدی کوڕی وەلید بۆ ڕۆژی دوای بە هێواشی پاشەکشەی بە سوپاکەی کرد بۆ ناو قووڵایی بیابان، بەمەش ڕۆم و هاوپەیمانانی وا تێگەیشتن کە خالید کەمینی بۆ داناون، بۆیە یەك کەس لەو سوپایە نەیوێرا شوێنیان بکەوێت هەموو تەماشای خالیدیان دەکرد کە چۆن پاشەکشە دەکات ئەوانیش تەنها سەیریان دەکرد و وازیان لێهێنا.

پاشەکشەی خالید زۆر ستراتیژی و گرنگ بوو، بە سەرکەوتوویی سوپاکەی گەڕاندەوە بۆ شاری مەدینە.



## ئایا جەنگی موئتە شکست بوو یان سەرکەوتن بۆ موسڵمانان؟

ماکوان: ئەگەر کەسێك بپرسێت ئایا لەجەنگی موئتە موسڵمانان سەرکەوتن؟ یان ڕایان کرد؟!

یان تەنها پاشەکشەیەکی سەرکەوتوو بوو؟!

یان سەرکەوتنێکی بێوێنەی موسڵمانان بوو شکستی تەواوی ڕۆم بوو؟!

بەڵگەم چییە کە سەرکەوتن بوو بۆ موسڵمانان!؟

بەڵگەی یەکەم: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێش ئەوەی سوپای موئتە بگەڕێنەوە خەڵکی مەدینە بینیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەگری، بە خەڵکی ناو مزگەوتەکەی فەرموو ئاڵاکەی دەستی زەید کەوت و شەهید بوو، پاشان کەوتە دەستی جەعفەر و ئەویش شەهید بوو، پاشان کوڕی ئەبو ڕەواحە هەڵیگرت ئەویش شەهید بوو.

پاشان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چاوە موبارەکەکانی فرمێسکی پێدا دەهاتە خوار بۆ هەرسێ خۆشەویستەکەی، ئینجا فەرمووی: ئاڵاکە چووە دەستی شمشیرێك لە شمشێرەکانی خوا، تا خوای گەورە فەتحی پێبەخشین.[81]

لێرەدا ئەگەر تەماشای فەرموودەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکەین نافەرمووێت سەرکەوتن، بەڵکو لەسەرکەووتن گەورەتر باسی دەکات و دەفەرمووێت (فتح) (حتى فتح الله عليهم) چونکە (نصر) واتا سەرکەوتن بچووکترە لە فەتح، فتح زۆر پلەی بەرزترە لە سەرکەوتن، بە دڵنیاییەوە موسڵمانان سەرکەوتوون و نەیان ویستووە شوێن سوپای ڕۆم بکەون، چونکە نهێنی زۆری تێدایە کە خالید بڕیاری پاشەکشەی دا بە واتای ئەوەی ڕۆم لە جەولەی یەکەمدا شکستی خوارد و هەڵهاتن، چۆن دوای بۆمان ڕوون دەبێتەوە، چونکە خالید زۆر واقیعناس بوو دەیزانی سوپای موسڵمانان ناتوانن بڵاو بنەوە بە ناو خاکی ڕۆمدا و سوپاکە کەمە، بەڕاستی ئەوەش فەتحێکی گەورە بوو بۆ موسڵمانان، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ (جوامع الكلم) واتا بە یەك دوو وشە و ڕستەی جوان درووست دەکات، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت فەتح، بۆیە جەنگی موئتە بە فەتح هەژار دەکرێت.

---

[81] ـ (فقد قال صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ / أخذ الراية زيدٌ فأصيب، ثم أخذ جعفر فأصيب، ثم أخذ ابن رواحة فأصيب، حتى أخذ الراية سيف من سيوف الله، حتى فتح الله عليهم) رواه البخاري



بەڵگەی دووەم: پاشان لە دوای گریانەکەی باشتر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووداوەکە بۆ هاوەڵان و ئەهلی مزگەوت ڕوون کردەوە فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئاگادارتان بکەنەوە لە سوپا ڕزگارکەرەکەتان، ئەوان ڕۆیشتن و ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە، زەید شەهید بوو پێغەمبەر ﷺ دوعای لێخۆشبوونی بۆ زەید کرد و خەڵکەکەش بەدوایدا.

پاشان ئاڵاکە جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیب هەڵیگرت زۆر تەنگی هەڵچنی بوو بە ڕۆم لە جەنگەکەدا، بەڵام ئەویش شەهید بوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لێخۆشبوونی بۆ جەعفەر کرد و خەڵکەکەش بەدوای پێغەمبەر دا.

پاشان ئاڵاکە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە هەڵیگرت، ڕاوەستا و خۆڕاگربوو لە جەنگەکەدا تا ئەویش شەهید بوو دوعای بۆ ئەویش کرد و خەڵکەکەش بەهەمان شێوە.

پاشان خالیدی کوڕی وەلید ئاڵاکەی هەڵگرت، هەرچەندە خالید ئەمیر نەبوو، بەڵام خۆی کردە ئەمیر کەوای فەرموو ئینجا دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، فەرمووی: خوای پەروەردگار ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانت خوایە سەری بخە.[٨٢]

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ خالید ناو دەبات بە شمشێر و دوعای بۆ دەکات، هەموو دەزانن هیچ کەس ناتوانێت شمشێری خوا بشکێنێت، خالید لە هیچ جەنگێك شکستی نەهێناوە، چونکە شمشێری خوایە، شمشێری خوا شکست ناهێنێت, پاشان دوعای پێغەمبەری خوا ﷺ گیرایە و حەتمەن سەردەکەوێت.

بەڵگەی سێیەم: تێبینیەکە لەسەر شەهیدانی موسڵمانان لە جەنگی موئتەدا هەرچی بیری لێبکەنەوە ناگەنە ئەنجام، زۆر سەیرە ژمارەکە ئەمەش دڵنیایی ئەدات کە سوپای موسڵمانان بەڕاستی سەرکەوتوون.

ژمارەی شەهیدانی موسڵمان تەنها (١٢کەس) بەهەرسێ ئەمیرەکانەوە، هەموو مێژوونووس و فەرموودەناسەکان کۆکن لەسەر شەهید بوونی (١٢کەس) لە موسڵمانان، بیخەرە پێش چاوی خۆت خالید دەڵێت لەو جەنگە دا (٧ شمشێر) بە دەستییەوە شکاوە، دەبێت چەندی کوشتبێت،

---

[٨٢] ـ (ألا أخبركم عن جيشكم هذا الغازي انهم انطلقوا فلقوا العدوّ، فأصيب زيدٌ شهيداً، فاستغفرُ لهُ النّاس، ثمّ أخذَ اللّواءَ جعفر بن أبي طالب، فشَدّ على القوم حتى قتل شهيداً، أُشْهد له بالشّهادة، فاستغفروا له، ثمّ أخذ اللّواء عبدالله بن رواحة، فأثبت قدميه حتى قتل شهيداً، فاستغْفروا له، ثمّ أخذ اللّواء خالد ابن الوليد، ولم يكن من الأمراءِ هو أمرَ نفسهُ، ثمّ رفَع رسول الله ﷺ اصبعيه فقال: اللّهُمّ هو سيف من سيفك فانصره) أحمد، النسائي، البيهقي، صحيح.



زۆر ئەستەمە سوپای شکست خواردوو تەنها ( ١٢ کەس)ی لێ کوژرا بێت، بۆیە نیشانەی سەرکەوتوو بە دڵنیاییەوە بە سوپاکەوەیە.

بەڵگەی چوارەم: دەستکەوتی موسڵمانان و غەنیمەتیان لەو جەنگەدا ئەوەندە زۆرە کە مەزندەی ئاڵتون و زیو، تەنانەت زین و شمشێر و ئاڵتوونیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابووە شاری مەدینە.

بەمەش گەورەترین بەڵگەی سەرکەوتنی موسڵمانانە کە توانیویانە زۆرێك لە گەورە پیاوانی ڕۆم بکوژن و زینی ئاڵتونی و ئەسپەکانیان بهێنن و یاخود شمشێر و درعی (زرێ) ئاڵتوونی و زیوی ئەوانیان دەستکەوتبوو لەم جەنگەدا، مانای وایە موسڵمانان سەرکەوتووی تەواو بوون، چەند سەرکردەیەکی ڕۆمیان کوشتووە و کەرەستەکانی ئەوانیان گرتووە.

موسڵمانان کە گەڕانەوە چەند کەسێکیان شمشێری ئاڵتوون و زینی ئاڵتوونی و زیوویان پێبوو، دیارە خەڵکی گەورەی ڕۆم لەم جەنگەدا کوژراون، مەبەستم دەرەجەدار و قیاداتی گەورەی ڕۆمە، چونکە ئەوان چەك و کەرەستەی جەنگیان هەبوو ئاڵتوون بووە، هاوەڵان خۆیان باس دەکەن کە عەوفی کوڕی ئەشجەعی دەڵێت موسڵمانم دەبینی ڕۆمی دەکوشت و چەکە ئاڵتونەکەی و زینی ئەسپەکەی لەگەڵ ئەسپەکەی دەبرد.[٨٣]

بەڵگەی پێنجەم: لەو سەردەمەدا ڕاگەیاندن بریتیی بووە لە هۆنراوە، هیچ کەس لە شاعیرەکانی قوڕەیش کە دژی موسڵمانان بوون، هیچ شیعرێك یاخود وتەیەکیان نەبووە لەو بارەوە کە موسڵمانان شکستیان خواردووە، زۆر بێدەنگن لە ئاست ڕووداوەکە هەروەکو خەیبەر.

ئەمەش بەڵگەیەکی گەورەیە کە موسڵمانان سەرکەوتن و فەتحیان بەدەست هێناوە.

بەڵکو بە پێچەوانەوە لە دەمی موسڵمانان بە شانازییەوە باسی ئەو جەنگە دەکەن، شاعیرێکی گەورە وەکو کەعبی کوڕی مالیك و هەروەها شاعیری گەورەی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ حەسانی کوڕی سابت شیعریان بەسەر ئەو جەنگەدا هەڵداوە و باسی فەتح و ئازایەتی و نەبەردی هاوەڵان دەکەن و کە چەندە قارەمان بوون لەو جەنگەدا و سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە.

بەڵگەی شەشەم: لەهەمووی گرنگتر ئەو جەنگە کاریگەری زۆر گەورەی لەسەر عەرەبەکانی ئەو ناوچەیە دانا، لە دوای ئەو جەنگە زۆرێك لە عەرەبەکانی باکووری نیوەدوورگەی عەرەبی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨٣] (عن عوف إبن مالك الأشجعي، إذ يَروى إن احد المسلمين قُتل رومياً يحمل سلاحاً مذهباً و يركب فرساً عليه سرج مذهب) مسلم، أبو داود، احمد.



هەموو نوێنەری خۆیان نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەموو بە گەردەنکەچی هاتن و موسڵمان بوونی خۆیان و هۆزەکانیان ڕاگەیاند، لە سەردەستی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئەگەر لەجەنگی موئتە دا موسڵمانان سەرکەوتوو نەبوونایە هەرگیز ئەو کارەیان ئەنجام نەئەدا، خۆ ئەگەر هێزی موسڵمان لەگەڵ هێزی ڕۆم تەنانەت وەکو یەك بوونایە ئەوە بە دڵنیاییەوە ئەو عەرەبانە موسڵمان نەدەبوون.

بەڵگەی حەفتەم و کۆتایی: لە دوای ئەو جەنگە هەموو غەتەفان هاتن بۆ شاری مەدینە و موسڵمانبوونی خۆیان لە خزمەت پێغەمبەر دا ﷺ ڕاگەیاند، کە بریتیی بوون لە تیرەکانی (بەنو سولەیم، بەنو ئەشجەع، زووبیان، فەزارە و ئەوانی تریش)، هەموو هاتن و بەیعەتیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەم هەموو فەتحە لە دوای جەنگی موئتەدا بوو، کە موسڵمانان لە بەرامبەر ڕۆمدا سەرکەوتن، زیاتر سەرسام بوون بە دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ و هێز و توانای دەوڵەتەکەی.

لە ساڵی ٨ی کۆچی سەرەتای ئەو ساڵە گەورەترین فەتح ڕووی دا بە هۆکاری جەنگی موئتە، جەنگی موئتە هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ شەهید کردنی (حارس کوڕی عومەیری ئەلئەزدی) کە نوێنەری پێغەمبەر ﷺ بوو بۆ لای (والی بوسرا) لە ڕێگادا شورحەبیلی کوڕی عەمری غەسانی شەهیدی کرد، هۆکاری ناردنی سوپاکە بۆ ناوچەی ئەردەن بۆ گەڕانەوەی کەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامی بوو.

ئەوەی کە ماوە کێشەی قوزاعەیە کە لە ناوچەی (سلاسل)ن ١٥ هاوەڵی بۆ نارد پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی فێری ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان بکات بە غەدر ١٤ یانی لێ شەهیدکردن و تەنها یەك کەس لە هاوەڵان دەرچوو گەڕاوە شاری مەدینە و هەموو ڕووداوەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، کە قوزاعە چ خیانەتێکی ئەنجامداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای بۆ سەر ڕۆم و هاوپەیمانی ڕۆم لە عەرەب نارد و تا ڕادەیەك سەرکەوتووبوون لە سوپای موئتەدا ئەگەر چی هەرسێ قیادەی سوپاکە شەهید بوون (زەید و جەعفەر و کوڕی ڕەواحە).

پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای گەڕانەوەی سوپای موئتە خێرا و دەستبەجێ سوپای ئامادە کرد بۆ سەر هۆزی قوزاعە، لە ناوچەی (سەلاسیل) لە نزیك عێراق کە هۆزێکی سەربەخۆ بوون.

ڕێکخستنی سوپای موسڵمانان بۆ جەنگی سەلاسیل



ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بە گەڕانەوەی سوپای موئتە زۆر بە جددی کاری لەسەر هۆزی قوزاعە کرد، سوپای موئتە لە مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی ٨ی کۆچی چوونە موئتە و لە سەرەتای مانگی جەمادی دووەم گەڕانەوە شاری مەدینە ماوەی مانگێکیان پێچوو، هەر لەو مانگەدا لە جەمادی دووەمی ساڵی ٨ی کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی ٣٠٠کەسی ئامادەکرد بۆ سەر قوزاعە، بۆ ناوچەی سەلاسیل ئەم ناوچەیە چەند سەرچاوەی ئاوێکی لێ بوو ناسرابوو بە ناوچەی سەلاسیل هەر بۆیە جەنگ و سوپاکە بەو ناوە ناسراون.

پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لەوە کردەوە کێ بکاتە سەرۆکی ئەو سوپایە، یاخود کێ هەڵبژێرێت بۆ سەرکردایەتی ئەو سوپایە، چونکە ئەرکێکی زۆر قورس و سەختیان هەبوو، هۆزی قوزاعە بە هێز بوون، لەهەمانکاتدا زۆر بوون، بەهەمان شێوە نێوانی هۆزی قوزاعە و مەدینە دوور بوو، بەڵام پێویستە کەسێك بێت لەو ناوچەیە شارەزا بێت، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ (عەمری کوڕی عاس)ی هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتی ئەو سوپایە، لە کاتێکدا تەمەنی عەمری کوڕی عاس کوڕی وائیل تەنها چوار مانگ بوو لە ئیسلام دا.

بەڵام ئەگەر بە چاوی شیکاری و لێوردبوونەوە تەماشای ئەم هەڵبژاردنە بکەین دەبینین حیکمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەڵبژاردنی عەمر.

حیکمەتی سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاس بۆ سوپای (ذات السلاسل)

ماکوان: حیکمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەستنیشانکردنی عەمری کوڕی عاس دەتوانین بە چەند خاڵێك دەستنیشان بکەین، بۆ ئەوی هەڵبژارد و کەسی تری هەڵنەبژارد بۆ ئەو جەنگە.

حیکمەتی یەکەم: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵیبژارد بۆ ئەوەی دڵی ڕازی بکات چونکە کەسایەتییەکی میحوەری بوو لە شاری مەککەی پیرۆزدا، هاتنی بۆ ناو موسڵمانان سەروەتێکی گرنگبوو لە بواری سەربازی و سیاسی دا، پێویستە موسڵمانان لە خۆیبگرن و مافی خۆی بدەنێ لە توانا و هێز و چالاکیدا.

هەر چەندە کەسایەتییەکی گەورە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی( ٥٧) ساڵ بوو گەورە و بە ئەزموون بوو، لە گەورە پیاوانی قوڕەیش و زیرەك و چاوکراوەکانی عەرەب بوو، هەروەها پێویستە ئەو مەقام و توانایەی لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا پارێزراو بێت، تا بەردەوام بێت لەسەر کارکردن و خزمەت بە پڕۆژەی دەوڵەتی ئیسلامی بکات و نابێت پەراوێز بخرێت.

ئەمە بە بۆچوونی من هۆکاری یەکەم بوو، یاخود حیکمەتی یەکەمی پێغەمبەر ﷺ بوو کە ئەو کەسایەتییەی هەڵبژارد، چونکە پێشتر خالیدی کوڕی وەلید بووە



کەسایەتی میحوەر لە ناو سوپای ئیسلام دا و نازناوی شمشێری خودای لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو مەدالیا وەرگرت، لە جەنگی موئتەدا سەرکەوتوو بوو.

ڕاستە خالید کەسێکی بە توانا بوو پێشتریش بەڵام سەرکەوتنەکەی لە جەنگی موئتەدا وای لێکرد کە ڕۆڵی خۆی هەبێت لەناو دەوڵەتی ئیسلامی دا، بە تەواوەتی جیگیر و وابەستە بێت بە ئیسلام و موسڵمانانەوە، چونکە هەموو خەڵکی بە چاوی ئەوە تەماشایان دەکرد کە ئەو هۆکاری سەرکەوتن بوو لە جەنگی موئتە دا.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەمان شێوە دەیویست عەمری کوڕی عاس جێگای پەنجەی خۆی دیاری بکات بۆیە قیادەی سوپایەکی دایە دەست، تا بتوانێت ئەویش سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، تاکو لەناو دەوڵەتی ئیسلامی دا خاوەن جێگا و مەکانەت و مەقام بێت، لە هەمانکاتدا ڕاوەستاو و جێگیر بێت لە سەر دینەکەی.

حیکمەتی دووەم: تەنها ئەوەی پێشووتر باسم کرد بەس نییە، بەڵکو لەوە گرنگتر کە زۆر پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکەین، بریتییە لە قووڵ بیرکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەوی هەڵبژارد، حیکمەتەکە لەوە دایە کە خودی دایکی عەمری کوڕی عاس لە هۆزی قوزاعەیە، لە تیرەی (بلی).

چوونی عەمر بۆ ناو قوزاعە کە دایکی بەشێکە لەوان، ڕەهەندێکی تر ئەبەخشێت بە جەنگەکە، پێدەچیت بتوانێت دڵیان ڕازی بکات بۆ ئیسلام دانوستان و گفتوگۆ ئەنجام بدەن.

یاخود جەنگ ڕوونەدات و هەموو موسڵمان بن، لە کاتێکدا دەبینن سەرۆکی موسڵمانان سەرێکی لە خۆیانە، قبووڵکردنی ئیسلام و موسڵمانبوونیان لای پێغەمبەر ﷺ خۆشەویسترە لە جەنگ و پارە و غەنیمەت.

لە لایەکیترەوە کە عەمری کوڕی عاس ببینن، تووڕە نابن و سەرکێشی بکەن و ململانێ لە نێوانیان درووست نابێت و یاخود لوتبەرزی و ئینکاری چونکە هەموو بەرەبابێکن.

حیکمەتی سێیەم: بەدڵنیاییەوە عەمر چەند جار چوو بوو بۆ ماڵی خاڵوانی بۆ ئەو ناوچەیە بە هۆکاری دایکی، بەدڵنیاییەوە شارەزای ناوچەکە و ڕێگاوبان و دۆڵ و دەشت و شاخیەتی، کەواتە هەڵبژاردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوپەڕی حیکمەتە هەروەها بواری سەربازییە و ستراتیژی گرنگە کە سوپای موسڵمانان بەبێ دەلیل و چاوساغ نازۆن بۆیە سەرکردەکەیان شارەزا و چاو ساغیانە.



# وەسیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عەمر

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ئەوەی بڕیاریدا عەمر بکاتە سەرکردە ئەو کارە سەخت و گەورەیەی پێ سپێرێت، ناردی بە شوێنی دا و کە هات پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆ جلوبەرگی سەربازی و چەکت هەڵگرە و بگەڕێرەوە بۆ لام.

(خذ علیك ثیابك و سلاحك ثم ائتني)

عەمر ڕۆیشت جلوبەرگی جەنگ و چەکی هەڵگرت و دەڵێت کە هاتمەوە پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی دەگرت، بە چاوی موبارەکی تەماشای کردم و پاشان دوای دەستنوێژ فەرمووی: ئەمەوێت بتکەمە سەرکردە و ئەمیری ئەو سوپایە و سەرپەرشتیان بکەیت، خوای گەورە سەلامەتت بکات و دەستکەوتی باشیشت دەستبکەوێت، زۆر حەز دەکەم سەروەت و سامانی باش و چاکت دەستکەوێت

یاخود بە واتایەکیتر تۆ دەڕۆیت و خوای گەورە سەرتدەخات و پارە و غەنیمەتی زۆرت دەستدەکەوێت، پارە و سەروەتت زۆر دەبێت.

( لەبەر ئەوەی چوار لە بەشی خومس بەر سوپا دەکەوێت)

لێرە عەمر بە پێغەمبەری خوای فەرموو ﷺ: ئەی پێغەمبەر ﷺ نەهاتومەتە ناو ئیسلام لە پێناوی پارە و سەروەت و سامان، بەڵکو موسڵمانبووم بە خۆشەویستی ئیسلام، حەز دەکەم لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدابم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عەمر ماڵ و سەروەتی زۆر و چاك بۆ پیاوی چاکە.

(پێغەمبەری خوا ﷺ شاهیدی چاکەی دا بۆ عەمری کوڕی عاس.[٨٤]

سوپا بەڕێکەوت و عەمر ئەمیری ( ٣٠٠ ) سەربازی موهاجیری و ئەنساری بوو بەڵام بەڕاستی قارەمانی ئەم ئیسلامەیە، ئەگەر چی نوێیە لە هەمووی گرنگتر هاوەڵان بە گشتی ڕازیبوون بە

---

[٨٤] ـ عن عمرو بن العاص، يقول: بعث إلي رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال: " خذ عليك ثيابك وسلاحك، ثم ائتني " فأتيته وهو يتوضأ، فصعد في النظر ثم طأطأه، فقال: " إني أريد أن أبعثك على جيش فيسلمك الله ويغنمك، وأرعب لك من المال رغبة صالحة."

قال: فقلت: يا رسول الله، ما أسلمت من أجل المال، ولكني أسلمت رغبة في الإسلام، وأن أكون مع رسول الله صلى الله عليه وسلم.

فقال: " يا عمرو، نعم المال الصالح للرجل الصالح، مسند أحمد، رقم ١٧٧٦٣



سەرکردایەتی ئەم سەرکردە نوێیە لە کاتێکدا تێیدا بوو تەمەنی (٢٠) ساڵ لە جیهاد و خەباتدا لەناو ئەم ئیسلامە خەرج کردبوو، وا ئێستا کەسێك تەمەنی( ٤ ) مانگە لە ناو ئیسلام دا سەرکردایەتییان دەکات، ئەم جەنگەش هاوشێوەی موئتەیە بەڵام بچووکتر بوو، عەمر سەرکەوتنێکی زۆر بێوێنە بەدەست دەهێنێت و بەوپەڕی توانا و هێزەوە دەگەڕێتەوە بۆ شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی خالیدی کوڕی وەلید بەدەستی هێنا ئەم زۆر باشتر بەدەست دەهێنێت.



## وریای و ستراتیژی جەنگی عەمری کوڕی عاس

ماکوان: هەر لە سەرەتاوە وریای و لێزانی و توانای دەرکەوت، هەر لە شاری مەدینەوە بە شەودا سوپاکەی بەڕێکەوت، بڕیاریدا لە ڕۆژ لە کەمیندابن و پشوو بدەن بە شەویشدا ڕێگا دەبڕن بۆ ناوچەی قوزاعە، بە پلانەکەی توانی بگاتە ناوچەی قوزاعە و کەس هەستی پێنەکات، پاشان دەستنیشانی هێزی دوژمنی کرد بە حیکمەت و توانای خۆی، لێرە لەوێ چاوی دانابوو بۆ ئاگاداری ڕێگا و بان و دۆزینەوەی توانای دوژمن، زانی هێزی قوزاعە زۆر زۆرە بۆیە ناچار بوو سوپاکە ڕاوەستێنێت و سوپاکەی لە ناو نەبات و بە پەلە وەڵامی ناردەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شاری مەدینە.

ژمارەی قوزاعە چەندین هێندەی هێزی موسڵمانان بوو، خێرا نامەی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، نەیویست هەرزەکارانە مامەڵە بکات و داوای هاوکاریکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ جوان لێکۆڵینەوەی کرد و وردبوونەوەی بۆ ڕەوشەکە کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر لە (٢٠٠) کەسی بۆنارد بۆ هاوکاری بە سەرکردایەتی (ئەبو عوبێدەی جەراح) ئەمینی ئەم ئوممەتە و لە عەشەرەی موبەشەرەی بەڕێز و مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە لە ناو ئەم ئیسلامەدا، لە ڕاستیدا لە ناو سوپاکەی ئەبو عوبێدەی کوڕی جەراح ئیمامی ئەبو بەکر و عومەری کوڕی خەتاب سەرباز بوون، زۆربەی ئەو سوپایە لە هاوەڵانی سەرەتایی بوون و لە ڕێکخستن و مەفرەزە سەرەتاییەکانی ئیسلام بوون، هەموو ئەوانە ئیمانیان لە ئاستی زۆر بەرزدا بوو، هەموو ئەهلی خێر و چاکە بوون، بۆ هاوکاری عەمری کوڕی عاس ڕۆیشتن.



## ڕای جیاواز لە نێوان عەمر و ئەبو عوبێدە

ماکوان: کاتێك هاوکاری گەیشتە عەمری کوڕی عاس سوپاکەی گەیشتە سەرو (٥٠٠) سەرباز، ئەوەی ئەمیرایەتی و هاوکاری مەدەدەکەی بۆهێنا، ئەبو عوبێدەی جەراح بوو، ئێستا کێ ئەمیرە؟ ئایا عەمری کوڕی عاس هەر ئەمیرە، یاخود ئەبو عوبێدەی جەراح ئەمیرە؟!

کەسیان بۆیان ساغ نەبوو بەتەواوەتی کە کامیان ئەمیرن، لە کاتی نوێژ دا ئەبو عوبێدەی جەراح ویستی ئیمامەتی بکات، چونکە ئەمیر و سەرکردەی سوپا دەبێت ئیمامەتی بکات، ئەبو عوبێدە واهەستی کرد کە ئەو ئەمیرە، چونکە ئەمیری سوپایەکە پڕیەتی لە گەورە پیاوانی هاوەڵان لە موهاجیر و ئەنسار و پیاوانی وەکو ئیمامی ئەبو بەکر و عومەری لە ژێر دەستایە.

بەڵام عەمری کوڕی عاس هەڵسایەوە بە ئەبو عوبێدەی وت: تۆ هاوکاری منی و ناتوانیت ئیمامەتی بکەیت، بەڵکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ناردوویتی بۆ هاوکاری من و تۆ تەنها مەدەدی منی.

بە دڵنیاییەوە عەمر قسەکەی تەواو بوو، هەروەها نوێش بوو لە ناو ئیسلام دا و تەمەنی ئەبو عوبێدە زیاتر بوو نزیکەی (٢٠) ساڵ لە ئەبو عوبێدە گەورەتر بوو، عەمری کوڕی عاس مێژوویەکی دوورودرێژی هەبوو لە بواری سەربازی و سەرکردەیەکی خاوەن بڕیار و وشە و قسەی خۆی بوو، یەکێك بوو لە هەرە ئازا و چاونەترس و ئاقڵەکانی قورەیش و عەرەب بە گشتی، دیارە کە ئیدارەی سوپای یەکەم لەژێر دەستی دایە، کە بریتی بوو لە (٣٠٠) کەس نەگەیشتنی هاوەڵان لەسەر ئیمارەت و ئەمیردارێتی قسەیان نەدەکرد زۆر بەلایانەوە گرنگ نەبوو، بۆیە ئەبو عوبێدەی جەراح بێ دەنگ بوو، بەڵام ئەوانەی لە سوپای هاوکاری بوون بە عەمری کوڕی عاسیان وت، تۆ ئەمیری سوپای خۆتبە و ئەبو عوبێدەش ئەمیری ئەو سوپایە دەبێت.

عەمری کوڕی عاس وتی: نەخێر هەرگیز شتی وا نابێت و سوپا تەنها یەك سەرکردەی هەیە و هەمووتان مەدەد و هاوکارین بۆ من و من ئەمیرتانم، نابێت سوپا دوو ئەمیری هەبێت.

کاتێك ئەم ڕای جیاوازە کەوتە نێوان هاوەڵان و عەمری کوڕی عاس، ئەبو عوبێدە هەڵساوە و فەرمووی: عەمر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەگەر چوویتە لای هاوڕێکەت



هاوکاربن و ڕای جیاوازتان نەبێت، سوێند بەخوا هەرچەندە تۆ بەقسەم نەکەیت بەڵام تۆ چی بڵێیت من بەقسەت دەکەم و گوێڕایەڵیت دەبم، جا لەبەر ئەوە دڵنیابە.[٨٥]

ئەمەش قووڵ تێگەیشتن و دڵسۆزی هاوەڵان و بەتایبەت ئەبو عوبێدە دەردەخات، ئیتر ئەبو عوبێدە گوێڕایەڵی عەمر بوو، عەمری کوڕی عاس ئیمامی ئەبو بەکر و عومەر و ئەبو عوبێدەی لە ژێر دەستدابوو جگە لە سەدانی تر لە موهاجیر و ئەنسار، کەچی سەرکردەکەیان هەموو ٤ مانگە موسڵمان بووە.

ئەمە چ پێشکەوتن و شارستانیەتێك دەیانگاتێ و بەکام و بە چ پێوەری کەین بە هەڵبژاردنی (دۆنالد ترامپ و جۆن بایدن) یان سەرکردە ئیسلامییەکانی ئەمڕۆ! هاوەڵان ئیمارەت و بەرپرسیارێتیان لا گرنگ نەبوو، بەڵکو خودی گەیاندنی پرۆژەکەیان لا گرنگ بوو، بە دڵنیاییەوە ئەمەش وێنەیەکی زۆر جوان و نایابی شارستانییەتی ئیسلامی نیشان ئەدات و بەڵکو نیشانەی یەکبوون و هەروەها هۆکاری گرنگی سەرکەوتنە، ئەگەر هەموو لە پێناوی خوای گەورەدا کاربکەن ئیمارات و سەرکردایەتی و بەرپرسیارێتی تەنها وەسیلەی گەیشتن بێت بۆ قیامەت.

لەگەڵ ئەوەش دا عەمری کوڕی عاس هەڵە نەبوو، بەڵکو ڕاستی کرد و لەسەر حەق بوو، باش پێکای و بەڵگە و حوججەی عەمر بەهێزتر بوو تا ئەبو عوبێدە.

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵیبژاردووە، چونکە پێشتر پێی فەرموو دەبێت خوای گەورە سەری بخات و غەنیمەتی دەست بکەوێت، کەواتە بە تەواوەتی ڕوونە کە ئەمیر و سەرکردەی هەردوو سوپاکەیە، چونکە ئەبو عوبەیدە بەهاوکاری لەسەر داوای عەمر هاتوون، کەواتە دەچنە ژێر ئیدارەی عەمری کوڕی عاس.

ئینجا عەمر ئەقڵێکی گەورەی سەربازییە و خاوەن توانایە، پاشان کە عەمر سەرکردایەتی هەموو سوپاکەی گرتە ئەستۆ، چەندین کاری ستراتیژ و زیرەکانەی لێدەرکەوت، لەوانە:

یەکەم: سوپا کەویستیان ئاگر بکەنەوە لە شەودا لەبەر ساردی و خۆیان گەرم بکەنەوە، داوایان لە عەمری کوڕی عاس کرد کە ئاگر بکەنەوە، ئەویش بە هەموو شێوەیەك ڕەتی کردەوە

---

[٨٥] ـ رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ يستمده . فندب رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ المهاجرين ، فانتدب فيهم أبو بكر وعمر وجماعة ، أمر عليهم أبا عبيدة ، فأمد بهم عمرا ، فلما قدموا عليه ، قال : أنا أميركم ، وأنا أرسلت إلى رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ أستمده بكم . فقال المهاجرون :بل أنت أمير أصحابك ، وأبو عبيدة أمير المهاجرين .قال : إنما أنتم مدد أمددته . فلما رأى ذلك أبو عبيدة ، وكان رجلا حسن الخلق لين الشيمة ، سعى لأمر رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وعهده ، قال : تعلم يا عمرو أن آخر ما عهد إلي رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ أن قال : إذا قدمت على صاحبك فتطاوعا ، وإنك إن عصيتني لأطيعنك . فسلم أبو عبيدة الإمارة لعمرو. سير أعلام النبلاء، جزء ٢٧، ص ١٤٧



و داواکای قبووڵ نەکرد، پاشان هاوەڵان چوونە لای ئیمامی ئەبو بەکر کە ئەو نێوەندگیر بێت و داوایان بۆ بکات کە ئاگر بکەنەوە.

کاتێك کە ئیمامی ئەبو بەکر چووە لای داوای لێکرد زۆر بە ڕەقی وەڵامی داوە و وتی کەس بۆی نییە ئاگر بکاتەوە ئەوەی ئەو کارە بکات دەیخەمە ناو ئاگرەکە!

هەموویانی ئاگادار کردەوە کە ئاگر کردنەوە یاساغە و نابێت بە هیچ شێوەیەك ئاگر بکەنەوە.

ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب خۆی پێنەگیرا و تووڕە بوو، تا ئیمامی ئەبو بەکر هێوری کردەوە و بیری خستەوە، کە ئەو ئەمیرە و دەبێت گوێڕایەڵی بکرێت، ئەو ئەمیری سوپایە دەزانێت چی باشە و چی خراپە، ئەو ئیدارەی سوپاکە دەکات و خاوەنی حیکمەتە.

بە دڵنیاییەوە حیکمەتی تێدابوو کە عەمری کوڕی عاس نەیهێشت ئاگر بکەنەوە، کاتێك گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە هاوەڵان لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵایان لەسەر عەمر تۆمار کرد کە نەیهێشتووە ئاگر بکەنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و لێپرسینەوەی لەگەڵ دا کرد، فەرمووی: عیللەتی نەهێشتنی ئاگر کردنەوە چیبوو ئەی عەمر؟

عەمر لە وڵامدا وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمناخۆش بوو ئاگر بکەنەوە و دوژمن بە ژمارەمان بزانێت و بزانێت سوپاکە کەمن!

پێغەمبەری خوا ﷺی ڕازیکرد بە وتەکەی و دیارە لەسەر حەق بووە، چونکە سوپای موسڵمانان کەم بوو نزیکەی (٥٠٠) سەرباز بوون، هۆزی قوزاعە لە سەرووی سێ هەزار سەربازیان هەبوو بێجگە لە هاووڵاتی ناو هۆزەکەیان.

دووەم: عەمری کوڕی عاس توانی بدات بەسەر هۆزی قوزاعەدا بە پلانێکی سەربازی بەهێز و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و هەموو سوپای قوزاعە لە جەنگ هەڵهاتن، بەڕاستی سەرکەوتنەکەی بێوێنە بوو بە کۆمەڵێك سەربازی کەم توانی هەموو سوپای قوزاعە ڕاو بنێت، سوپاکە خەڵکێکی زۆر زۆر بوون بەو سەرکەوتنە وازی هێنا و شوێن و سوپای قوزاعە نەکەوت، پاشان هەموو هۆزەکەش بەم لاو لادا بڵاو بوونەوە، هاوەڵان حەماسیان هەبوو شوێن سوپای شکست خواردوو بکەون، بەڵام عەمری کوڕی عاس نەیهێشت و بە هەڵهاتنی سوپای دوژمن کۆتایی بە جەنگەکە هێنا و گەڕاوە بۆ شاری مەدینە، بەڵام هاوەڵان بڕوا و قەناعەتیان نەکرد بەوەی کە داوای لێکردن شوێن سوپای قوزاعە نەکەون، هەر چەندە هەموو فەرمانەکەیان قبووڵ کرد و کەس شوێن سوپای شکست خواردووی قوزاعە نەکەوت.



که گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای دووەمیان ئەمە بوو، پێغەمبەر ﷺ لێ پرسینەوەی لەگەڵ کرد و فەرمووی: بۆ شوێنیان نەکەوتی؟!

عەمر وتی: ئەی ڕەسولی خوا ﷺ حەزم نەکرد شوێنیان بکەوم و من هاوکاریان بم بۆ جەنگ، مەبەستی ئەوە بوو مادام ڕێگای هەڵهاتنیان گرتووە کە بزانن ئێمە وازیان لێناهێنین هەر جەنگ دەکەین، ئەوانیش. فێری جەنگ دەبن و ئەوکات بۆ جەنگ کردن لە دژمان ئێمە هاوکاریانین.

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاکەی زۆر بەدڵبوو بەچاکی دانا و هاوڕای بوو ئیقراری پێ کرد.

سێیەم: هەوەها لەو شەوەدا عەمری کوڕی عاس ( ئیحتلام) بوو (کورد دەڵێت: شەیتان سواری ملی بوو لە خەودا) شەوەکەی زۆر سارد بوو، ئاو هەبوو بەڵام خۆی نەشۆرد و تەیەمومی کرد و بۆ بەیانی نوێژی بە ئیمامەت بۆ سوپاکە کرد، هاوەڵان هەموو لایان سەیر بوو کە خۆی نەشۆرد و تەیەمومی کرد لە بوونی ئاوی زۆردا!؟

هەروەها هاوەڵان لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵای سێیەمیان لەسەر تۆمار کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی پرسی، تۆ لاشەت قورس بوو واتا (جنب) بوویت نوێژت بۆ هاوەڵەکانت کرد. [٨٦]

عەمری کوڕی عاس وتی: ئەی ڕەسول الله ﷺ گوێم لە ئێوە بووە کە خوای گەورە لە سوورەتی النساء دەفەرموێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْۚ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴿٢٩﴾﴾ [النساء]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ماڵ و سامانی یەکتر بەناحەق و بەبێ بەرامبەر مەخۆن لەنێوان خۆتاندا، مەگەر بازرگانییەک بێت و لەسەر ڕەزامەندی هەموولایەکتان بێت، خۆتان مەکوژن و (یەکتر بەناحەق مەکوژن، کاتێک بێزاریی و بێتاقەتی ڕووتان تێدەکات یان تووشی زیانێک دەبن)، بەڕاستی خوا میهرەبانە پێتان.

جا لەبەر ئەوە ترسام بە ئاوی سارد خۆم بشۆم، نەخۆش بکەوم یاخود بمرم، ئەو ئیتجتیهادەم کرد.

---

[٨٦] ـ (أصليت بأصحابك وأنت جنب)!؟



پێغەمبەری خوا ﷺ دەستیکرد بە پێکەنین و کارەکەی زۆر بە باش زانی و ئیقراری کرد لەم کارەش.

لەگەڵ ئەوەی هاوەڵان بڕوایان بە کارەکانی نەبوو، بەڵام گوێڕایەڵ بوون تا ئەو کاتەی کارە سەرەکییەکەیان کۆتایی هات، دوایی چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی ویستیان بێترس و قسەی دڵی خۆیان کرد، کام دەوڵەت و هێز دەتوانێت بەم شێوەیە لێپرسینەوە لەگەڵ سەرکردەکانی دا بکات لە کاتێکدا سەرباز سکاڵا بکات و لە هەمان کاتدا سەرکەوتوو بووبێت لە جەنگەکەی دا؟!

ئەم جەنگە گەورەترین کاریگەری لە ناوچەکە دا درووست کرد، بەو هۆکارە زیاتر ناووبانگی دەوڵەتی ئیسلامی بەرز تر بوو، ئیتر بە تەواوەتی جێگای پێی خۆی لەناو نیوەدوورگەی عەرەبی دا بە تەواوەتی سەپاند.

دوای جەنگی (ذات السلاسل) عەمر بووە نوێنەری پێغەمبەر ﷺ

ماکوان: لە دوای سەکەوتن لە جەنگی (ذات السلاسل)دا زیاتر متمانەی لای پێغەمبەری خوا ﷺ پەیدا کرد، بە وریایی و زیرەکی و لێهاتوویی خۆی، هەروەها خاوەن ئەمانەت و سەکردایەتی بەهێز بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ وڵاتی عومان کە لەو سەردەمە دەوڵەتی موشریك بوو، هەر وەکو پێشتر ئاماژەمان پێ داوە دوو برا فەرمانڕەواییان دەکرد بە ناوی (جەیفەر و عەبد) ئەم دوو برایە خاکێکی زۆریان لەبەردەستابوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە نوێنەراتی خۆی ناردی بۆ ئەو دەوڵەتە کە بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام و بێنە ژێر ڕکێف و سایەی دەوڵەتی ئیسلامی.

عەمری کوڕی عاس هەڵسا بە کارەکە و چووە وڵاتەکە و توانی بە حیکمەت و زیرەکی و لێهاتوویی خۆی، جەیفەر و عەبد موسڵمان بکات و گەلی عومانیش هەموو موسڵمان بوون، ئەم دەوڵەتە هاتە سەر هێزی موسڵمانان، عەمری کوڕی عاس بووە نوێنەری دەوڵەتی ئیسلامی و هەموو زەکاتی ساڵانەی دەناردەوە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی لە شاری مەدینە، هەڵبەت لە دوای ئیستقامەی هەردوو براکە بۆ ئیسلام، پاشان عەمری کوڕی عاس بووە عاملی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو دەوڵەتە دا.

ئیتر ماوەیەکی زۆر لەسەر شانۆی سیاسی و سەربازی ناوچەکە ون دەبێت لە وڵاتی عوماندا دەمێنێتەوە تا وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هەر لەو وڵاتە حاکم دەبێت.



پێغەمبەری خوا صَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ تا لە ژیان دا بوو ناردی کردیە والی لەو وڵاتەدا، چونکە متمانەی تەواوی پێ هەبوو، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ کار نادات بەکەسێك کە لە دین و ئەمانەت و دەستپاکی دڵنیا نەبێت، بۆیە عەمری کوڕی عاس خاوەنی ئەو هەموو سیفات و ئاکار و ڕەوشت بەرزە و چاك و جوانە بوو.



## سەرەتای دەستپێکی فەتحی مەککە

ماکوان: ئەگەر بە چاوی چاودێرێکی سیاسی و شیکاری سەربازی و هەڵوێستەیەك بکەیت لەسەر ڕەوشی ئیسلامی لە سیرەی پێغەمبەر دا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەبینین لە دوای مانگی جەمادی دووەم لە ساڵی ٨ی کۆچی و سەرەتای مانگی ڕەجەب هەر لەو ساڵەدا دەوڵەتی ئیسلامی لە ناوچەکەدا باش جێگیر بوو، خاوەنی سەروەری و داستان لەسەر داستان تۆماری دەکرد و ناوبانگی قورس و سەنگینی پەیدا کردبوو، خاوەنی هێز و دەسەڵاتی بەهێز بوو، خاوەنی هەیبەت و عەزەمەت بوو، ترسی زۆری لە دڵی دوژمنەکانی دا درووست کردبوو، پەلوپۆی بە تەواوەتی بەناو نیوەدوورگەی عەرەبی دا بڵاو کردبوو.

ئەوەی لەماوەی ڕابردوودا هەموو ڕووداوەکانی جیاوازترە لەوەی کە لەمەولا ڕوو ئەدات، چونکە قۆناغێکی نوێ دێتە ئاراوە کە ڕووداوەکان لە سیرەتی پێغەمبەر دا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ جیاوازتر خوێندنەوەی بۆ دەکرێت، ئەویش سەرەتای فەتحی مەککەیە.

کاتێك باس لە فەتحی مەککە دەکەیت دەبێت هەموو لایەك ئەوە باش بزانێت ئەم فەتحە قۆناغێکی جیاکەرەوەیە لە مێژووی موسڵماندا، بەڵکو دەتوانم بڵێم لە مێژووی سەر زەویدا، چونکە هەرکاتێك باسی فەتح دەکەیت خێرا هەموومان بیرمان دەچێت بۆ فەتحی مەککە؟ ئەگەری موسڵمانان خاوەنی فەتحی زۆرن پێش فەتحی مەککەی پیرۆز، نموونەی فەتحی خەیبەر و موئتە و جەنگەکانی ناوچەکانی تر بە گشتی. ئەم فەتحە بۆیە گەورەیە چونکە لە پێش دا قۆناغێك بڕیاری داوە و لەمەودوا ئیتر قۆناغێکی ترە و جیاوازترە زۆر لە قۆناغەکانی تر لە ڕووی بەندایەتی و خواناسی و عیبادەت و پاشان سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سەربازی.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: لە دوای فەتحی مەککە هیجرەت نییە.[٨٧]

خوای گەورە لە سوورەتی الحدید دا دەفەرمووێت:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨٧] ـ (لا هجرة بعد الفتح).

﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾﴾ [الحديد]

واته: جا ئیتر ئەوەچیتانە و بۆچی ماڵ و سامانتان نابەخشیین لەڕێگەی خوا دا، خۆ هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ خوا دەمێنێتەوە، بێگومان چوون یەک نین ئەوانەتان کەپێش ڕزگاری مەککە، یاخود پێش سەرکەوتن ، ماڵ و سامانی بەخشیوە و جەنگاوە، چونکە ئەوانە پلە و پایەیان زۆر بەرزترە لەوانەی کەدوای ڕزگاری مەککە و بەدەست هێنانی سەرکەوتن ماڵ و سامانیان بەخشیوە و جەنگاون، بەهەردوولاشیان خوا بەڵێنی بەهەشتی بەخشیووە، بێگومان ئەو خوایە ئاگایە بەکار و کردەوەتان

بەڕاستی دوای فەتح شتێك بوو و پێش فەتحیش شتێکی تر، بەخشین جیاواز تر بوو لە دوای فەتحی مەککە. هەروەها جیهاد و بانگەواز و تەنانەت موسڵمانبوونیش، فەتحی مەککە واتا تەمکین دینیی خوای گەورە، واتا لە سەرکەوتن و سیاسەت و سەروەری زۆر گەورەتره تەمکین.

تەمکین لە زمانی کوردی دا واتا جێنشین کردن.






## تەمکین چییە لە سیرەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

ماکوان: ئەگەر بە وردی لە وێنەکەی سەرەوە بڕوانین دەبینین هەموو قۆناغەکان تا ڕادەیەک تێدا ڕوون و ئاشکرایە، ئەو وێنەیە سوونەتی خوای گەورە نیشان ئەدات بۆ ژیانی پێغەمبەر و سوونەتی خوای گەورە لە سیرەدا هەموو کۆبووەتەوە، ئەوەی دەیەوێت چاوی لێبکات و سەربکەوێت و بگاتە قۆناغی تەمکین دەبێت بەشێوازی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دا بڕوات، لێرەدا لە باسی فەتحی مەککەدا ئەو سوونەتانەی خوای گەورەت بەباشی بۆ دەردەکەوێت، لە چەند خاڵێکدا کورتی دەکەمەوە و لێی دەدوێم.

یەکەم سوونەتی خوایی: خوای پەروەردگار بەگوێرەی ئەقڵی مرۆڤ کارناکات و بە پەلەکردنی مرۆڤ زاتی بەرزی پەلە ناکات، چونکە ئەقڵی مرۆڤ زۆر کورتە و بێتوانا و سنووردارە، لەبەر ئەوەی پێوەر ناکرێت بەتوانا و زانستی خوا، کەواتە پێش ٢١ ساڵ لەمەوبەر خودی پێغەمبەری خوا ڕەوانە کرا بۆ شاری مەککە، تا ئەم ساتەوەختە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی ئامادە کردووە بۆ فەتحی مەککەی پیرۆز، لەو شارەدا خەڵك (لات و عوزا و مەنات و هوبەل...هتد) دەپەرستێت، خەڵکی بەگشتی هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار ئەدەن.

زۆرێک لە خەڵکی ئاواتەخواز بوون بەوەی کە فەتحی مەککە زووتر بوایە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەوڵەتی لە شاری مەککە دامەزراندایە و هەر لەسەرەتاوە بێ هیچ هۆکارێک خوای گەورە هەموو خەڵکی مەککەی موسڵمان بکردایە، ئیتر خەڵکی زۆر بەئاسانی موسڵمان دەبوون، بەڵام هەرگیز شتی وا ڕوونادات، چونکە ئەوە دژی سوونەتی خوایە سونەتی خواش یاسا و ڕێسایە هەرگیز گۆڕانکاری بەسەردا نایە، خوای گەورە لە سوورەتی فاطر دا دەفەرمووێت:

﴿ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾﴾ [فاطر]

چونکە خۆیان بەزل و گەورە دەزانی لە زەویداو پیلانی شەڕو تاوانیان کێشا، بەمەرجێك پیلانی شەڕو تاوان تەنها بەسەر ئەوانەدا دەشکێتەوە کە نەخشەی بۆ دەکێشن، مەگەر ئەمانە بەدژایەتی ئیسلام تەنها چاوەڕێی ئەو کارەساتانە بکەن کە بەسەر گەلانی پێش ئەماندا هاتووە، (کاتێ بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێناوە، لەناوبران) ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لە یاسا و بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاسا و بەرنامەکانی خوا لە نەخشەی خۆیان لابدەن. (کە بەشێکی ڕیسواکردنی پیلانگێڕانە).



خوای گەورە بەتوانایە و بەهێزە لە کونفەیەکونێکدا هەموو موسڵمان دەکات و بەڵام خوای گەورە هەڵبژاردەی داوەتە مرۆڤەکان، لەبەر ئەوەی یان بەهەشت هەڵدەبژێرن یان دۆزەخ ئەم هەڵبژاردەیە وای کردووە تۆ ئازاد بیت، کردار و کردەوەت سەربەخۆت بێت، خوای گەورە لەبەر خاتری بیرکردنەوەی خەڵکی سادە و ساکار و سەرەتایی یاسا و ڕێساکانی خۆی تێکنادات، ئاسان بوو فەتحی مەککە هەر لەسەرەتاوە، یان دوای ساڵێک یاخود دوو ساڵ نەهاتنی پێغەمبەر، بەڵام ۲۱ساڵی پێچوو ئەمەش مانای وایە خوای گەورە پەلەی نییە وەکو مرۆڤەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەککە دوعای لە بێباوەڕان کرد خوای گەورە دوای ۱۳ ساڵ دوعاکەی گیرا کرد.

دووەم سوننەتی خوایی: سەرکەوتن و گۆڕانکاری و تەمکین لە جێنشینکردن کاتێک دێت بە خەیاڵی مرۆڤەکاندا نەهاتووە و هەرگیز حیسابیان بۆ نەکردووە.

بۆ نموونە ئەگەر بیر بکەینەوە لە چۆنیەتی فەتحی مەککە لەوانەیە چەندین سیناریۆ بەمێشکماندا بێت، بەڵام هەر سیناریۆیەک دەیان ئەرێنی لێ دەبێتەوە، بۆ نموونە ۱۰ خاڵ لە نێوان موسڵمانان و قورەیشدا هەیە بۆ ئاگر بەست کە لە ئێستادا لە سوودی قورەیشە، چونکە موسڵمانان بەهێزن ئەویش زۆر لاوازە، بەڵام موسڵمانان و بەگشتی پەیمان شکێن نین بەتایبەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە خاوەنی پەیمانی خۆیەتی.

لەوانەیە لە دوای ۱۰ ساڵی تر موسڵمانان بتوانن فەتحی شاری مەککە بکەن گریمانە زۆرە لەم بارەیەوە، هەرچی گریمانە دابنێن ئەستەمە بگەینە ئەو ئەنجامەی خوای گەورە بۆی داناویت و ویستی لەسەریەتی.

سبحان الله چەند غەریب و سەرسووڕهێنەرە! نەک قورەیش و کافر هەرگیز موسڵمانان نەک بەخەیاڵیاندا نەهاتووە بەڵکو بە چرکەساتیکیش دڵیان بۆ ئەو کارە لێی نەداوە ئەی چی ڕوویدا!

ڕووداوەکە بەهۆکاری دوو هۆز و عەشیرەتی عەرەب کە هەردووکیان موشریک بوون هێرشیان بردە سەریەکتری و فەتحی مەککە لەوە سەرچاوەی گرت.

لەوانەیە یەکێک بپرسێت جا ئەمە پەیوەندی چییە بە فەتحی مەککەوە؟!

لەوەڵامدا دەتانگەڕێنمەوە بۆ سوڵحی حودەیبییە کە لە بەندی سێیەمدا هاتووە کێ دەیەوێت بڕواتە ناو هاوپەیمانی قورەیش ئازادە، یاخود هاوپەیمانی موسڵمان هەر ئازادە، هۆزی بەنی بەکر چوونە ناو هاوپەیمانی قورەیش و هۆزی خوزاعە چوونە هاوپەیمانی موسڵمانان لە کاتێکدا خوزاعە هۆزێکی موشریک و کافر بوون.



لێرەدا جێگای خۆیەتی باسی ئەوە بکەین، کە لەو کاتەدا هاتنی خوزاعە و بەنی بەکر بۆ هاوپەیمانی هیچ لایەک ئەرزشی (نرخ) بۆ دانەنا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەندە نووسرا و ئەو پەیماننامەیە ئەو خاڵەی لەخۆ گرت کە هیچ پەیوەندی بە موسڵمانانەوە یان قورەیشەوە نەبوو، کەچی هۆکاری فەتح لە ڕێگای ئەو دوو عەشیرەتەوەیە.



# ڕووداوی نێوان خوزاعە و بەنی بەکر

ماکوان: هاتنە ناو هاوپەیمانی پێغەمبەری خوا ﷺ هۆزی خوزاعە پێویستی بە هەڵوێستەیەک هەیە، ئەوە چییە وای کرد لەوکارانەدا وابکات پاڵ بە خوزاعە بنێ بۆ هاتنە ناو ئەو هاوپەیمانییە.

خوزاعە هۆزێکی موشریک بوون، بەڵام پێشتر پەیوەندییەکی زۆر باش هەبوو لە نێوان خوزاعە و بەنی هاشم عەشیرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر نزیکتر بوو کە خوزاعە بڕواتە ناو هاوپەیمانی بەنی هاشمی موشریک لە شاری مەککەدا لەبەر ئەوەی هاودینن و هەردوولا موشریکن، چی وای لە خوزاعە کرد عەشیرەتی بەنی هاشمی موشریک واز لێبهێنێت و بڕوات بۆ لای بەنی هاشمی موسڵمان؟! هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ بیر لە عەشیرەت ناکاتەوە، بەڵام لە چاوی خوزاعەوە ئەو قسەیە دەکەم، خۆی لە ڕاستیدا کارێکی زۆر سەیرە خوزاعە چووە ئەو هاوپەیمانیەتییە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پێشینەی هەردوو هۆزەکە خوزاعە و بەنی بەکر، دەبینین ڕێک پێچەوانەی ڕەوش و واقیعەکەیە، ئەم دوو هۆزە دوژمنایەتی زۆر گەورە لە نێوانیاندایە و هەمیشە خەریکی تۆڵە سەندنەوە بوون لە یەکتری، لە کاتێکدا بەنی بەکر چووە ناو هاوپەیمانی قوڕەیش، لەدژی خوزاعە بوو، لە کاتێکدا پەیوەندی بەنی بەکر لەوپەڕی خراپیدا بوو، بە بەڵگەی ئەوەی کاتێک قوڕەیش هات بۆ جەنگی بەدر ترسان لەوەی بەنی بەکر شاری مەککە داگیر بکات، تا شەیتان خودی ئیبلیس خۆی لێدەرخستن و وتی من دەبمە هاوکارتان ناهێڵم بەنی بەکر ئەو کارە ئەنجام بدات، خۆی لێخستنە سەر شێوەی (سوراقەی کوڕی مالیک) وتی من دەبمە باری کینانە، مەبەستی بەنی بەکر بوو، کینانە هەموو هۆزی بەکر دەگرێتەوە.

لەبەر ئەوە مێژووی هاوپەیمانییەکە زۆر ئاڵۆز بوو، لەهەمان کاتدا هاوپەیمانییەکە ڕوویدا، بەم شێوەیەی ویستی خوای لەسەر بوو.

هەموو ئەو باسەم بۆ ئەوە بوو، کە دیسان جەنگ دەکەوێتە نێوان هەردوو هۆزەکە و زۆر لە یەکتری دەکوژن لەبەنی بەکر و بەنی خوزاعە، بەنی بکر وازناهێنێت دیسان بەنی بەکر کەسێکی کوشتەوە لە خوزاعە، لەگەڵ ئەوەشدا قوڕەیش بە چەک هاوکاری بەنی بکری کرد بۆ کوشتنی خوزاعە، ئەمەش بە ئاشکرا سەرپێچی قوڕەیش بوو لە سوڵح و پەیماننامەکەی، بەنی بەکر هێرشی کردە سەر خوزاعە زۆری لە منداڵ و پیاو و ژنی خوزاعەی کوشت، ئەم هێرشەی بەنی بەکر واتا هێرش کردنە سەر دەوڵەتی ئیسلامی.

خیانەتی قوڕەش لە پەیماننامەی حودەیبییە بە هاوکاریکردنی بەنی بەکر



ماکوان: ئەگەر ئەم ڕووداوە هێرش کردنەی بەنی بەکر کە کردییە سەر خوزاعە کە پێش ڕووداوی سوڵحی حودەیبییە بوایە هیچ بەرژەوەندییەکی بۆ موسڵمانان نەبوو، چونکە وەکو هەموو هۆزێکی موشریک هێرشی دەکردە سەر هۆزێکی موشریکێکی تر.

خۆ ئەگەر بهاتایە و قوڕەیش ڕێگری بکردایە، بەلای کەمەوە ناوەند گیربوایە هەرگیز فەتح ڕووی نەئەدا، ئەو کات هەر چۆن بوو دەتوانرا دانوستان و گفتوگۆ بکرێت.

بەڵام ئەوەی کە ڕوویدا زۆر جیاواز بوو، قوڕەیش بەهەموو شێوەیەک هاوکاری بەنی بەکر بوو بۆ کوشتن و تاڵان کردنی هۆزی خوزاعە، هاوکارییەکی زۆر سەرشێتانە کە بەچەک و هەموو کەرەستەیەکی سەربازی هاوکاری بەنی بەکر بوو.

خۆ ئەگەر بهاتایە پێشوەخت قوڕەیش ئەم کارەی بخرایەتە بەردەم هەزار جار ڕەتی دەکردەوە، چونکە هیچ کات هاوکار نەبووە بۆ بەنی بەکر، کارێکە زۆر غەریبە و وەکو ئەوەی قوڕەیش هانی موسڵمانان بدات بۆ فەتحی مەککەی پیرۆز، هەرخۆیان بە ویستی خۆیان بزماریان دا لە تابووتی خۆیان.

لە کۆتاییدا هەموو تەفسیری خوای گەورەیە و خوای گەورە وای دەبینێت و ویستی وایە کە ئەوە ڕووبدات خوای گەورە لە سوورەتی الطارق دا دەفەرمووێت:

﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا﴿١٦﴾﴾ [الطارق]

واتە: بەڕاستی ئەوانە سەرگەرمی پیلانن و خەریکی داونانەوەن (بۆ ئیمانداران).

(بەڵام خوا دەفەرمووێت): منیش پلان و نەخشەی خۆم دەخەمەکار.

هەروەکو وتمان بەنی بەکر زۆری لە خوزاعە کوشت، خوزاعە ناچار چووە ناو شاری مەککە و چوونە ناو حەرەمی مەککی، چونکە ماڵ و جێگا و نیشتەجێیان نزیک لەناو حەرەمی مەککەوە واتە کەعبە بوو، منداڵ و ژن و پیاویان چوونە ناو حەرەمی کەعبە، چونکە هەرکەس بڕواتە ئەو جێگایە دەبێت پارێزراو بێت.

بەڵام لەسەرکێشییەکی تردا بەنی بەکر چووە ناو حەوشەی کەعبە و لەوێدا منداڵ و ژن و پیاوی خوزاعەی دەکوشت، قوڕەیش تەماشا دەکات و لە هەمانکاتدا هاوکاری بەنی بەکرە، خۆ ئەگەر لە دەرەوەی شاری مەککەدا بوایە دەکرا موسڵمانان تەنها هێرش بەرنە سەر هێزی بەنی بەکر، بەڵام لەناو شاری مەککە و حەرەمی کەعبەدا کوشتاری خوزاعەیان دەکرد، لە کاتێکدا دەبوو قوڕەیش بەهەموو پێوەرێک ڕێگری بکردایە، چونکە پاراستنی حاجی و عومرەوانەکان بەگشتی لەسەر شانی ئەوان بوو، سەرکەشی و سەرپێچی قوڕەیش بەوە نەوەستا هاوکاری چەکی کرد بۆ بەنی بەکر بۆ کوشتنیان لەناو کەعبەدا.



کەواتە مامەڵەیەکی زۆر منداڵانە و ناتەندرووست بوو کە قورەیش ئەنجامیدا و جێگای سەرنجە بەگشتی، بەڵام لای موشریک و بێدین و خوانەناسان خیانەت شتێکی ئاساییە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەفا بوو بەرامبەر بەهەموو بەندەکانی سوڵحی حودەیبییە، ئەگەر چی بەشێکی زۆر قورس بوو بۆ موسڵمانان، وەکو گەڕاندنەوەی ئەبو جەندەل و ئەبو بەسیر، لەکاتێکدا ئەبو بەسیر هاتە شاری مەدینە کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەن بڕیار و وەفا بوو ڕادەستی قورەیشی کردەوە.

بەڵام قورەیش و بەنی بەکر زۆر سەر شێتانە پەیمان و سوڵحی حودەیبییەیان شکست پێهێنا، لە هەمووی سەیرتر و کێشەدارتر ئەوەبوو کە بەنی بەکر لەکاتی کوشتنی خەڵکی خوزاعە گاڵتە و گەپ و یاری بە یاساکانی ناو کەعبە دەکرد و تانەی لێ ئەدا.

ئەوەی کەلای سوپای بەنی بەکر ڕوویدا و خۆشیان لایان سەیر بوو سەرۆکەکەیان (نۆفلی کوڕی معاوییە) دەیوت: دەست لە منداڵ و پیر و جوان مەپارێزن ئەگەر دەستیان بە کەعبەوە بوو، تا ژن و پیاوانی خوزاعە هاواریان دەکرد ئەی نۆفل خواکەت خواکەت؟!

واتا کوا ڕێز و حورمەت و ڕێزی یاسای خواکەت (لات، عوزا و هوبەل) لە وەڵامدا نۆفل وتی ئەمڕۆ من خوام نییە، هاواری دەکرد هۆزی بەنی بەکر تۆڵە بکەنەوە لەناو حەرەمدا، ئێوە بەدرێژایی ڕۆژ لەناو حەرەمدا دزیتان دەکرد ئەمڕۆ سەرەی تۆڵەکردنەوەیە.

ئەم قسە فاسدە (خراپ)ی هەر بۆ ئەوە بوو کە هانیان بدات بۆ کوشتنی خەڵکی خوزاعە و قورەیش تەماشا دەکات.

ئەمەش بەهەموو پێوەرێک پێشێلکردنی یاساکانە و کوشتنی خوزاعە لە ناو شاری مەککە و حەرەمی کەعبەدا، لەهەمانکاتدا پێشێلکردنی شکاندنی بەندی سێی صوڵحی حودەیبییە و هێرش کردنە سەر وڵاتی ئیسلامی و شکاندنی شکۆی دەوڵەتی پێغەمبەری خوا ﷺ سەروەرییەکەیەتی.



## خوزاعە داوای کۆمەک لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن

ماکوان: دوای ئەوەی کە ڕوویدا خێرا خوزاعە چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای هاوکاری و بەدەمەوە چوونیان کرد، لەوانەی کە یەکەم جار هاتن (عەمری کوڕی سالمی خوزاعی) بوو کە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بە چەند پارچە شیعرێک دەستی پێکرد تا کارەسات و ڕەوشەکە بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕوون بکاتەوە و باسی کوشتار وحاڵ و گوزەرانیانی بۆ بکات.

يَا رَبُّ إِنِّي نَاشَدَ مُحَمَّدًا ... حِلْفِ أَبِينَا وَأَبِيهِ اَلْأَ تَلْدَا

قَدْ كُنْتُمْ وَلَدًا وَكُنَّا وَالِدَا ... ثُمَّتْ أَسْلَمْنَا فَلَمْ نَنْزِعْ يَدًا

فَانْصُرْ هُدَاكَ اَللَّهَ نَصْرًا أَعْتَدَا ... وَادعُ عِبَادِ اَللَّهِ يَأْتُوا مُدَدًا

فِيهِمْ رَسُولُ اَللَّهِ قَدْ تَجَرُّدًا ... إِنَّ سِيمْ خَسْفًا وَجْهَهُ تَرَ بَدَا

فِي فَيْلَقٍ كَالْبَحْرِ يَجْرِي مَزْبَدَا ... إِنَّ قُرَيْشًا أَخْلَفُوكَ اَلْمُوعْدَا

وَنَقَضُوا مِيثَاقُكَ اَلْمِؤْكْدَا ... وَجَعَلُوا لِي فِي كَدَاءِ رَصْدًا

وَزَعَمُوا أَنَّ لَسْتَ تَدْعُوا أَحَدًا ... وَهْمَ أَذَلَّ وَأَقَلَّ عَدَدًا

هُمْ بَيَّتُونَا بَالْوتِيرْ هَجْدَا ... وَقَتَلُونَا رُكَّعًا وَسُجَّدًا

ئەم چەند دێڕە شیعرەی (عەمری کوڕی سالم) هەموو وێنای ئەو کوشتن و بڕین وخراپەکارییەی قوڕەیش و بەنی بەکری نیشان ئەدا کە چیان کردووە لەناو شاری مەککە و پەیمان و وەعد وەفایان نەبوو بەرامبەر بە پەیماننامەکە، کوژراوەکانی خوزاعە بریتی بوون لە موسڵمان و لە موشریک.

وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عەمری کوڕی سالم لە ئەنجامی ئەو چەند دێڕە شیعرەدا ڕاستەوخۆ فەرمووی: بەدڵنیاییەوە بەدەمتانەوە دێم و سەرتان دەخەم (نصرت یاعمرو إبن سالم)

ڕاستە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنیشانی چۆنیەتی نوسرەت و بەدەمەوەچوون و سەرکەوتنیانی نەکرد، بەڵام بێدوودڵی و بڕیارێکی حازمانە خێرا فەرمووی سەرتاندەخەم و بەدەمتانەوە دێم.



چونکە پەیمان لە نێوانیاندا هەیە، بێجگە لەوەی موسڵمان یاخود موشرکین بەڵکو لێرەدا گفت و پەیماننامە ڕۆڵی خۆی دەبینێت، زۆرینەی هۆزی خوزاعە موشریک بوون، ئەو پەیماننامەیە وا دەکات کە لە دەوڵەتی ئیسلامی بەرگریان لێبکات، ئەگەر هێرش کرایە سەر هەرلایەکیان.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەجددی وەریگرت و دەستیکرد بە کارکردن لەسەری، ئەم هەوڵە جددییەی پێغەمبەر زیاتر هاوپەیمانی تری بۆ زیاد کرد، چونکە بەڕاستی بەرگری لە هاوپەیمانەکانی دەکات، ئەگەر چی باجەکەش لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی زۆر بێت، بەڵام پاراستنی گفت و وەفا توخمێکی سەرەکی ئەم دینەیە.

لەدوای هاتنی عەمری کوڕی سالم پاشان سەرۆکی خوزاعە (بودەیلی کوڕی وەرقا) هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و بۆ هاوکاری هۆزەکەی، بودەیل ئەو کەسەبوو کە پێشتر قوڕەیش بۆ نێوەندگیری لە پەیمانی حودەیبییەدا ناردیان بۆلای پێغەمبەر ﷺ بەڵام ئێستا وا خۆی هاتووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵا لە قوڕەیش دەکات کارێکی سەیرە! تا ئەو کاتەش هەر موسڵمان نەببوو، هاوڕێی زۆر نزیکی ئەبو سوفیان بوو.

هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و نەچووە لای ئەبو سوفیان، دەیزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دادپەروەر و کەرامەت و ڕەد ئیعتباری بۆ دەگەڕێنێتەوە، خۆ ئەگەر بڕۆشتایەتە لای ئەبو سوفیان، هەر دەیتوانی خوێنی کوژراوەکانی بۆ وەرگرێت، بەڵام سکاڵا لای یەکێک کە ماف لای پارێزراوە مافی کەس بەزایە ناڕوات.

بەڵام هەرگیز بودەیلی بیری لەوە نەکردەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککە دەکات بەڵکو واهەستی کرد سوپای بداتێ تا تۆڵەی خۆی پێ بکاتەوە، نەیزانی خۆی هەرهاتنی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەنجەتێکی زۆر گەورەیە بۆ فەتحی مەککە، لەبەر ئەوەی خۆی موشریکە هەرگیز حەزی بەوە نییە کە پێغەمبەر ﷺ فەتحی مەککە بکات.

سبحان الله کەس نازانێت سەرکەوتن و تەمکین لە کوێوە دەدرێت، وا بەچاوی خۆمان دەبینین و هەستی پێ دەکەین، ئەوەی موسڵمانان و تەنانەت کافرەکانیش بیریان لێ نەکردبووەوە و هەر بەخەیاڵیشیاندا نەهاتبوو کەچی سەرکەوتن و فەتح لەوێ سەرچاوەی گرتووە.

ئەم سوننەتە بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت سەرکەوتن و تەمکین لە جێگایەکەوە دێت کە هەرگیز موسڵمان بەخەیاڵیاندا نەهاتووە.



سێیەم سوننەتی خوایی: سەرکەوتن لە جێگایەکەوە دێت کە موسڵمانان ڕقیان لێیەتی یاخود حەزی پێناکەن.

زۆر سەیرە هەموو جارێک دووبارە دەبێتەوە بە ئەندازەیەک سەرکەوتن نایەت تەنها لەو جێگایەوە نەبێت کە موسڵمانان هەستی پێ ناکەن و پێیان خۆش نییە و ڕقیان لێ دەبێتەوە.

بۆ نموونە تالووت ڕەحمەتی خوای لێبێت ئەوانەی کە لەگەڵیان بوون لە ئیمانداران، زۆر پێیان ناخۆش بوو ڕووبەڕوو بوونەوەی جالووت، بەڵام خوای گەورە سەرکەوتنی ئەوانی لە ڕووبەڕووبوونەوەیاندا دانابوو لەگەڵ جالووت، یاخود سەرکەوتنی بەدر ئەو جەنگە زۆرێک لە موسڵمانان ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیان پێخۆش نەبوو، کەچی لە ناوەخن (باتن)یدا گەورەترین سەرکەوتنی بۆ موسڵمانان دانابوو خوای گەورە لە سوورەتی الأنفال دەفەرمووێت:

﴿كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ۝٥﴾ [الأنفال]

واتە: (شێوەی دابەش کردنی دەسکەووتەکانی غەزای بەدر هەندێ موسڵمان پێی دڵگران بوون) وەک چۆن پەروەردگارت بە حەق و ڕاستی لە نێو ماڵەکەت دەری هێنایت لەکاتێکدا بەڕاستی کۆمەڵێک لە بڕواداران پێی دڵگران بوون.

هەروەها موسڵمانان کاتێک کە هۆزەکان هاتن و لە چواردەوری شاری مەدینەدا ئەحزابیان پێکهێنا خوای گەورە باسی ئەو ڕەوشەمان بۆ دەکات لە سوورەتی الأحزاب دا دەفەرمووێت:

﴿إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ۝١٠﴾ [الأحزاب]

واتە: کاتێکیش دوژمنان لەسەر و خوارتانەوە هاتنە سەرتان، کاتێکیش چاوەکان ئەبلەق بوون، دڵەکان گەشتبوونە گەروو، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بەبەڵێنەکانی خوای گەورە (بەسەرکەوتنی ئیمانداران).

کەچی خوای گەورە سەرکەوتنی پێبەخشین بۆ موسڵمانان زۆرترین خێری تێدابوو تەنانەت گەیشتە ئەو ڕادەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چیتر ئەوان ناتوانن هێرش بۆ ئێمە بهێنن ئێمە هێرش دەبەینە سەریان.

موسڵمانان پەیماننامەی حودەیبییەیان پێخۆش نەبوو، تەنانەت هاوەڵان دەیانوت بۆ وا سەرشۆڕی و زەلیلی دەنوێنین بۆ قوڕەیش؟!

بەڵام لە ناوەخنی و جەوهەریدا خێرێکی زۆر زۆری تێدابوو.



موسڵمانان شەهیدکردنی براکەیان (حارسی کوڕی عومەیر)یان زۆر پێناخۆش بوو کە نوێنەری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو بۆ والی بوسرا، کەچی لە ناوەخن و جەوهەریدا سەرکەوتنی موئتەی تێدابوو.

هەروەها شکاندنی پەیماننامەی قوڕەیش و بەنی بەکر موسڵمانان پێیان ناخۆش بوو، پێیان وابوو دەبێت لەگەڵ قوڕەیش چەند جاری تر پەیمان نوێ بکەنەوە، بەو پێیەی موسڵمانان سوودی زۆریان وەرگرتووە لەو ئاگربەستە و سوڵحەی کە کراوە، لەماوەی دوو ساڵ ئاگر بەست توانیان ئەو هەموو دەستکەوتە بەدەست بهێنیت.

بیرکردنەوەی زۆری تر کە موسڵمانان بینیان لەماوەیەکی زۆر کەمدا ژمارەیان زۆر بەخیرایی زیاد دەکات، لە نەکردنی جەنگدا.

گومانی تێدا نییە وا ئێستا لە شکاندنی ئەو پەیماننامەیە جەنگ ڕوو ئەدات و شڵەژان و دەربەدەری دەستپێدەکات و دوودڵی و دڵەڕاوکێ لە نیوەدوورگەی عەرەب دەست پێدەکاتەوە، ئابووری و بازرگانی دەوەستێ و خەڵکی بەگشتی دەترسن و کاریگەری زۆر دەبێت لەسەر بانگەواز و بانگی خەڵکی بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام، جەنگی خەست لە نێوانی هەردوو سوپا ڕوودەدات قوڕەیش و موسڵمانان.

بەڵام دڵنیابن سەرکەوتن لە جێگایەکەوە دێت کە موسڵمانان پێیان ناخۆش بێت؟!

ئەی بۆچی سەرکەوتن لە جێگایەکەوە نایەت کە ئێمە پێمان خۆشە؟!

یاخود بەشێوەیەک کە موسڵمانان دەیانەوێت؟!

یاخود بەشێوەیەک کە پلانی بۆ دادەڕێژن؟!

زۆرێک لەم پرسیارانە خۆیان دووبارە دەکەنەوە، بەڵام خوای گەورە سەرکەوتن دەنێرێت کە خۆی دەیەوێت و بە خەیاڵی موسڵماناندا نەهاتووە و پێشیان خۆش نەبووە، هەموو ئەوانە بۆ ئەوەیە کە سەرسام نەبین بەخۆمان و وابزانین بەتوانا و هێزی خۆمانە سەرکەوتن بەدەست دەهێنین، بەهۆکاری توانا و پلان و چەکمان و ژمارەمان و چۆنییەتی سیاسەت و مامەڵەمان.

پێویستە لەبیرمان نەچێت ئەوەی سەرمان دەخات خوای بەهیز و باڵادەستە نەک ئەقڵ و زیرەکیمان.

بۆ ئەوەش هەموو لایەک دان بەوە دابنێین کە خوای پەروەردگار ئیمانداران سەردەخات، سەرکەوتن دێت ڕێک پێچەوانەی پلان و ئەو نەخشەیەی ئێمە دامانڕشتووە واتا لە ڕێگای پێچەوانەوە.



لەوانەیە پرسیارێکی تر خۆی لێمان زیت بکاتەوە بڵێت:

جامادام وایە ئیتر بۆ خۆمان ماندووبکەین و هێز و توانا و پاشان خەریکی پلان و دارِشتنی نەخشەی سەرکەوتن بین؟!

لەوەڵامدا دەڵێین:

ئەگەر بێت و هێز و توانا و پلان و نەخشە رِێگا دانەرِێژین، ئەوا هەرگیز خوای گەورە سەرکەوتنمان بەنسیب ناکات، دەبێت سەدان پلان و نەخشەی سەرکەوتن دابرِێژین تا خوای گەورە سەرکەوتنمان پێدەبەخشێت لەو رِێگایەی کە پەییمان پێی نەبردووە، ئەگەر هەوڵ و ماندوبوونمان نەبێت بەدڵنیاییەوە شکست خواردوو و لاواز و ژێردەستە دەبین و خوای گەورەش هیچ هاوکاریمان ناکات، هاوکاری خوا لە ئەنجامی کارکردنمان دەبێت.

بەلای کەمەوە دەبێت ١٠٠٠ پلان و نەخشە دابرِێژیت بۆ سەرکەوتن، بۆ ئەوەی ئیسپاتی بکەیت کە هۆکارەکانت گرتۆتە بەر بۆ ئەوەی رەزامەندی خوا بەدەست بهێنی، تا سەرکەوتنت پێ ببەخشێت. ئەو سەرکەوتنەی کە لە ژیانتا بە خەیاڵتاندا نەهاتووە، تا هەموو فەزڵ و چاکەکە لە کۆتاییدا بگەرِێتەوە بۆلای خوای پەروەردگار، خوای گەورە لە سوورەتی النصردا دەفەرموێت:

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ۝٣﴾ [النصر]

واتە: کاتێ یارمەتی و کۆمەکی خوا دێت، شاری مەککە رِزگار دەکرێت و دەرگای ئازادی واڵا دەکرێت

خەڵکیشت بینی پۆل پۆل دەچنە رِیزی ئایینی خواوە

ئەوسا ئیتر تۆ سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکە و داوای لێ خۆش بوونی لێ بکە، چونکە بەرِاستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکات و تۆبە وەرگرە (.. ئومێدە لە ئایین دەیەکی نزیکدا، خوای باڵادەست سەرکەوتن ێک ببەخشێت، ئەو کاتە ئیمانداران هەست دەکەن ئەم سوورەتە تازە دابەزیوە).

ئەم سوورەتە مووعجیزەیەکی زۆر گەورەیە لە سووننەتی خوای پەروەردگاردا بە جوانی هەندێک یاسامان بۆ دەرخات.

ئەگەر سەرکەوتن هات، خوای گەورە بە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنە وا لە خەڵکی دەکات موسڵمان بن، هەموو ئەنجامی ئەم سەرکەوتنە (سوپاسگوزاری خوای گەورەیە لەگەڵ یادکردندا) بۆچی تۆبە کردن داوای لێخۆش بوون دوای سەرکەوتن و تەمکین دەبێت؟ لەبەر ئەوەی مرۆڤ



بەهێز و توانای خۆیدا ناژیێت و هەمیشە لەداوای لێخۆش بوون بێت، نەکو وا هەست بکات سەرکەوتن بەتوانا و زیرەکی مرۆڤ بووە، واپەی بەرین تۆ خاوەنی سەرکەوتنەکەیت بە پلان و چەک و ژمارەت، بۆیە مرۆڤ کە سەرکەوتوو بوو دەبێت هەمیشە داوای لێخۆشبوون بکات، بزانێت خوای گەورە بۆ ئەوەی سەرکەوتنەکەت بۆ دووبارە بکاتەوە، هەمیشە سەرکەوتن بدەرەوە پەنای خوای گەورە، توانا و هێزی، خۆت لە بیربکە خوای گەورە لە سوورەتی الأنفال دا دەفەرمووێت:

﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَاءً حَسَنًا ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴿١٧﴾﴾ [الأنفال]

واتە: کەوابوو ئەی ئیمانداران: وەنەبێت ئێوە کافرانتان کوشتبێت، بەڵکو خوا کوشتنی و لەناوی بردوون، تۆش ئەی محەمەد ﷺ کاتێک مشتێک خۆڵت ڕوو بەکافران فڕێدا ئەو کارە تەنها تۆ نەتکرد، بەڵکو خوا فڕێیدا و (خۆڵی کردە چاوی کافرانەوە)، تا ئیمانداران تاقی بکاتەوە بە تاقی کردنەوەیەکی چاک، چونکە بەڕاستی خوا بیسەری (دوعا و نزایانە)، زاناشە (بەنییەتی دڵیان).

چوارەم سوونەتی خوایی: ماوەی سەردەمی دەست پێک و کۆکردنەوە هێز و تواناکان و هەموو هۆکاری سەرکەوتنە.

ئەم سوونەتەی خوای گەورە بۆ کەسێک کە سادە و ساکارانە تەماشا و لێوردەبوونەوەی بۆ بکات زۆر گران و سەختە، بەڵام ئەگەر بە قووڵی و لێوردبوونەوەی تێگەیشتوانە تەماشای بکەیت ڕێک پێچەوانەکەیەتی، ئەم سوونەتە دەڵێت: سەردەمی دەستپێک ماوەیەکی زۆر دوور و درێژی دەوێت تا دەتوانێت دەوڵەتی ئیسلامی دامەزرێنێت کۆکردنەوەی هێز و توانا و ئومێدە هتد.. بۆ دامەزراندنی دەوڵەت ماوەکەی زۆرە بەڵام ماوەی تەمکین زۆر کورتە.

بۆ نموونە: سەردەمی دەستەپێک بۆ فەتحی مەکەی پیرۆز وەربگرین ماوەی ٢١ ساڵ خایەند بەتەواوەتی، ئەگەر تەماشای ئەو ماوەیە بکەین هەمووی هەر کۆکردنەوەی هێز و دەستەپەک بوو تا فەتحی مەککە، خودی فەتحی مەککە تەمکین و جێنیشنکردنی موسڵمانان بوو، هەموو ئەم تەمکینە دوو ساڵی خایاند، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و خەڵکی هەموو هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، ئەگەر تەماشای ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین لە ماوەی ٢٣ ساڵدا کە تەمەنی پێغەمبەرایەتی بوو ٨٩٪ ژیانی لە کۆکردنەوەی هێز و دەستپێک و پەروەردەکردنی خەڵکی و کارکردندا بووە، بەڵام ١١٪ ژیانی تەمکین بوو.

ئەم سوونەتە لەگەڵماندا بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت بۆ موسڵمان و کافر و...هتد.



هەتا وەکو سەردەمی دەستپێک زیاتر بێت سەردەمی تەمکینیش زیاتر دەبێت.

یاخود موسا سەردەم و ماوەی شۆڕش و دەستپێکی ماوەیەکی زۆر دوورودرێژی خایاند، کۆکردنەوەی هێز بۆ خۆی وەکو کەسایەتی و پاشان بۆ بەنی ئیسرائیل، ماوەی ئازار و ئەشکەنجە و دەربەدەری و کوشتن و هتد، بەڵام سەردەمی تەمکینی زۆر زۆر کەم بوو، ئەم سوونەتە بەردەوامە پێش پێغەمبەر و دوای پێغەمبەر وەکو یاساکانی گەردوون وایە، چۆن خوای گەورە یاسای گەردوونی چەسپاندووە ئەم سوونەتانەش هەیە بەهەمانشێوە جێگیری کردووە، بەدڵنیاییەوە لە ڕەحمەتی خوای پەروەردگار ئەم جێگرکردووە، بەدڵنیاییەوە ئەم جێگیرکردنە لە ڕەحمەتی خوای پەروەردگارە تا بتوانین ئێمەش بەشوێن پێی پێغەمبەراندا هەنگاو هەڵبهێنینەوە، خوای گەورە لە سوورەتی فاطر دەفەرمووێت:

﴿ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾﴾ [فاطر]

واتە: چونکە خۆیان بەزل و گەورە دەزانی لە زەویداو پیلانی شەڕو تاوانیان کێشا، بەمەرجێك پیلانی شەڕو تاوان تەنها بەسەر ئەوانەدا دەشکێتەوە کە نەخشەی بۆ دەکێشن، مەگەر ئەمانە بەدژایەتی ئیسلام تەنها چاوەڕێی ئەو کارەساتانە بکەن کە بەسەر گەلانی پێش ئەماندا هاتووە، (کاتێ بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێناوە، لەناوبران) ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لە یاسا و بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاسا و بەرنامەکانی خوا لە نەخشەی خۆیان لابدەن. (کە بەشێکی ڕیسواکردنی پیلانگێڕانە).

## هۆکار چییه ماوەی دەستپێک درێژە و تەمکین کورتە

ماکوان: لەوانەیە پێش ئەوەی شیکار بۆ ئەم باسە بکەم، پرسیارێک لای تۆی خوێنەری مەملەکەتی نوور درووست بێت و بڵێیت: بۆچی هەمیشە ماوەی تەمکین کەمە، بەڵام ماوەی دەستپێک و کۆکردنەوەی توانا و هێز درێژە؟!

لەوەڵامدا دەڵێم بە دوو هۆکار:

هۆکاری یەکەم: لەبەر ئەوەی سەردەمی تەمکین، کۆکردنەوەی دەرگای دونیا و خۆشییەکانیەتی بە ڕووی موسڵماناندا، بوارەکانی ئابووری هەموو بەرەو باشی دەڕوات، حاڵ و گوزەرانی کۆمەڵایەتی باش دەبێت، بەدڵنیاییەوە دونیا ئەگەر خۆشییەکانی دەرکەوت لای موسڵمانان ئەوە دەرگای فیتنەیە، چونکە خەڵکی بۆ خۆشییەکانی ژیان ململانێی سەخت دەکات، ئەو ململانێیە لەسەر دوو شتی بنەڕەتی دەبێت، ئەویش پارە و دەسەڵاتە، خەڵکی بە گشتی لە پێناوی پارە و ساماندا ململانێ دەکات، پاشان هەوڵی دەسەڵات و ململانێی دەسەڵات زۆر لە هەوڵی پارە و سامانەکە زیاترە، مێژوو ئەوەی بۆ باس کردووین و لەسەرەتای مرۆڤایەتی تا ڕۆژی قیامەت پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓءَالِهِۦوَسَلَّمَ دەفەرمووێت:

سوێند بەخوا لە هەژاری و بێدەرەتانیتان ناترسم، بەڵکو لەوە دەترسم دونیا بەسەرتاندا زاڵبێت، کە چۆن پێشتر بەسەر خەڵکانێکی تر داهاتووە زاڵبووە بەسەریاندا، پێشبڕکێی بۆ بکەن هەروەکو پێشتر لەناوتان پێشبڕکێی بۆکراوە، هەروەکو چۆن گەلانی تری لەناو بردووە.[٨٨]

بەڵام لەسەردەمی ئیعداد و دەستپێکی کۆکردنەوەی هێزدا دونیا و فیتنەی دونیا نییە، بەڵام لەسەردەمی تەمکین فیتنەکە خێرا دەبێت، هیچ کەس مەعصوم نییە لە هەڵبژاردنی دونیا بێجگە پێغەمبەری خوا، یاخود ئەوەی خوای گەورە دەیپارێزێت، زۆر کەم لەو فیتنەیە لە ئوممەتی ئیسلامی ڕزگاری دەبێت.

هۆکاری دووەم: ژمارەیەکی زۆری مرۆڤ دێنە ناو ئیسلام هێزی موسڵمانان بەشێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکات، بەڵام نەک بە بیروباوەڕی مەبدەئی ئیسلامی باوەڕیان هەبێت، بەڵکو لەبەر هێز و توانای ئیسلام موسڵمان دەبن، هەموو ئەمانە لەسەردەمی تەمکین ڕوودەدات،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨٨] ـ (قال رسول الله صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓءَالِهِۦوَسَلَّمَ: فأبشروا وأملوا ما يسركم، فوالله ما الفقر أخشى عليكم، ولكن أخشى عليكم أن تبسط عليكم الدنيا كما بسطت على من كان قبلكم فتنافسوها كما تنافسوها وتلهيكم كما ألهتهم) صحيح البخاري، رقم ٦٤٢٥ .



خەڵکی لە سایەی دەوڵەتە بەهێزەکەوە خاوەنی سەروەری و هێز و توانایە و ئیتر خەڵکی شوێنی دەکەون جا بڕوای بە پرنسیپییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی هەبێت یان بڕوای پێنەبێت، ئەم سەروەتە مرۆییە کە دێتە ناو ئیسلام پەروەردە نەکراوە، وەکو ئەوانە نین کە یەکەمجار بەشداربوون لە سەرەتاییەکانی پەروەردە بن، جا بە گشتی پەروەردەیەکی سەرەتایی و زۆر لاوازیان وەرگرتووە، هەر ڕووداوێکی نەخوازراو ڕووبدات یاخود هەر قەیرانێک ڕووبکاتە دەوڵەتی ئیسلامی بەرگە ناگرن زۆر بە زوویی شکست دەهێنن، هەمووی لەلایەک خۆی دەشارێتەوە و هەڵدێن.

هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە سەردەمی تەمکین ماوەکەی کورتە.

لەکاتێکدا موسڵمانان لەسەردەمی ئیعداد و سەرەتای ئەم ئیسلامەدا بۆ ماوەی پێش کۆچ ٦٥ کەس موسڵمانبوون تا ماوەی ١٩ساڵ پێغەمبەر ﷺ بانگەواز و ئیعدادی کردن و موسڵمانان ژمارەیان گەیشتە ١٦٠٠ هاوەڵ، پاش سوڵحی حودەیبییە و فەتحی خەیبەر و هەموو لەدوای دوو ساڵ دوای پەیمانی حودەیبییە بەهەزارەها کەس موسڵمان بوون، هەموو خۆیان ئامادە کرد بۆ فەتحی شاری مەککە، لەدوای فەتحی مەککەش گۆڕانکارییەکی زۆر سەیر ڕوونەدات ئەویش سەدان هەزار کەس دێنە ناو ئیسلام دەلکێن بەدەوڵەتی ئیسلامییەوە، بۆ نموونە پێش فەتحی مەککە سوپای موسڵمانان گەیشتە ١٠هەزار سەرباز، هەر لەدوای ساڵێک پێغەمبەری خوا ﷺ سوپا کۆدەکاتەوە بۆ ناوچەی ڕۆم سوپاکە دەگاتە ٣٠ هەزار کەس، عەرەب لە ژیانیدا سێ هەزار سەربازی بەخۆیەوە نەبینیوە.

دەبینین لەکۆتاییدا لە حەجیماڵئاواییدا ١٣٠ هەزار هاوەڵ کۆدەبنەوە هەندێک دەڵێن ١٢٤ هەزار یاخود ١١٣ هەزار، بەهەرحاڵ هەرسێ ژمارەکە زۆرە بۆ ماوەی دوو ساڵ ئەو هەموو خەڵکە بە لێشاو هاتنە ناو ئیسلام، بێجگە لەو جێگا دوورانەی کە هەموو موسڵمان بوون، ئەمانە هیچی پەروەردە نەکرابوون، هەندێک هەر موسڵمانی سەرزارەکی بوون وەکو موسڵمانی ئەمڕۆ! بۆیە لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ هەموو هەڵگەڕانەوە لە دین، زەمەنی تەمکین کورت بوو، پاشان ئەبوبەکر هەڵسا بەتەواوکردنی کارەکە و پەروەرکردنەوەی خەڵکی، کەواتە ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی و موسڵمانان دەیانەوێت تەمکین بەردەوام بێت، دەبێت سوپا بۆ پەروەردەکردنی خەڵک درووست بکەن، پەروەردەکردن مەرج نییە تەنها لە بواری (عەقیدە) یاخود (فیقهی ئیسلامی) یان (فکر و بانگەواز و سیاسەت)، بەڵکو پەروەردە بە شێوەیەکی گشتی بۆ کۆمەڵگا و خێزان و تاك، لە کۆتاییدا ئەم سێ توخمە دەسەڵات



پێکدەهێنن، هەروەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: خوای گەورە دینی خۆی سەرناخات مەگەر ئەوانەی کە هەموو لاکانی دەگرن.[٨٩]

واتا ناکرێت وەکو هەندێك هەر بڵێین خەڵک بە عەقیدە گەورە بکەین، هەندێک کەسی تر بە تەزکییەی دڵ و دەروون پەروەردە بکەین، هەندێکیتر بە فیکر و بنەماکانی ئایدیا و پرەنسیبە تیۆرییەکانی ئیسلام پەروەردە بکەین هەندێکیتر لە بواری سیاسەت و ئیدارە دا پەروەردە بکەین، هەندێکیتر لە بواری سەربازی و جیهاد پەروەردە بکەین، هەندێک بە فیقهی ئیسلام....هتد.

هەروەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چۆن ڕەچاوی هەموو لاکانی کرد و هەمووی هاوسەنگ کرد و نەیهێشت هیچ لایەك لەلاکانی سیستەمی ژیان چ لە سیاسەت و ئابووری و خزمەتگوزاری هاوسەنگ بن هەمووی پارسەنگ دەکرد، بەگوێرەی توانا و هێزی کۆمەڵگاکە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨٩] ـ (أن الله لاينصر دينه الا من أحاط في كل جوانبه).



# تەمکین هۆکارە نەك ئامانج

ئەگەر بە چاوی ماددی و ژیان بیر لە تەمکین و کەم و کوڕی ماددەکەی زۆر دڵتەنگت دەکات، مرۆڤ ئەو هەموو هەوڵدان و ئیعداد و کۆکردنەوەی هێز دەکات، بۆ ماوەیەکی ئەوەندە کورت؟!!

با وەڵامەکەی بە شێوەی پرسیار بدەینەوە بۆچی هەولی ئیعداد دەکەین؟ بۆ هێز و توانا کۆ دەکەینەوە؟

بۆچی بەدوای تەمکینین و هەوڵی بۆ ئەدەین؟

ئایا هۆکارە یان ئامانجە؟

سێ پرسیار دەبێت وەڵامی بۆ دەستەبەر بکرێت، تا بتوانین ئامانج دیاری بکەین، چونکە ئامانجەکە دیار نییە.

هەموو ئەو کارانەی کە لە شێوەی پرسیار کردمان، بۆ ئەوەی کە خوای پەروەردگار لە خۆمان ڕازی بکەین، ئەگەر کارمان کرد جا لەهەر کوێیەکی کارەکەدا بین یاخود سەرەتا بێت یاخود تەمکین بۆ بەدەستهێنانی بەهەشتە، ئامانجی سەرەکی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار و بەهەشتەکەیەتی، خوای گەورە پاداشتی ئەو کەسە ئەداتەوە بە گوێرەی کردارەکانی، لە ڕاستیدا ئەو تێگەیشتنە ئارامکردنەوەی دڵ و دەروونە.

کارکردن لە سەردەم و ماوەی ئیعداد و هێز کۆکردنەوەدا خاوەنەکەی پاداشت وەردەگرێت بەهەمان شێوە کارکردن لەسەردەم و زەمەنی تەمکیندا خاوەنەکەی بە هەمان شێوە پاداشت وەردەگرێت، لێرەدا کردار و کارکردنەکەی ئامانجە، نەك تەمکین چەند هەیە کرداری بۆ ئاگری جەهەننەمە با خاوەن تەمکین و دەسەڵات بێت بەڵام کۆتاییەکەی دۆزەخە، خوای گەورە لە سوورەتی آل عمران دا دەفەرموێت:

﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلْبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾﴾ [آل عمران]

واتە: (ئەی ئیماندار) هەرگیز هێز و دەسەڵاتی ئەوانەی بێ باوەڕن لە وڵاتاندا تۆ لەخشتە نەبات.



(ئەوە هەرهەمووی) ڕابواردنێکی کەمە (چونکە) لەوەودوا شوێن و جێگەیان دۆزەخە، کە ناخۆشترین جێگە و ڕێگەیە.

لە لایەکیترەوە چەندین کەس کە هەر بیری لە تەمکین نەکردۆتەوە کە چی کۆتاییەکەی بەهەشتە، لەوانە نموونەی هەزارەهامان لەبەردەست دایە، ئەگەر نموونەی موسعەبی کوڕی عومەیر وەرگرین لە جەنگی ئوحود دا شەهید بوو، ئەهلی بەهەشت بوو نە تەمکینی بینی نە فەتح، یاخود هەمزەی کوڕی عبدولموتەڵیب، یان زۆرێك هەر لە شاری مەککەدا شەهید بوون و مردن، نموونەی (سومەیەی دایکی عەممار و باوکی یاسر) یاخود بەڕائی کوڕی مەعروف و ئەسعەدی کوڕی زوراره، ئەمانە پێش بەدر وەفاتیان کرد نەسەرکەوتن و نەفەتح و نە تەمکینیان بینی و هەمووشیان ئەهلی بەهەشتن.

گرنگە بۆ خوا کاربکەین جا لە هەرکات و سەردەم و زەمەن و قۆناغێکدا بین نەك بۆ سەرکەوتن و فەتح و تەمکین، بۆ ئەوەی دڵخۆش بین بە کارەکەمان چونکە سەرکەوتنی ڕاستی و تەواوەتی و دڵخۆشی هەتا هەتایی ئەوەیە کە بەکردارەکانت بڕۆیتە ناو بە هەشت، خوای گەورە خۆی هەڵی دەبژێرێت، چونکە بەڕاستی کردارەکانت زۆر گرنگترە لە سەرکەوتن و فەتح و تەمکین بە بەڵگەی قورئان خوای گەورە لە سوورەتی الحديد دەفەرموێت:

﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾﴾ [الحديد]

واتە: جا ئیتر ئەوە چیتانە و بۆچی ماڵ و سامانتان نابەخشین لەڕێگەی خوادا، خۆ هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ خوا دەمێنێتەوە، بێگومان چوو.ەک نین ئەوانەتان کەپێش ڕزگاری مەککە، یاخود پێش سەرکەوتن ، ماڵ و سامانی بەخشیو. و جەنگاوە، چونکە ئەوانە پلەو پایەیان زۆر بەرزترە لەوانەی کەدوای ڕزگاری مەککە و بەدەست هێنانی سەرکەوتن ماڵ و سامانیان بەخشیووە و جەنگاون، بەهەردوولاشیان خوا بەڵێنی بەهەشتی بەخشیووە، بێگومان ئەو خوایە ئاگایە بەکاروکردەوەتان.

کارکردن لە سەردەمی سەرەتا و دەستپێك زۆر سەخت و ئەجر و پاداشتی زۆر زیاترە لە سەردەمی تەمکین، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەوڵ نەدەیت بۆ تەمکین و سەرکەوتن و فەتح، هەوڵی بۆ ئەدەین بەڵام ملی خۆمان بۆ ناشکێنین و لە چوارچێوەی قۆناغە زەمەنی شەرعییەکاندا بە دەستی دەهێنین، خۆ ئەگەر دواکەوت خەفەتبار نابین بۆی یان تەمەڵی ناکەین و گوێی پێ نەدەین و لە جێگای خۆماندا دابنیشین، بەڵکو دەزانین هەموو کارێکی موسڵمانان خوای پەروەردگار خێر و چاکەی تێدا داناوە.



داوای جێگیری و دڵ پڕ بەقینی دەکەین لە خوای پەروەردگار و هەمیشە دوعا و نزا دەکەین کە گەیشتینە سەردەمی تەمکین خوای گەورە بە دوورمان بگرێت لە فیتنەی ماڵ و کورسی دنیا بە گشتی.

با بگەڕێینەوە بۆ ناو سیرەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕاستەوخۆ بێدوودڵی و دڵەڕاوکێ وەڵامی خوزاعەی دایەوە کە هاوکاریان دەکات و بە دەمیانەوە دەچێت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چیکرد لە کاتی ئەم قەیرانەدا کە تووشی خوزاعە بوو زوڵمی لێکراوە؟

قەیرانەکە ئەوەیە کە پەیماننامەکە شکێندراوە، ئەگەری جەنگ زۆرە، ئەم قەیرانە سومعەی دەوڵەتی ئیسلامی ڕووشاندوە، ئەگەر پێشتر وەڵام نەدرێتەوە پەرچەکردار نەبێت سەردەکێشێت بۆ شتی گەورە تر.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەم قەیرانەی بە هەل قۆستەوە، زیاتر زانایانی ئیداریی شارەزاییان لەم بوارەدا هەیە کە هەر قەیران و موسیبەتێك ڕوو ئەدات، سوودی لێوەردەگرن و لە قەیرانەوە دەیکەنە هەل بۆ سەرکەوتنێکی تر، دەیگۆڕن بۆ بەرژەوەندی تا زۆرترین دەستکەوتی لێ بەدەست بهێنێت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە هەموو شارەزایانی ئیدارە بەهێزتر بوو، توانی ئەم ڕەوشە و قەیرانە بکاتە سوود و قازانجێکی گەورە بۆ موسڵمانان، بە کەمترین خەسارەت لێی دەربچێت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چۆن سوودی لێ وەرگرت؟

نەهات وەکو خەڵکی لاواز و بێ دەسەڵات، بڵێت ئیدارەی کارەکە دەکەین و چەند دروشمێکی لەسەر بدات و ئاڵای قورەیش بسووتێنێت و گوێ بۆ کەس نەگرێت و سکاڵایان لای وڵاتە یەکگرتووەکان تۆمار نەکرد، بەڵکو ئەگەر چی قورەیش خاوەن دەوڵەت و مەکانەتە، ئەی چارەسەری چییە؟ لێکۆڵینەوەیەکی واقعی کرد و تەماشای کرد هەموو نیوەدوورگەی عەرەبی لەگەڵیدان، بڕیاری دا فەتحی شاری مەککە بکات.



# ڕەوشەکە لەبارە بۆ فەتحی مەککە

ماکوان: ئەگەر خوای گەورە ئیرادە و ویستی لەسەر شتێك بێت لە هەرکات و سەردەمێك دا بێت هۆکاری بۆ ڕێکدەخات و دەیهێنێتە دی، بەو مەرجەی مرۆڤ لە هەوڵدابێت بە ڕاستگۆیی و ئیمانی خواناسی و هۆکاری بۆ بگرێتەبەر، خوای گەورە سەرکەوتنی پێ دەبەخشێت، خوای گەورە لە سوورەتی محەمەد دەفەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ۝٧﴾ [محمد]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئایینی خوا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، ئەوە خوایش پشتیوانی لەئێوە دەکات و سەرتان دەخات و پایەدارو جێگیرتان دەکات.

دەبینین چۆن خوای گەورە ڕەوشەکەی بۆ پێغەمبەی خوا ﷺ ڕێکخستووە، تا موسڵمانان بگەنە ئەوەی بڕیاری فەتحی مەککە بدەن، ئەگەر بە خێرایی سەیری جیاوازی نێوان موسڵمانان لەگەڵ قورەیش بکەین، دەبینین دەوڵەتی ئیسلامی زۆر زۆر جیاوازترە لە قورەیش کە خاوەنی دەوڵەتی شیرکە، زۆر لاواز و بێهێزبوو، چەند هۆکارێک بووە هۆکاری ئەوەی کە موسڵمانان و پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری فەتحی مەککەی پیرۆز بدەن، ئەویش بریتی بوو:

یەکەم: هێز و ڕەوشی سیاسی و سەربازی موسڵمانان پێش فەتحی مەککە زۆر بە هێز و بەتوانا بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ هێزی موسڵمانان لە ڕووی ژمارەوە زیادی دەکرد و پاشان لە ڕووی سەربازییەوە زۆر بە توانا بوو چونکە ماوەی ٧ ساڵە هەمیشە لە ڕاهێنان و فەتحی مەیدانی دابوون، مەشقەکانیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی خەیاڵی و سەربازگەدا نەبووە، بەڵکو هەموو واقیعی و بەڕاستی ڕووبەڕووی هێزەکانی دوژمن بوونەتەوە، لەگەڵ موشریك و یەهوود و ڕۆم دا، مەعنەویاتی موسڵمانان زۆر بەرز بوو، سومعەی سەرباز و سوپاکەیان زۆر ناودار و پڕ بەها بوو، هەروەها سوپاکە و دەوڵەتەکەش بە هێز بوو لە ئاستی ناوچەکە و بگرە جیهان بە گشتی.

دەوڵەتی ئیسلامی پەیوەندییەکی بەهێزی هەبوو لەگەڵ دەوڵەت و مەملەکەتەکانی چواردەوری، بۆ نموونە یەمەن هەمووی موسڵمان بوون، هەموو هاتبوونە نێو ئیسلام لەولاوە بەحرین بەهەمان شێوە، پەیوەندی لەگەڵ حەبەشەش بەهێز بوو، پەیوەندی توند و تۆڵی هەبوو لەگەڵ میسردا، دەوڵەتی ئیسلامی لەو کاتەدا جێگیر و بەتوانا و بەهێز بوو.



چەك و هێزی سەربازی زۆر بەتوانای هەبوو لە چاوی هێزی ناوچەکە کە لەماوەی داهاتوودا بۆ یەکەمین جار لە جەنگی تائیف دا ( دەبابە و تانك درووست دەکات).

دووەم: ڕەوش و توانای سەربازی و سیاسی قوڕەیش پێش فەتحی مەککە زۆر لاواز و بێ توانابوو، ڕۆژ بە ڕۆژ توانا و هێزی قوڕەیش بەرەو لاوازی دەڕۆیشت.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە کاتی جەنگی ئەحزاب دا هەستی بە لاوازی قوڕەیش کرد و فەرمووی ئێمە دەڕۆینە سەریان و هێرش دەبەین ئەوان توانای هێرشیان نییە

(الآن نغزوهم و لا يغزوننا نحن نسير اليهم)

پاشان لە کاتی دانوستانی حودەیبییە پێش دوو ساڵ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی قوڕەیش توانای جەنگی نییە و ناتوانێت جارێکیتر جەنگ بکات.

(إن قريشا قد وهنتهم الحرب وأضرت بهم)

لە ئێستادا دەوڵەتی ئیسلامی زۆر بەهێز و بەتوانایە، بە پێچەوانەوە قوڕەیش بێهێز و بێتوانایە، هیچ کات لە دوای ئەحزاب لە سوودی قوڕەیش نەبوو ڕێکەوتنی حودەیبییە هەموو لە سوود و قازانجی موسڵمانان بوو، زۆربەی خەڵك لە سەربازگەی کوفرەوە بەرەو سەربازگەی ئیمان ڕۆیشتن، هەموو چوونە ناو دەوڵەتی ئیسلامی، هەروەها هەموو هاوپەیمانەکان لەقوڕەیش کشانەوە، ئەگەر بڵێین تەنها بەنی بەکر هاوپەیمان مایەوە، پەیوەندی هەردوو لا زۆر لاوازە، چونکە لە نێوانیاندا دوژمنایەتی کۆن هەیە. لەکاتی جەنگی بەدر هەستمان بەو دوژمنایەتییە قووڵەیان کرد.

خۆ ئەگەر قوڕەیش هەر هەڵوێستێکی سەربازی دژی موسڵمانان بگرێتە بەر لە جەنگ، بە هیچ شێوەیەك بەنی بەکر هاوکاری ناکات، بە بەڵگەی ئەوەی کە سوپای قوڕەیش خۆی ئامادە کرد بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای موسڵمانان دژی فەتحی مەککە، بەنی بەکر هیچ هاوکاری نەکرد، لە ڕاستی دا کێشە گەورەکەش هەر لەسەر خودی بەنی بەکرە.

پاشان لە ناو سوپای قوڕەیش قەیرانی زۆر گەورە هەبوو، چونکە زۆرینەی قیاداتی سەربازی لەدەست دابوو هەموو چووبوونە ڕیزی موسڵمانان، لە هەمووی گرنگتر پێش چەند مانگێك لە مەوبەر خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاس وازیان لە سوپای کوفر هێنا و چوونە ناو سوپای ئیمانەوە.

هەموو خەڵکە سەربازییە خاوەن سومعە و ناودارەکانی قوڕەیش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دا بوون.



سێیەم: کەمبوونەوەی دوژمنەکانی موسڵمان و لاوازی دوژمنەکان لە یەهوود و موشریکەکانی عەرەب و دەشتەکییە ئەعرابییەکان، بە تەواوەتی نەبوون یان هەبوون و زۆر لاواز بوون، تەنانەت توانای پارێزگاریکردنی خۆشیان نەبوو.

زۆرینەی هۆزەکانی قورەیش بە تەواوەتی موسڵمان بوون، ئەوانە هۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ و هۆزی عوسمانی کوڕی تەڵحە کە بە کوڕانی عەبدولدار ناسرا بوون خاوەنی کلیلی کەعبە بوون، هەروەها زۆرینەی بەنی مەخزوم لەگەڵ پێغەمبەر دابوون، هۆزی ئەبوجەهل بوون لە وانەی ناودارتر بوون خالیدی کوری وەلید، عەمری کوڕی عاس و وەلیدی برای...هتد.

ئەمانە هەموو بە تەواوەتی عەرشی قورەیشی نەك لەرزاند بەڵكو وێرانی کرد، غەتەفان ٦ هەزار سەربازی هاتە ناو ئیسلام، ئەو ٦ هەزارەی بۆ شاری مەدینە هاتن لەکاتی جەنگی ئەحزاب دا واخۆیان ئامادە کردووە بۆ فەتحی مەککە، ئەوەش ستراتیژی خوای گەورەیە لە قەزاوقەدەردا و کەونی پێ بەڕێوە دەبات، سوپای غەتەفان هاوکارە لەگەڵ موسڵمانان بۆ فەتحی مەککەی پیرۆز.

چوارەم: لە ڕووی یاسا و عورف و شەرع هەموو دان بەوە دادەنێن کە حەقی موسڵمانانە فەتحی بکەن، هیچ کەس و لایەنێك ناتوانێت سەرزەنشتیان بکات لەسەر جەنگیان بۆ فەتحی مەککەی پیرۆز.

هەروەها فرسەتێکە دەست موسڵمانان کەوتووە، نابێت لەدەست خۆیان بدەن، چونکە فەتحی مەککە داوایەکی ئیسلامی و موسڵمانە، چونکە ماڵ و سامان و سەروەتی موسڵمانان هەموو داگیر کراوە، ئەمەش فرسەتێکە بۆ

گەڕانەوەی سامان و سەروەتی موسڵمانان، هەروەها فرسەتێکە بۆ تێگەیاندنی خەڵکی بە گشتی بە ئیسلام، ئەگەر زاڵم و دەسەڵاتدارانی تاغوتی مەککە لەسەر کورسییەکانیان بهێنێتە خوارەوە.

ئەم فرسەتە زۆر گران و ئاڵتوونیە هەروەها حیکمەتی سیاسی لە پشتییەوە لەوپەڕی گرنگی خۆیدایە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، ماڵی خوا دەپارێزن و ئیتر مەرجەعیەت لای موسڵمانانە و شەرع و شەریعەت هەر لەوێوە بە تەواوەتی بە جیهاندا دابەشی دەکەن و پەرش و بڵاو دەکەنەوە، شاری مەککە سەنتەرە. دەبینین لە کاتی هەڵگەڕاوەکاندا شاری مەککە چ کاریگەرییەکی خۆی هەیە و بە دڵنیاییەوە تا ڕۆژی قیامەت هەر کاریگەری خۆی هەیە چونکە ماڵی خوای پەروەدگاری لێیە.



پێنجەم: واجبێکی ئەخلاقی و دینی و سیاسییە هەڵسان بە فەتحی مەککە، واجبی ئەخلاقی ئەوەیە کە دەستی زاڵم لەسەر زوڵم لێکراوان هەڵگرن و چیتر نەهێڵن زوڵم بکەن، خوزاعە زوڵمی لێکراوە واجبێکی ئەخلاقییە کە هاوکارییان بکەن، بەڵکو نەک واجبی ئەخلاقییە بەڵکو واجبی شەرعی و یاساییە، فەرزە لەسەر موسڵمانان هاوکاری خوزاعە بکەن، لەبەر ئەوە دەبێت موسڵمانان پابەندبن بە پەیماننامەکە و هاوپەیمانییەکەیان.

موسڵمانان هیچ هەڵبژاردەیەکیتریان نییە، تەنها و تەنها دەبێت هاوکاری خوزاعە بن و بۆ هەڵگرتنی ئەو زوڵمە دەبێت سەریان بخەن، چونکە لە پەیماننامەکەدا هاتووە، ئەوانیش لەناو شاری مەککەدا و لەناو کەعبەدا حورمەتیان شکێنراوە و لێیان کوژراوە.

دەبێت موسڵمانان هێز بجوڵێنن، چونکە شکاندنی کەرامەتی خوزاعە واتا شکاندنی کەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامی، ئەگەر چی هۆزی کافر و موشریک بن، چونکە موسڵمان بەوەفایە بەرامبەر پەیمان و گفتی.

لەهەمانکاتدا واجبێکی سیاسییە، لەبەر ئەوەی سەروەری ئەو وڵاتە نەپارێزراوە و دەستدرێژی کراوەتە سەر پیرۆزییەکانی، ئەو پەیماننامەیە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی گرنگە، پێویستە موسڵمانان ڕێز و حورمەتی بەند و یاسا و پەیماننامەی دەوڵەتەکەیان بگرن، ئەگەر خۆیان حورمەتی سەروەری و یاسا و پەیماننامەکانی خۆیان نەگرن هەرگیز کافران ئەو کارەیان بۆ ئەنجام نادەن، لەلایەکی تریشەوە بەنی بەکر بەگشتی موشریکن، بەڵام بە پێچەوانەوە نیوەی خوزاعە موسڵمانە، زۆرێک لە کوژراوەکانی خوزاعە لە موسڵمانانە، ئەمەش هەڵوێستی گونجاوە کە لەگەڵ هاودینەکانی خۆیاندا بوەستنەوە، ئەو وەستانەوەش ئەوەیە کە فەتحی شاری مەککە بکات.



## بڕیاری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ فەتحی مەککە دەرچوو

ماکوان: کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری تەواوەتیدا بۆ فەتحی مەککە و دەستی کرد بە سوپا کۆکردنەوە، بڕیارێکی خێرا نەبوو، بەڵکو لەکاتی خۆیدا بوو. سوپا ئامادە بوو هێز و تواناکان ئامادەبوون، سوپا لە مەشقی باشدا بوو لە ناوچەکەدا خاوەنی هەیبەت و گەورەیی بوو، تەنانەت ژنان هاوسەرەکانیان هان ئەدا بۆ جیهاد، لاوان لە ئارەزووی جیهاد و جیهادکردندا بوون، منداڵان ئاوات و ئارەزوویان ئەوە بوو زوو گەورەبن و بڕۆن بۆ جیهاد پیر و منداڵ و جوان و ژن و پیاو موشتاقی شەهیدی و جیهاد بوون، کۆمەڵگەیەک بەو شێوە بێت کێ دەتوانێت خۆی لە بەردەمیدا بگرێت، مامۆستا و ڕابەرەکەشی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت.

ئەم جۆرە لە کۆمەڵگەیە لەوانە نییە کە جەنگ ڕووبدات و لەسەر خەڵکی فەرزبکرێت و بڕۆن بۆ جەنگ، ئەمە جیهادە خەڵکی خۆی لەپێناویدا شەهید دەکات, ئەگەر گەلێک لەسەرخۆشی و شادی پەروەردە کرا، بەدڵنیاییەوە لە خۆشییەکانی ژیاندا نغرۆ دەبێت و هەمیشە خەیاڵی لای یاری و گاڵتە و گەپە.

زۆر ئەستەمە و وێستگەیەکی وەکو ئەم وێستگەیە ڕووبدات ئامادەی هەموو قەیران و سەختییەکی ژیان ببێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی وا پەروەردە کردبوو، کە لەهەموو کات و سەردەمێک تووشی هەر قەیرانێک بوون ڕووبەڕووی ببنەوە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەجێ هەلەکەی قۆستەوە و بڕیاری فەتحی مەککەیدا.

لەهەمانکاتدا ئابووری موسڵمانان و شاری مەدینە و دەوڵەتەکەی لەوپەڕی هێز و تواناداببوو، ئابوورییەکەی جێگیر ببوو لە گەشە و نەشونمادا بوو، موسڵمانان پێداویستیان نەبوو، بەڵکو لە خۆیان زیاتر بوو و هەمیشە لە بەخشیندا بوون، هەروەها لە پەیوەندییە دبلۆماسییەکانیان و پەیوەندییەکانیان بەگشتی نەدەترسان تا خەڵکی تر پەیوەندییەکانیان بپچڕێت، دەزگاکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئاسایش و موخابەرات (هەواڵگری) لێرە و لەوێ بڵاوببوونەوە، بەباشترین شێوە هەموو بەکاری خۆیان هەڵدەستان، حاکم و مەحکوم و وەزیر و خەڵکی هەژار و گەورە و بچووک، پیاو و ژن هەموو هەستیان بە خۆشەویستی و ئینتما دەکرد بۆ دەوڵەتەکەیان، ئەمانە هیچی درووشم و قسەی باق و بریق نەبوون، یان گوتاری سەرۆکی دەوڵەت بۆ گەلەکەی هەڵیبخەڵەتێنێت، یان وتارێکی سادە و ساکار هاوشێوەی ئینتمایەک نەبوو بۆ تیپی تۆپی پێ، یان بەرزکردنەوەی ئاڵای وڵات یان لە پێناوی مەرج و داهاتەکەی کاربکات.



بەڵکو ئامادەبوون بە ڕاستگۆیی گیانی خۆیان تێدا بەخت بکەن لە پێناوی ئیسلامدا لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا بژین و بمرن.

ئینتمایان وابوو کە بەچرکەسات وازیان لە کارکردن نەدەهێنا، ئەوەی پێیان بسپێرایە بە جوانترین شێوە ئەنجامیان ئەدا، ئەوەی لەتوانایاندا بوایە بە زیاتر و زیاتر دەیانکرد.

ئینتمایان بۆ سوپاکەیان هەبوو خۆشیان دەویست، لە جەنگدا هەڵنەدەهاتن پارێزگارییان لە سەروەت و سامان و حکومەتی یەکتر دەکرد، دەست پیسی و بەرتیلخۆر نەبوون، ماڵ و سامانی گشتییان بۆ خۆیان حەڵاڵ نەدەکرد، خۆشەویستی ئینتمایان لە مەیدانی جیهادا دەست نیشان دەکرد، لەکاری ڕۆژانەیاندا لە بازاڕ و گفتوگۆیاندا دەردەکەوت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەناو گەلی مەدینە و دەوڵەتەکەیدا ئەو ئینتیما و خۆشەویستییەی ڕواندبوو، بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەر کات و هەر چرکەساتێک پێویستی بەگەلەکەی بوایە خێرا و دەستبەجێ ئامادەبوون، ئەمەش وای کرد کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بێدوودڵی و زۆر حازمانە بڕیاری فەتحی شاری مەککەدا.



## لایەنی قورەیش و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی هەڵەکەیان

ماکوان: کاتێک قورەیش لەگەڵ هۆزی بەنی بەکر هەڵسان بەو تاوانە و ژمارەیەک لە خەڵکی خوزاعەیان کوشت، قورەیش زانی کە خیانەتی لە پەیماننامەی نێوان خۆیان و موسڵمانان کردووە، زانیان پێغەمبەری خوا ﷺ هەروا بە ئاسانی وازیان لێناهێنێت و کارەکە بەجددی وەردەگرێت، زۆر نزیکە پێغەمبەر ﷺ ئۆپەراسیۆنی سەربازی ئەنجام بدات.

قورەیش هەڵسا بە ڕاوێژکردن کە چیبکەن بەرامبەر ئەو کارەی کراوە، خێرا ئەبو سوفیان سەرکردەکانی مەککەی بانگ کرد و هەڵسا بە بەستنی مەجلیسێکی شوورا، عیکریەی کوڕی ئەبو جەهل و سەفوانی کوڕی ئومەییە و سوهێلی کوڕی عەمر و هەندێکی تر لە گەورە پیاوان، دەستیان کرد بە گفتوگۆ لەسەر ڕەوشەکە و تاوتوێکردنی کێشەکان، ئەبو سوفیان گەیشتە ئەو بڕوایەی کە موسڵمانان خاوەنی هێز و توانای زۆر بەهێزن، لایان ئاشکرابوو کە پەیماننامەی حودەیبییە هەموو لە سوود و قازانجی موسڵمانان بوو، هەروەها ئەبو سوفیان باش لەوە تێگەیشتبوو کە هێزی موسڵمانان لەسەر ئاستی جیهانی قسەی لەسەر دەکرێت و لە هێزێکی لۆکاڵی دەرچووە، ئەو کاتەی کە سەفەری کرد بۆ شام لەوێ هیرەقل بانگی کرد پرسیاری پێغەمبەری خوا ﷺ لێکرد، شێوەیەکی زۆر پڕ هەیبەتی وەرگرت لە هیرەقل لەسەر پێغەمبەر ﷺ تەنانەت کێشای بەدەستی خۆیدا و وتی:

بەڕاستی کوڕی ئەبو کەبشە چاک ناوبانگی دەرچووە بۆتە خاوەنی هێز، مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

هەروەها ئەبو سوفیان و قورەیش هەموو سەرکەوتنەکانی موسڵمانان لە خەیبەر و غەتەفان و موئتە لەبەر چاو بوو، کە هەرگیز ئەو سەرکەوتنانە بە خەیاڵی قورەیشدا نەهاتبوو.

ئینجا باش هەستیان بەو هەموو هۆز و دەوڵەتانەی دەوروپشتیان کردبوو کە هەموو موسڵمانان بوون و چوونەتە سەر هێزی موسڵمانان، بەتایبەت یەمەن و عومان و بەحرەین.

ئەم شیکارییانە بەتەواوەتی ترس و لەرزینی خستە دڵی ئەبو سوفیان، قورەیش هەوڵی ئەدا بزانێت چ سوودێکی وەرگرتووە لە هاوکاری بەنی بەکر، بەڵام لە کۆتاییدا بۆیان دەرکەوت هیچ سوودێکیان لێ نەبینیووە.

پاشان عومرەی قەزاکە ڕوویدا پێش ساڵێک لەمەوبەر هێز و توانای موسڵمانان ترس و لەرزینی وای خستە دڵی کافرەکان کە بەتەواوی کاریگەری خۆی لەسەر قورەیش درووست



کردبوو، دوو هەزار کەس چوونە شاری مەککە، ئەوان واتا قورەیش لە هێزی ٢ هەزار سەرباز دەترسان، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ توانی کاریگەری وا بخاتە سەر قورەیش کە بەناوهێنانی موسڵمانان بترسن.

بۆیە قورەیش تا ئەم چرکەساتە نازانێت چی ڕوودەدات، بەڵام زۆرباش دڵنیاییەکە ئەگەری جەنگ( ٩٥٪)ە، بەڵام نازانێت چۆن دەبێت و چی ڕوودەدات.

لەسەر ئەو بنەمایە کۆبۆبوونەوەیان لە (دارولنەدوە) ئەنجامدا، قورەیش هاتە سەر ئەو ڕایەی کە بڕۆن بۆ شاری مەدینە و داوای لێبووردن و لێخۆشبوون بکەن لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ تاوەکو چاوپۆشی بکات لەو هەڵەیەی کە کردوویانە.



## قورەیش و سەرۆکی گشتی مەککە داوای لێخۆشبوون دەکات

ماکوان: لە مەجلیسەکەدا هەموو لەسەر ئەوە کۆک بوون کە خودی سەرۆکی مەککە ئەبو سوفیان هەڵسێت بەکارەکە و هیچ نوێنەر نەنێرێت، چونکە ڕەوشەکە زۆر سەختە بۆیە پێویستە کەسی یەکەمی شاری مەککە بڕوات، دیار ئەویش ئەبو سوفیانە گەورەی مەککە و گەورەی بەنی ئومەیەیە.

ئەم سەرکردە مێژوویەکی دوو ودرێژی هەیە لە دژایەتی کردنی موسڵمانان و جەنگ لەسەر جەنگ ئەنجامی ئەدا دژی لەناوبردنی خودی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و موسڵمانان، وا ئێستا بە تەواوەتی تەنازول لە بوغڕایی و لووتبەرزی خۆی دەکات و ئەڕوات بۆ داوای لێخۆشبوون، کەرامەتی خۆی دەخاتە ناو خاک داوا لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەکات کە ماوەی پەیماننامەکە بۆیان درێژ بکاتەوە، ئەمەش یەکەم جارە کە قورەیش بە ئاشکرا تەنازولی ئاوا گەورە دەکات.

ئەبو سوفیان بۆ شاری مەدینە کەوتە ڕێ، کە هەرچی کردووە بۆ تۆڵەسەندنەوەی لەخوزاعە و ڕووشاندنی کەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هێور بکاتەوە هیچ کاردانەوەی نەبێت و هەوڵبدات بەهەر نرخێک بێت ماوەی پەیماننامەکە نوێ بکەنەوە.



# شکاندنی شکۆی ئەبو سوفیان

ماکوان: ئەبو سوفیان گەیشتنە شاری مەدینە، بۆ ئەوەی پشوو بدات چووە ماڵی کچەکەی کە خێزانی پێغەمبەری خوایە ﷺ و دایکی بەڕێزی ئیماندارانە، بەناوی (ئوم حەبیبە) ئەم بەیەکگەیشتنە ماوەی ١٦ ساڵ بوو یەکتریان نەدیبوو، چونکە ئوم حەبیبە لەگەڵ هاوسەرەکەی چووبوون بۆ حەبەشە و هاوسەرەکەی لەڕێگادا ببووە مەسیحی و لەوێ هاوسەرەکەی بەناوی عەبدوڵڵای کوڕی جەحشە بەکافری مرد، نەجاشی بووە وەلی ئەمری و لە پێغەمبەری خوا ﷺی مارە کرد.

پەیوەندی نێوان ئەم کچە و باوکە دابڕابوو، واهەستی کرد کە چووە ماڵەکەی زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی باوکی دەکات و بەوپەڕی ڕێز و حورمەتی لێدەگرێت، بەڵام ئەبو سوفیان کاتێك نزیک بوویەوە لەو جێگایەی کە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەی لێی دادەنیشت کە دۆشەک و پشتییەک بوو، ویستی دابنیشێت و قسە لەگەڵ کچەکەیدا بکات.

بەڵام ئوم حەبیبە خێرا دۆشەک و پشتییەکەی لابرد و ڕێگری کرد لە باوکی کە لەوێدا دابنیشێت!

ئەبو سوفیان زۆر لای سەیر بوو وتی کچم نازانم ئەو جێگایە بە شیاو نازانیت بۆ باوکت، یان ناتەوێت لەوێدا دابنیشم؟!

مەبەستی ئەوە بوو شتی باشتری بداتێ بۆ دانیشتن!

ئوم حەبیبە فەرمووی: ئەوە جێگای پێغەمبەری خوایە ﷺ تۆش موشریکی و موشریکیش پیسە.

ئەبو سوفیان وایزانی زۆر ڕێزی دەگرێت، چونکە ئەو جێگایەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سادە و ساکاربوو، وایزانی لەبەرئەوەی کە باوکی سەرۆکی مەککەیە جێگای باشتر و چاکتری بۆ ئامادە دەکات، بەڵکو شکۆی شکاند و وتی تۆ کەسێکی پیسی و موشریک بەگشتی پیسن، نەیهێشت لە جێگای پاکترین و بەڕێزترین کەس لەسەر زەوی دابنیشیت.

ئەبو سوفیان وتی: دیارە تۆش کە لەمن جیابوویەوە تووشی شەڕ و نەگبەتی بووی.



# هەڵوێستەیەک لەسەر کاری ئوم حەبیبە

ماکوان: لە دواییدا ئەبو سوفیان بەدەرکراوی لەماڵی ئوم حەبیبە دەرچوو، ئەگەر بەچاوی شیکارییانە تەماشای ئەم کارەی کچ و باوک بکەین، جۆرێک لە توندی پێوە دیارە، لە ڕاستیدا جێگای قبووڵکردن نییە لەم کچە کە بەم شێوە بەرخوود لەگەڵ باوکیدا بکات با موشریک بێت، وەکو نێوان باوک و کچ.

بەڵام لێرەدا مامەڵەکە زۆر ڕاست و تەندرووست بوو، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەحی ئاگادار کرابووەوە کە ئەبو سوفیان دێت بۆلاتان و داوای پەیماننامە و درێژکردنەوەی ماوەی جەنگ بەستن دەکات.

دیارە مامەڵەی ئوم حەبیبە وەکو کچ و باوک نییە، بەڵکو وەکو سەرۆکی مەککە و دەوڵەت مامەڵەی لەگەڵ کردووە، دەیزانی کە پەیمان شکێنراوە و خەڵکی کوژراوە و پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر تووڕەیە لە ئەنجامی کارەکەیان.

ئوم حەبیبە ئاگاداری فەرموودەکەی پێغەمبەر بوو ﷺ کە فەرمووی ئەبو سوفیان دێت.

(قال ﷺ كأنكم بأبي سوفيان قد جاءكم ليشد في العقد ويزيد في المدة).

ئەو دەیزانی بۆچی ئەبو سوفیان هاتووە، نەهاتووە تا کچەکەی بەسەربکاتەوە هەر بۆیە ئوم حەبیبە بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا کرد، شکۆی دا لەزەوی، بۆ ئەوەی بزانیت کە موسڵمانان هەموو یەک جەستە و یەک هەڵوێستن، لەگەڵ هاوسەرەکەیدا وەستاوە دژی باوکی، ئەمەش لەسەر ئەبو سوفیان کاریگەری زۆری دروستکرد، زانی ئەگەر جەنگ بکات بەرامبەر خەڵکێکی زۆر بەهێز و ڕەق جەنگ دەکات بەڵام لە ڕاستی نابێت بەم شێوە مامەڵە لەگەڵ باوک دا بکرێت، ئەو جێگایە تایبەتە ڕەوشتی ئیسلام داوای سیلەی ڕەحم و نەرم و نیانی دەکات لەگەڵ دایک و باوکدا ئەگەرچی موشریکیش بن، خوای گەورە لە سورەتی لقمان دا دەفەرموێت:

﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ [لقمان]

واتە: ئەگەر دایک و باوکت کۆششیان لەگەڵتا کرد، تا بەبێ هیچ بەڵگە و زانیارییەک هاوەڵ بۆ من بڕیار بدەیت گوێڕایەڵیان مەبەو بە قسەیان مەکە، لە دنیاشدا هاوڕێ و هاوەڵ و



خزمەتگوزارێکی چاک بە بۆیان لە هەموو بارو دۆخێکدا، شوێنی ڕێبازی ئەوانە بکەوە کە بۆلای من گەڕاونەتەوە، لەوەودوا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە، جا هەواڵتان دەدەمێ بەو کارو کردەوانەی کە دەتانکرد.

جارێک خاتوو ئەسمای کچی ئەبو بەکر دایکی موشریک بوو، ئەبو بەکر تەڵاقی دابوو لە ماوەی سوڵحی حودەیبییە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەسماء وتی: ئەی پێغەمبەر دایکم دەیەوێت بمبینێت و ئایا منیش سیلەی ڕەحم بەکار بێنم بۆی؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، بەسەری بکەرەوە؟!

لەڕاستیدا لە ئیسلامدا مامەڵە بەو شێوەیەیە، هەروەکو ئاماژەم پێدا ڕەوشتی ئەبو سوفیان تایبەت بوو، کارەکەی ئوم حەبیبە زۆر شەرعی بوو، بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی لەسەر نەفەرموو.

ئەبو سوفیان دەرچوو لە ماڵەکەی و چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەتاوەکو هەوڵی لەگەڵدا بدات کە ماوەکەیان بۆ درێژ بکاتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بەیەک وشەش وەڵامی نەداوە، هەرچەندە ئەوە لە ئوسلوب ( هەڵسوکەوت) و مامەڵەی ئاسایی پێغەمبەر ﷺ نییە، بەڵام بۆ ئەوەی ئەبو سوفیان هەست بەوە بکات کە تاوانەکەیان زۆر گەورەیە.

چونکە پێغەمبەر ﷺ میواندارى هەموو کەسێکی دەکرد و ڕێزی لە میوانەکانی دەگرت بەڵام ئەبو سوفیان ئەگەرچی سەرۆکی مەککەیە و سەرۆکی گشتی قورەیشە، لەبەرئەوەی پەیماننامەی حودەیبییەیان شکاندوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست بەهەرشێوەیەک بێت فەتحی شاری مەککە بکات، ئەو هەلەی لەدەست دەرنەچێت، بەهیچ شێوەیەک نەیویست قسەی لەگەڵ بکات، ئەگەر قسەی بکردایە لەوانەیە بەشێوەیەک لەشێوەکان کاریگەری لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەجیبهێڵێت، بۆیە ئەبو سوفیان هیچ قسە و باسێکی لەگەڵ نەکات بۆ ئەوەی پێی بڵێت تۆ وات کرد و واخراپەتان کرد و واپەیمانتان شکاند، تاوەکو ئەبو سوفیان هیچ هەستێکی بۆ درووست نەبێت کە موسڵمانان دەیانەوێت فەتحی شاری مەککەی پیرۆز بکەن.

چونکە هێرشکردن بۆسەر شاری مەککە زۆر نزیکە، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ قسەیەکی ڕەق و توندی بەرامبەر بە ئەبو سوفیان نەکرد، تەنانەت بەتاکە وشەیەکیش وەڵامی نەداوە، ئەمەش ئیهانەیەکی گەورە و شکاندنی شکۆی سەرۆکی مەککەیە شکاندنی کەرامەتی ئەو سەرکردەیە، بەبچووکی ڕاگرت و هیچ قورساییەکی بۆ دانەنا، چونکە تاوان و کارەکەیان زۆر چەپەڵ بوو.



بیهێنە بەرچاوی خۆت سەرکردەی وڵاتێک بڕوات بۆ وڵاتێکی تر هیچ کەس گرنگی پێنەدا و لەناو خەڵکی و سەرۆکی وڵاتەکەدا پشت گوێ بخرێت ئەمەش چیرۆکی ئەبو سوفیان بوو لەوکاتەدا.

ئەبو سوفیان داوا لە ئەبو بەکر و عومەر دەکات شەفاعەتی بۆ بکەن لای پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ

ماکوان: ئەبو سوفیان بەم شکستە دەروونییە گەورەیە چوو بۆلای ئەبو بەکر وەزیری یەکەمی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ تا هاوکاری بکات.

هەموو واماندەزانی کە دەگەڕێتەوە بۆ شاری مەککە و زۆر توڕە دەبێت و شۆڕشێکی گەورە درووست دەکات سوپا کۆدەکاتەوە دژی شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ، بەڵام هیچی ڕووی نەدا.

ئەبو سوفیان مەوقفی زۆر لاواز بوو، دەیزانی وەستانەوە بەرامبەر هێز و توانای ڕەقی موسڵمانان ئەستەمە، چووە لای ئەبو بەکر داوای هاوکاری کرد کە پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ماوەکەیان لەگەڵ قوڕەیشدا بۆ نوێ بکاتەوە؟!

ئەبو بەکر زۆر بەڕەقی وەڵامی دایەوە وتی: من هیچ کارێکت بۆ ناکەم، هاوکاریت ناکەم بۆلای پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ.

ئەبو سوفیان دیسان شکۆی شکێنرا لەلایەن ئەبو بەکرەوە بۆ جاری سێیەم.

بەڵام وازی نەهێنا و چوو بۆلای عومەری کوڕی خەتاب هاوکاری بکات و نێوەندگیری بکات لە نێوانیاندا کە ماوەی پەیماننامەکە بۆ قوڕەیش درێژبکاتەوە، بریا هەر نەچووبایە لەلایەن عومەرەوە ئەوەندەی تر شکۆ و کەرامەتی شکێنرا، زۆری لێ تووڕە بوو پێی وت من چۆن لای پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ شەفاعەتت بۆ دەکەم؟ سوێند بەخوا ئەگەر سوپای مێروولەم لەگەڵ بێت جەنگتان لەگەڵ دەکەم و دەتانکوژم، جاری چوارەمە کە سەری شۆڕ دەکەن.

ناچار ڕۆیشت بۆلای عەلی کوڕی ئەبو تالیب، لەوکاتەدا لەگەڵ حەسەنی کوڕی یاریی دەکرد، وتی بە عەلی هاوکارم بە با بەسەرشۆڕی نەگەڕێمەوە بۆلای قوڕەیش، شەفاعەتێکم بۆ بکە لای محەمەد صَلَّىٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ؟!

تەماشا لاوازی و سەرشۆڕی ئەبو سوفیان گەیشتۆتە چ ئاستێک!

عەلی وتی: ئەی قوڕ بەسەر ئەبو سوفیان، بەخوا پێغەمبەری خوا ئەوەندە تووڕەیە لێتان کەس توانای قسەی نییە و منیش ناتوانم هاوکارت بم.



پاشان ڕووی کرده خاتوو فاتیمەی خێزانی عەلی و کچە نازدار و خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

وتی: ئەی کچەکەی محەمەد دەتوانی هاوکاریم بکەیت، بەو کوڕەت بڵێ دەتوانێت هاوکارم بێت واتا داوای هاوکاری لە حەسەن دەکات، کە لەنێوان فاطمە و عەلی یاریی دەکرد. خەریک بوو پێی دەگرت لە نێوانیاندا هاتوو چوِی دەکرد.

پاشان با حەسەن هاوکارم بکات و لە داهاتوودا دەبێتە گەورەی هەموو عەرەب، بەڵام خاتوو فاتیمە بۆ شەشەم جار شکۆی خستە سەر زەوی وتی: بەخوا جارێ منداڵە و توانای هاوکاری کردنی نییە.

ئینجا ئەبو سوفیان بەعەلی وت:

ئەی باوکی حەسەن، من هەست دەکەم هەموو شتەکان لەسەرم قورس بووە دەرگاکانم لەسەر داخراوە، ئامۆژگاریم بکە؟!

عەلی وتی: وەڵڵاهی نازانم چی هاوکاریت دەکات بەڵام تۆ گەورەیی قوڕەیش دەکەیت، بڕۆ لەناو خەڵکیدا بەڵکو کەسێک بتگرێتە خۆی و (ئیجارت) بکات و داڵدەت بدات و پاشان بگەڕێیتەوە بۆ مەککە.

ئەبو سوفیان وتی: لەو بڕوایە دای ئەو چارەیە بەدەردم بخوات.

عەلی زۆر بەڕاشکاوانە وتی: بڕوا ناکەم، بەڵام لەوە زیاتر شک نابەم بۆت، بەتەواوەتی تووشی نەهامەتی و سەرشۆڕی بوو تا ناچار چووە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو خەڵکەکەدا هاواری کرد، ئەرێ کەسێک هاوکاریم دەکات و دەبێتە داڵدەدەرم؟!

یەک کەس هەڵنەسا بۆ هاوکاری و داڵدەدانی، ئەمەش شکاندنی شکۆی حەوتەمین جاری ئەبو سوفیان بوو، هیچ چارەی نەما و ناچاربوو بگەڕێتەوە.

گەڕانەوەی ئەبو سوفیان بە شکۆ شکاوی

ماکوان: ئەبو سوفیان سواری وشترەکەی بوو گەڕایەوە بۆ شاری مەککە، لە گەڕانەوەیدا چاوی کەوت بە سەلمانی فارس و بیلالی حەبەشی و سوهەیبی ڕۆمی، هەرسێکیان هاوڕێیەتیان خۆش بوو, خوا لەهەموویان ڕازیبێت، ڕوویانکردە ئەبو سوفیان و وتیان: ئەی دوژمنی خوا شمشێرمان بۆ داناوی کە بدەین لەگەردەنت، ئەبو بەکر گوێی لێبوو کە بەوشێوە بەرخود (هەڵسوکەوت) لەگەڵ ئەبو سوفیان دەکەن، وتی بۆ وا بە پیاوێکی پیر و گەورە و سەیدی قوڕەیش دەڵێن؟! دیار بوو ئەبو بەکر کاریگەری ئەو هەموو شکاندنی شکۆی لەبەر چاو بوو بەزەیی بە ئەبو



سوفیاندا هاتەوە، چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵا تۆمار بکات لەسەر بیلال و سوهەیب و سەلمان، چونکە هەرسێکیان لەشاری مەککە و مەدینەدا کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرا ئێستا بەوشێوە بەرخود دەکەن لەگەڵ ئەبو سوفیان.

بەڵام کاردانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سەیر بوو، فەرمووی ئەی ئەبو بەکر تووڕەت نەکردبن؟!

واتا مەبەستی بیلال و سوهەیب و سەلمان بوو، پێغەمبەر پشتی هەرسێ هاوەڵەکەی گرت و پاشان فەرمووی: ئەبو بەکر براکانت تووڕە نەکردبن چونکە خوای گەورە بە تووڕە بوونی ئەوان تورە دەبێت.[٩٠]

پاشان ئەبو بەکر بەپەلە چوو بۆ لایان و وتی: براکانم خۆ تووڕەم نەکردوون؟!

(یا إخوتاه أأغضبتكم؟)

ئەو هەڵوێستەی هاوەڵان هەڵوێستی جەنگ بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پشتگیری کردن چونکە ماڵ و سەروەت و سامانیان هەموو داگیر کردووە، هەموو کاردانەی لەو هەموو خراپەکارییە کە قوڕەیش و سەرانی ئەنجامیانداوە، ئەبو سوفیان بەسەرشۆڕی گەڕایەوە بۆ شاری مەککە، شکستی خواردبوو لە چوونی بۆ مەدینە و دانوستانی بەڵکو شکۆ و کەرامەتی لەلایەن موسڵمانانەوە شکێنراوە، گەڕاوە شاری مەکە و سەرکردەکانی شاری مەککە هەموو لێی کۆبوونەوە وتیان: بەچییەوە گەڕایتەوە ئەی ئەبو سوفیان؟!

ئەبو سوفیان: سوێند بەخوا چوومە لای محەمەد بەهیچ شێوەیەک قسەی لەگەڵ نەکردم پاشان چوومە لای ئەبوبەکر سوێند بەخوا چاکەی لەگەڵ نەکردم، چوومە لەی عومەر سەرسەخترین دوژمن دەرچوو، باشترین و نەرمترین عەلی بوو، ئەویش ئاماژەی بۆ گەڕانەوەم کرد وا گەڕاومەتەوە لاتان، سوێند بەخوا نازانم چیبکەم و پلانمان چیبێت بۆ داهاتوو، نازانم کارێکی باشم کرد کە بەقسەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبم کرد؟!

وتیان: بەچی ئامۆژگاری کردوویت؟

ئەبو سوفیان: بڕۆ ناو خەڵکی بەڵکو یەکێک داڵدەت بدات.

وتیان: ئەی کەس داڵدەی دایت؟

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٩٠ ـ (قال ﷺ: يا أبابكر لعلك أغضبتهم لئن كنت أغضبتهم لقد أغضب ربك) صحيح مسلم.



ئەبو سوفیان: نەخێر کەس داڵدەی نەدام.

وتیان: ئەی ماڵوێران وەڵاهی یاری پێ کردوویت.

ئەبو سوفیان: لەوە زیاتر هیچی ترم بەدی نەکرد تا ئەنجامی بدەم.

ئەمە لایەنی قورەیش بوو لەساتەوەختی ئەوەدابوو کە موسڵمانان هێرش بکەنە سەریان، قورەیش چاوەڕوانی هاتنی موسڵمانان بوون بۆ جەنگ، ئەوەی تاکە هاوکاری قورەیشە تەنها بەنی بەکرە، تاکە شتێک کە قورەیش چاوەڕوانی دەکات تەنها جەنگی موسڵمانانە.



# پێغەمبەر ﷺ بانگی جیهادی دا

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەخەڵکی کە دەربچن بۆ جیهاد بەگشتی، ئەم بانگەوازی جیهادە دوای گەڕانەوەی ئەبو سوفیان بوو لە شاری مەدینە بۆ شاری مەککەی پیرۆز، دەرچوونی موسڵمانان بۆ جیهاد لەسەر ئاستی مەدینە نەبوو بەڵکو لەسەر ئاستی ناوچەکە بوو بەگشتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد لە هەموو هۆزە موسڵمانەکان سوپا کۆبکەنەوە، لەوانە غەتەفان، بەنی سولەیم، بەنی فەزارە، ئەوانەی پێش سێ ساڵ هاتن بۆ گەمارۆی شاری مەدینە، قەدەری خوای گەورە وایە وا ئێستا دژی شاری مەککەی پیرۆز بۆ فەتحی مەککە بەکاری دەهێنن.

پێغەمبەری خوا ﷺ جێگای نهێنی دانا کە لە (مەڕ زەهران)[٩١] ناوچەکە ٢٢کم لە شاری مەککەوە دوورە لەوێدا هەموو یەکبگرن، هەموو هۆزەکان لە ڕێگای جیاوازەوە دێن بۆ ئەوەی قورەیش هەست نەکات، تاکوو چاوی قورەیش ژمارەی سوپاو سەربازەکانی بۆ ئاشکرا نەبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی سوپای ئامادەکرد بە سەرکردایەتی (ئەبو قەتادە) فەرمانی پێکرد کە بەرەو ڕێگای مەککە نەڕوات، تا قورەیش بزانێت بۆ مەککە سوپا ئامادە نەکراوە.

ئینجا دوای ئەو سریەیە سوپای بەهێز و گەورەی پێکهێنا، داوای کرد لە سوپاکە هیچ کەس نابێت بزانێت کە ئەم سوپایە بەرەو مەککە دەڕوات.

پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاکەی بەڕێ کرد و فەرمووی: خوای پەروەردگار چاویان کوێرکە گوێیان کەڕ بکە کە ئەم سوپایە نەبینن تا دەچنە سەریان، هیچ ئاگادارمان نەبن تا دەچینە سەریان.

(قال: اللهم خذ على أسماعهم وأبصارهم فلا يرونا إلا بغتة، ولا يسمعون بنا إلا فجأة)

ئەو سوپا و هێزانە بۆ شاری مەککەی پیرۆز بەڕێکەوتن.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩١] ـ مرالظهران.



# نامەکەی حاتیبی کوڕی ئەبو بەڵتەعە

ماکوان: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر لای گرنگ بوو کە کارەکە بەنهێنی بکات، بەهیچ جۆرێک قوڕەیش پێی نەزانێت، (حاتیبی کوڕی ئەبو بەڵتەعە) هاوەڵی بەڕێز بەهەڵە نهێنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئاشکرا کرد، وەڵامی نارد بۆ موشریکەکان کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هێرش دەکاتە سەریان، دیارە موشریکەکان خزم و کەسوکاری کە خۆیان بشارنەوە، لەبەر ئەوەی ئەم کارەی ئەنجام دا, خێزانەکەی لەناو شاری مەککەدا لاواز بوو، کە لە زوڵم و دەستدرێژی قوڕەیش دەترسا، چونکە خۆی قوڕەیش نەبوو، بەڵکو تەنها لەمەککەدا نیشتەجێ بوو، قوڕەیش داڵدەی دابوو.

هەرچەندە نابێتە هەنجەت، بەڵام خوای گەورە وەحی کرد بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و نامەکە ئاشکرابوو کەوتەوە دەستی پێغەمبەر و چەند هاوەڵێکی ناردو نامەکەیان هێنایەوە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەدوای لێپرسینەوەی لێی خۆش بوو، چونکە زانی لە دووڕووەکان نییە و دژی موسڵمانان کاربکات، بەڵکو چرکەساتی لاوازی مرۆڤە و لەبەر خێزان و کەس و کارەکەی ئەو نامەی نوسیبوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لێی خۆشبوو، ڕێگری کرد لە ئازاردانی حاتیبی کوڕی ئەبو بەڵتەعە، چونکە لە جەنگی بەدردا بەشدار بووە، ئەوانەی لەبەدردا بەشدار بوون خوای گەورە لێیان خۆش بووە، خوای گەورە دەفەرمووێت: هەرچی بکەن لێتان خۆش بووم، هەربۆیە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕێگری لە عومەر کرد کە بیکوژێت.

(قال صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ: إنه قد شهد بدراً، ومايّدريک يا عمر, لعل الله قد اطلع على أهل بدر بدرا فقال:- اعْمَلُوا مَاشِئْتُم فَقَد غَفرتُ لَكُم). [٩٣]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩٣] ـ صحيح البخاري.



# دەرچوونی سوپا بۆ شاری مەککە

ماکوان: سوپای موسڵمانان بە سەرکردایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو شاری مەککە بەڕێکەوت لە ١٠ مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٨ کۆچی ڕاستەوخۆ هەموو ڕووەو مەککە ڕێگایان دەبڕی.

لەڕێگادا پێغەمبەری خوا ﷺ عەبباسی مامی پێی گەیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ عەبباسی زۆر خۆشدەویست، چونکە لە دوای وەفاتی ئەبو تاڵیب، عەبباس لەشاری مەککەدا زۆر هاوکاری پێغەمبەری خوا ﷺی کرد.

نیشانەیەکی پرسیار لەسەر دواکەوتنی موسڵمان بوونی هەیە، هەرچەندە لە بەدردا ئاماژەی بەوەکرد کە موسڵمانە، بەڵام هیچ شیکاری و تەفسیرێکی وردی لەسەر نەبوو، تەنها و تەنها ئەوە نەبێت کە گوایە لە مەککەدا بە ئەمری پێغەمبەر ﷺ بۆ گواستنەوەی هەواڵی قوڕەیش ماوەتەوە، ئەمەش هیچ بەڵگە و دەلیلی لەسەر نەهاتووە، بەڵام وا ئێستا بەتەواوەتی موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند و لە موهاجیرەکان هەژمار دەکرێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی نەکردبوو لەهەمانکاتدا دڵی زۆر خۆش بوو بەهاتن و هیجرەت و موسڵمان بوونی عەبباسی مامی، عەبباس خێرا بووە موهاجید و لەگەڵ سوپاکە کەوتنەڕێ بۆ فەتحی مەککە.

پاشان لەڕێگادا دووکەسی تر لە بنەماکەی پێغەمبەر ﷺ (ئەبو سوفیانی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەلیب) کوڕی مامی پێغەمبەر (ئامۆزا) و هەروەها (عەبدوڵلای کوڕی ئومەییە) کوڕی پووری پێغەمبەر (پورزا) هاتبوون کە موسڵمان بن و هیجرەت بکەن بۆ شاری مەدینە.

بەڵام ئەم دوو کەسە لە شاری مەککە زۆر ئازاری پێغەمبەری خوایان دابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی کردەوە کە بیانبینێت، لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ بە موسڵمانبوونی خەڵکی زۆر خۆشحاڵ دەبوو، سەرەتا هەرنەیویست چاوی پێیان بکەوێت، چونکە زۆرترین ئازار بەدەستی ئەوان درابوو، لەکاتێکدا کەسی نزیک و یەکەمی پێغەمبەر ﷺ بوون، بەڵام دوای ئەوەی دایکی ئیمانداران ئوم سەلەمە، داوای کرد لەپێغەمبەر و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی بوو، هاتن و موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند و لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ تەوبەیان کرد، ئوم سەلەمە لە فەتحی مەککەدا لەگەڵ پێغەمبەردا بوو.



سوپا بەردەوام لە ڕێگابڕیندابوو بۆ شاری مەککە، تاگەیشتە جێگایەک بەناوی (کوراع غەمیم).[٩٣]

سوپا کە گەیشتنە ئەو ناوچەیە هەموو بەڕۆژوو بوون، کۆمەڵێک لە هاوەڵان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر و فەرموویان سوپاکە زۆر ماندووبووە قورسە لەسەر هەندێک لە هاوەڵان، چونکە ئەو ماوەیەی کە ڕێگایان بڕیوە نزیکەی سێ ڕۆژ بووە هاوەڵان بەڕۆژووبوون، (کوراعی غەمیمیش) نزیکە ٦٠کم دوورە لە شاری مەککەی پیرۆزەوە.

ئەم ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ لە دوای نوێژی عەسر بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی بەڕۆژوو بوو دەستبەجێ جامێ ئاوی لەبەردەم سوپاکەدا خواردەوە و فەرمانی کرد کە هەموو ڕۆژوەکەیان بشکێنن.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا پێوەری کرد لە نێوان دوو بەندایەتی، ڕۆژ و جیهاد دا سوپا لەجەنگدایە، پێویستە بەهێز و توانا و چالاک بن، ئەگەر چی ماوەکەش کەمی مابوو، بەڵام ڕۆژووەکە دەتوانرێت قەزا بکرێتەوە، بەڵام جیهاد قەزا ناکرێتەوە ئەم کارەی پێغەمبەری خوا ﷺ فێری چەند شتێکمان دەکات.

یەکەم: ڕاستە ڕۆژوو بەندایەتییەکی زۆر گەورەیە خوای گەورە لە فەرموودەی قودسی دا دەفەرموێت کاری مرۆڤ هەموو بۆ خۆیەتی تەنها ڕۆژوو نەبێت، ئەویش بۆ منە، خۆم پاداشتی ئەدەمەوە.[٩٤]

بەڵام لە دیندا شتێکمان هەیە بەناوی (واجب وقت) بەواتای ئەوەی کە هەندێک کار هەیە دەبێت لەکات و جێگای خۆیدا بکرێت، بەڵام هەندێک کاری تر دەکرێت لەکاتی تردا ئەنجام بدرێت، دواخستنی ڕۆژوو دەکرێت بەڵام فەتحی مەککە دواناخرێت تا دوای فەتحی مەککە دەکرێت ڕۆژوو بگیرێتەوە، ناکرێت ٦٠کم ماوە بۆ ناو شاری مەککە، سوپاکە دوابخرێت بۆ کاتی تر.

دووەم: ناکرێت لەیەک کاتدا مرۆڤ هەرچی چاکە و بەندایەتی باش هەیە بیکات ئەوکات لە واقیعەوە دەڕوات بۆ میسالی و نموونەیی، لە ئیسلامدا شتی وا نییە، لە دونیاشدا وا دەست ناکەوێت، مرۆڤی ئیماندار خاوەن حیکمەت کاری چاک ئەدات بەسەر چاکترە، چاکتر دواناخات، کەواتە دەبێت خاوەنی (فیقهی ئەولەویات) واتا لەپێش دانان و فیقهی واقعی بین لە هەڵسوکەوت و ئەدائی کارەکانماندا، تا خوای گەورەش تەوفیقمان پێببەخشێت.

---

[٩٣] ـ كراع الغميم.

[٩٤] ـ (كل عمل ابن ادم له إلا الصوم فنه لي وأنا أجزي به).



سێیەم: پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەیویست لە موسڵماناندا ئەوە بڕوێنێت کە تەنها بەندایەتی بۆ خوا واتا نوێژ و ڕۆژ و زەکات... هتد، ئەمانە بەتەنها بەندایەتی نین، بەڵکو گەورە و بچووکی ئیسلام بۆ مرۆڤەکان هەمووی بەندایەتییە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەندایەتی درووشمی دوا دەخات لەبەر خاتری بەرژەوەندی ئوممەتەکەی، کەواتە جیهاد و سیاسەت و بازرگانی و مامەڵە لە ئیسلامدا هەموو بەندایەتییە.

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ڕۆژووەکەی شکاند، فەرمانی کرد کە ئەوانیش پێشوەخت ڕۆژووەکە بشکێنن، ئەگەرچی دوای نوێژی عەسریش بێت، بەڵام هەندێک لە هاوەڵان ڕۆژەووەکەیان نەشکاند، بەو پێیەی کە لەتوانایاندا هەیە، کە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هەواڵەی بیست فەرمووی ئەوانە سەرپێچیان کردووە.

(قال صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: أولئك العصاة).

لەکاتێکدا ئەوان هیچ گوناحیان نەکرد بوو، بەڵام بەسەرپێچی بۆیان نووسرا چونکە هێز و توانایان کەم و لاواز دەبێت، دوایی ناتوانن جیهاد بکەن دژی موشریکەکان.

کەواتە لێرەدا سەرپێچی کاتیان کرد و سەرپێچی ئەوەیان کرد کە لاسایی پێغەمبەریان نەکردەوە، بۆیە ناوینان بەسەرپێچیکار، ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ پەروەردە زیاتر هەڵوێستەکردنی لەسەر دەوێت و پێویستی بە تێگەیشتنی قووڵ هەیە لە هەموو ڕەهەندەکانییەوە.



# هەموو سوپای موسڵمانان گەیشتنە ناوچەکەی مەڕ زەهران

ماکوان: هەموو هاوەڵان گەیشتنە ئەو جێگایەی کە پێغەمبەر ﷺ بۆی دەستنیشان کردبوون، کە نزیکەی ٢٢ کم دووره لە شاری مەککەوە، هەموو هۆزەکان گەیشتن بەیەک لە (مەڕ زەهران)، هۆزەکان بریتی بوون لە هۆزی (فەزارە و هۆزی بەنی سولەیم، هۆزی موزینە، جوهینە) هەندێکیان نیوە بوون لە هۆزی گشتی غەتەفان، کەمێک هاتبوون هەموویان لە ١٠ هەزار سەرباز پێکهاتبوون هەموو ئەو دە هەزار سەربازە لەو ناوچەدا کۆبوونەوە، هەروەک چۆن لە ئەحزاب دا کۆبوونەوە، بەڵام ئەمجارە بەشێوەیەکی پێچەوانە لە بەرژەوەندی موسڵمانان وا ئێستا چواردەوری مەککە گیراوە بە دە هەزار سەرباز ژمارەکە وەکو یەکە، بەڵام دوو هێزەکە زۆر جیاوازە.

پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت قورەیش تووشی داڕووخانی دەروونی بکات، تاوەکو بتوانێت بەکەمترین زەرەر و زیان بڕواتە ناو خاکی مەککەی پیرۆز.

فەرمانی کرد بەئاگرکردنەوە واتا هەریەك لە هاوەڵان مەشخەڵێك بگرن بەدەستیانەوە، واتا ١٠ هەزار مەشخەڵ، ئەمەش بۆخۆی سام و هەیبەتی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە ئاگر ترسناکە. ئەو ژمارەیەش یەکجار زۆرە! خەڵکی شاری مەککە ئێستا هەموو لە دوورەوە سوپاکە دەبینێت، هەندێك لە چاودێرەکانی قورەیش لە نزیک ناوچەکانی مەڕ زەهران چاودێریان دەکرد بزانن چی ڕووئەدات لەوانە (ئەبو سوفیان) کە نزیک بوویەوە کە ئەوەی بینی تووشی ترس و لەرزێکی زۆر بوو، خۆی چاودێری دەکرد لەگەڵ (بودەیلی کوڕی وەرقای خوزاعی)، هەردووکیان هاوڕێ بوون، بودەیل هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و داوای یارمەتی و هاوکاری لێکرد، بەڵام هەرگیز بڕوای نەبوو بەو سوپا زۆرەوە دێت بۆ فەتحی مەککە.



# ڕۆڵی عەبباسی مامی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەکاتی فەتحی مەککەدا

ماکوان: عەبباس کە ئەو هەموو سەربازەی بینی لە مەڕ زەهران، ترسا کە خراپ بەسەر شاری مەککەدا بهێنین، خەڵکەکەی قەتڵ و عام بکەن، چونکە واهەستی دەکرد. هەستەکەی لە ئەنجامی نوێ لە هیجرەت دا و شارەزا نەبوو بەڕەوشت و ئادابی موسڵمانان لە جەنگدا.

وابڕیار بوو لەبەرەبەیاندا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هێرش بکاتە ناو شاری مەککە، عەبباس زۆر ترسا، چونکە دەیوت لە کۆتاییدا ئەوانە کەسوکار و عەشیرەتمانن.

خۆ ئەگەر بێت و فریا نەکەوێت عەبباس ئەمن و ئاسایشی شارەکە لەلایەن پێغەمبەرەوە داڵدەنەدرێت خەڵکی مەککە خراپی بەسەردێت.

خۆی نزیک بوویەوە لە شاری مەککە و دوورکەوتەوە لە سوپاکە بۆ ئەوەی قوڕەیش ئاگادار بکاتەوە کە موسڵمانان هێرش دەهێنن و چارەی حاڵتان بکەن.

لەو کاتەدا گوێی لە دوان بوو لەو ناوچەدا بەیەکەوە قسەیان دەکرد، یەکێکیان بەوی تریانی وت لە ژیانمدا ئەوەندە ئاگر و سەربازم نەدیوە.

ئەوەی تر وەڵامی داوە وتی سوێند بەخوا ئەوە ئاگری خوزاعەیە جەنگ هەموویانی کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی تۆڵە لە قوڕەیش بکاتەوە، دەنگی یەکەم وەڵامی داوە وتی: خوزاعە؟ سوێند بەخوا خوزاعە زۆر لەوە کەمترە بتوانێت تۆڵە بکاتەوە و سەرباز و ئاگری هەبێت.

ئەم گفتوگۆیە لە نێوانی دووکەسدا دەکرا، دەیانویست بزانن ئەم سوپا زۆرە بۆچی هاتووە کەوا گەمارۆی مەککەی داوە.

عەبباسی کوڕی عبدولموتەڵیب گوێی لەم گفتوگۆیە بوو، دەنگی یەکەمی ناسییەوە ئەبو سوفیانە، هەروەها دەنگی دووەم بودەیلی کوڕی وەرقای خوزاعییە، بودەیل لەناو شاری مەککدا دەژیا زۆر ئاگاداری ڕەوشی خوزاعە نەبوو.

لەکاتی گفتوگۆکەیاندا عەبباس ئەبو سوفیانی ناسییەوە، چونکە هەردووکیان هاوڕێ بوون، عەبباس وتی ئەی باوکی حەنزەڵە.

ئەبو سوفیانیش دەنگی عەبباسی ناسییەوە وتی: باوکی فەزڵ؟



عەبباس: بەڵێ ئەوم.

ئەبو سوفیان: دایک و باوکم بەقوربانت بێت لێرە چیدەکەیت؟

دیارە نەیزانیووە کە هیجرەتی کردووە و موسڵمان بووە.

عەبباس وتی: ئەی ماڵوێران ئەوە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ ئەو خەڵکە هاتووە لەبەرەبەیاندا ئەدات بەسەر قورەیشدا.

ئەبو سوفیان ئەی چارە چییە دایک و باوکم بە قوربانت بێت؟!

عەبباس وتی: وەڵڵا ئەگەر دەست موسڵمانان بکەویت گەردەنت دەپەڕێنن، لەگەڵم سەرکەوە ئەمە هێستری پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ تا بڕۆینە لای و بەڵکو داڵدەت بدات.

خێرا ئەبو سوفیان ڕازی بوو بە ئامۆژگاری عەبباس لەگەڵیدا سەرکەوت و بودەیل گەڕایەوە بۆ شاری مەککە، ئەبو سوفیان تا کەس نەیناسیتەوە دەموچاوی داپۆشی بوو بەلای هەر ئاگری هاوەڵان ڕەت دەبوو ڕێگایان بۆ هێستری عەبباس دەکردەوە دەیانوت ئەوە هێستری پێغەمبەرە صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و ئەوەش مامیەتی.

بەڵام کاتێک بەلای ئاگری عومەری کوڕی خەتاب دا لەگەڵ عەبباس دا ڕەتبوون عومەر وتی ئەوە کێیە لەگەڵتدا عەبباس؟!

لەوکاتەدا عومەر دانیشتبوو کە هەڵساوە عەبباسی بینی و ئەبو سوفیانی ناسییەوە، بەوپەڕی هێز و توانای خۆی هاواری کرد، فەرمووی ئەی دوژمنی خوا، سوپاس بۆ خوا کەوتیتە بەردەستم بێئەوەی هیچ پەیمان و عەهد و وەفایەک لەنێوانماندا هەبێت بۆکوێ دەردەچیت ئەو کوژم.



# عومەر بڕیاریدا ئەبو سوفیان بکوژێت

ماکوان: ئیمامی عومەر کە زانی ئەبو سوفیانە بڕیاریدا بیکوژێت و بدات لەگەردەنی، عەبباس بەپەلە غاریدا بە هێسترەکەی پێغەمبەر ﷺ ، بەڵام عومەر خێراتر بوو، بەڵام هەرچۆن بوو بەپەلە عەبباس ئەبو سوفیانی ڕفاند و چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ عومەریش هاوکات خۆی کرد بەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دا و وتی: ئەی ڕەسولی خوا ئەوە ئەبو سوفیانە، کەوتۆتە بەردەستم هیچ عەهد و پەیمانێک لە نێوانماندا نییە، ئیزنم بدە با ملی بپەڕینم؟!

مێژوویەکی دوورودرێژ و پڕ دوژمنایەتی لە نێوانی ئەبو سوفیان موسڵماناندا هەیە، ئەبو سوفیان جەنگ لەدوای جەنگ سەرکردایەتی کردووە بۆ لەناوبردنی ئیمانداران، بەدەستی ئەبو سوفیان یەک دونیا یادگاری پڕ ناسۆر و ئەشکەنجە لای موسڵمانان کۆبۆتەوە.

عومەر ناحەقی نەبوو لەو هەڵوێستەی ویستی تۆڵەی لێ بکاتەوە، لە هەمانکاتدا پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگە و هیچ کۆمێنتێکی نییە.

بەڵام عەبباس وتی: ئەی ڕەسولی خوا من داڵدەم داوە.

پاشان عەبباس دانیشتوو دەستی خستە سەر سەری موبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو سۆزێکی باوکانە وتی: سوێند بەخوا ئەم شەوە بێجگە لەمن هیچ کەس نایپارێزێت.

بەڵام عومەر وازی نەهێنا هەر هەوڵی کوشتنی ئەبو سوفیانی ئەدا، عەبباس هەر دەیویست بەرگری لە ئەبو سوفیان بکات، عومەریش هەروازی نەهێنا و هەر هەوڵی کوشتن بوو، تا عەبباس توڕە بوو وتی: لەسەر خۆبە عومەر سوێند بەخوا ئەگەر لە هۆزی خۆت بوایە واتا (عودەی کوڕی کەعب) ئاوا هەوڵی کوشتنت نەئەدا، بەڵام چونکە ئەبو سوفیان لە هۆزی (عەبدولمەناف)ە بۆیە وازی لێ ناهێنن.

عومەر زۆرتر تووڕە بوو، وتی: عەبباس سوێند بەخوا موسڵمان بوونی تۆم لە موسڵمان بوونی خەتابی باوکم پێخۆشتر بوو، بۆ ئەوەی بە عەبباس بڵێیت لە ناو ئێمەدا هۆزگەرایی نییە، مەبەستی لەپێخۆشبوونی موسڵمانبوونی عەبباس لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی دەوێت.



عومەر هەموو ژیانی بۆ ئیسلام و دەعوەکە سەرف کردووە، بۆیە کە توورەیی زۆری هێنا بۆ عومەر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە عەبباس برۆ ببە بۆ جێگای پشووی خۆت، کە رۆژ هەڵات بیهێنەوە بۆلام.[95]

عەبباس ئەبو سوفیانی برد و رۆیشتن، عومەری کوڕی خەتاب لەو هەڵوێستەیدا ناحەقی نەبوو، چونکە لە ئوحود دا ئەبو سوفیان چەند قسەی ناشرین و جنێوی دا بە موسڵمانان و یاری کردن و شێواندنی لاشەی شەهیدەکانی ئوحود، تەنانەت بە براکەی عەبباس (حەمزە) [illegible] سکی هەڵدڕا و جگەری خورا لەلایەن خێزانی ئەبو سوفیان، بێجگە لە شەهیدەکانی تر، با جەنگی ئەحزاب لەولاوە بوەستێت کە ١٠ هەزار سەربازی هێنا بۆ لەناو بردنی موسڵمانان.

بەڵام هەرچۆن بێت مادام عەبباس داڵدەی داوە، گرنگە کە ئەبو سوفیان لە تەرەفی موسڵمانان بەکاربێت بۆ ئەوەی کەمترین زیان و زەرەر بە موسڵمانان بگات، یاخود ئیسلام بوونی خۆی رابگەیەنێت، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی پێدا بۆ بیرکردنەوە.

---

[95] (فقال ﷺ: إذهب به الى رحلك يا عباس، فذا أصبح فأئتنى به).



# بۆچی بوونی ئەبو سوفیان گرنگە

ماکوان: هەرچۆن بوو عومەری کوڕی خەتاب عوزری هەیە لەوەی کە ئەوەندە توند بوو لەمەڕ ئەبو سوفیان دا و دەیویست بیکوژێت، بەڵام لەڕاستیدا هێنانی کافرێک بۆ ئیسلام باشترە لەوەی کە کافرێک بکوژیت.

باشترە مرۆڤ لە ئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەیت، ئەگەر ئەبو سوفیان موسڵمان بێت باشترە بۆ خۆی و هەروەها بۆ قورەیش، چونکە ئیسلام بوونی ئەبو سوفیان هاوکارە بۆ ئەوەی هەموو قورەیش موسڵمان ببێت.

کەواتە هەردوولا ئەبو سوفیان و قورەیش ڕزگاریان دەبێت لە دونیا و قیامەتدا، هێز و توانای موسڵمانان بوونی مەککە گەورەترین هێز دەبێت بۆ سەر دەوڵەتی ئیسلامی و بێ جەنگ و کوشتار موسڵمانبن، بەڕاستی سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ موسڵمانان، چونکە سەرۆکی مەککە دەتوانێت بێ ئەوەی جەنگ ڕووبدات هێزی موسڵمانان بباتە ناو شاری مەککەی پیرۆز.

چونکە مەککە وڵاتی حەرام کراوە، جەنگ تێیدا حەرام کراوە، ئەبو سوفیان دەتوانێت پرۆژەی فەتحی مەککە زیاتر پێش بخات بێ خوێن ڕشتن.

لەلایەکی ترەوە کوشتنی ئەبو سوفیان دەشێت قورەیش تووڕە بکات و جەنگ درێژە بخایەنێت و خەڵکێکی زۆر بکوژرێت و پرۆژەی ئیسلامی مەککە و فەتحی دوابکەوێت!! ئەبو سوفیان سەرۆکی مەککەیە هەروەها سەرۆکی عەشیرەتی بەنی ئومەییەیە، هەروەها ئەمانە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئاگری جەنگ بڵێسەدارتر بێت.

کەواتە لەم بوارەدا ڕای عەبباس بەهێزترە، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگە، بەڵام زۆر بەشێوەیەکی سیاسی و حەکیمانە بە لایەنی پێغەمبەرایەتی مامەڵەی کرد لە نێوان (تەرغیب و تەرهیب)دا واتا لە نێوان هیوا و ئومێد بەخشین و ترس و بیم بۆ ئەبو سوفیان.

ئەمەش شێوە و ئوسلوبی پێغەمبەرە ﷺ بۆ بانگەواز، لە نێوانی سیاسەت و فیقهی بانگەوازدا، هەردوو سوپاکەی کۆکردەوە.



# گفتوگۆی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو سوفیان

ماکوان: لەبەرەبەیاندا عەبباس ئەبو سوفیانی هێناوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ بەوپەڕی هێز و توانای وەکو سەرکردەیەکی براوە لە جەنگ و سەرکەوتوو بەرامبەر بە سەرۆکێکی دۆڕاو و شکست خواردوو، بە ئەبو سوفیانی وت موسڵمان بە، موسڵمان بوون لەبەرامبەر شکاندنی پەیماننامەی حودەیبییە و کوشتنی خەڵکی خوزاعە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێوەی هەڕەشە فەرمووی: سەرگەردان ئەبو سوفیان هێشتا بۆت دەرنەکەوتووە و نەتزانیوە کە خوای گەورە تاک و تەنهایە و هاوبەشی نییە؟![٩٦]

ئەمەش هەڕەشە و تەهدیدێکی گەورەیە لەلایەن پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەبو سوفیان چونکە قورەیش بەدرێژایی ٢١ ساڵ دژایەتی پرۆژەی (لاإله إلا الله)یان کردووە وا ئێستا هەروا ئاسان نییە گفتوگۆ لەگەڵ ئەبو سوفیان، کە یەکێک لە هەرە زیرەک و بەتواناکانی عەرەبە.

خێرا وەڵامی پێغەمبەری دایەوە بەشێوەیەکی پڕ لە سۆز و خۆشەویستی و لەنێوانی لوتفی بەزەیی هەروەها کۆکردنەوەی بڕوا بوون و بڕوا نەبوون وتی: دایک و باوکم بەقوربانت بێت، تۆ کەسێکی بەڕێز و بەڕەحم و خاوەنی سیلەی ڕەحم و خاوەن ئەقڵی، ئەگەر بێجگە لەخوای پەروەردگار خوای تر هەبوایە، ئێمە ئاوامان بەسەردا نەدەهات.

وەڵامدانەوەی زۆر سیاسی بوو، هەر چۆن بوو دەیویست سیما و سەرۆکایەتی خۆی لەدەست نەدات و پیاوێکی سەرکردە و سەید و گەورەی قورەیشە، شەهادەتی نەهێنا و بە ئاشکرا شایەتومان بهێنێت، بەڵام دانینا بەوە کە (هوبەل و لات و عوزا) هیچی بۆ نەکردن.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی چووە قۆناغێکی سەخت تر، دانانی بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

خاڵی یەکەم زۆر سەخت نەبوو چونکە عەرەب بەشێوەیەکی گشتی بڕوایان بەخوا هەبوو کە دروستکەری ئەم بوونەیە، بەڵام هاوبەشیان بۆ دادەنا و پەیکەریان دەپەرست، بەڵام باسی پێغەمبەرایەتی لایان بەتەواوی ڕەفز بوو بڕوایان پێی نەبوو.

---

[٩٦] ـ (ويحک يا أبا سوفيان ألم يأن لک أن تعلم أن لا إله إلا الله؟).



ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ خستییە ناو چاڵێك و پرسی، ئەی ماڵوێران ئەبو سوفیان کاتی ئەوە نەهاتووە ئیتر ئەوە بزانی کە من نێردراوی خوام.[97]

لێرەدا ئەبو سوفیان هیچ توانای ئەم سەراوسەری نەما و تا ئەو چرکە ساتە بڕوای بە هیچی ئیسلام نەبووە، لەهەمانکاتدا نایەوێت درۆ بکات، لەبەر ئەوەی گەورەی قورەیشە، بەشێوەیەکی گشتی عەرەب درۆیان لا زۆر نەنگی بوو، لەهەمانکاتدا نایەوێت وەڵامی کۆنکرێتی بداتەوە.

ئەبو سوفیان وتی: دایک و باوکم بەقوربانت بێ، چەندە خاوەن عیلم و بەڕێز و بەخشندە و خاوەن سیلەی ڕەحمی، ڕاستت دەوێت تا ئێستا نەمتوانیوە بڕوا بە پێغەمبەرایەتیت بکەم.

عەبباس زانی هەڵوێستەکەی زۆر ترسناکە و زۆر نزیکە لە ملی بدات، پێشتر عومەر بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە دەیەوێت ملی بپەڕێنێت.

کوشتنی ئەبو سوفیان واتا بەهەلاکەتچوونی قورەیش، بۆیە ناچار عەبباس هاواری کرد بەسەر ئەبو سوفیان دا، ئەی سەرگەردان ئەبو سوفیان کات بەفیڕۆ مەدە موسڵمان بە و شایەتومان بهێنە، پێش ئەوەی لەگەردەنت بدرێت.

مەبەستەکەی عەبباس بەزۆرکردنی بە موسڵمان نییە، بەڵکو تاکە ڕێگای دەرباز بوونییەتی، چونکە هیچ کەس لاری لە کوشتنی ئەبو سوفیان نییە، ئەوەی عەبباس دەیخاتە بەردەمی تەنها ڕەحمەتی دونیا و قیامەتییەتی.

ئەگەر بە عورفی ئەمڕۆ تەمەشای بکەین لەیاسای نێودەوڵەتیدا بەتاوانباری جەنگ هەژمار دەکرێت، چەندجار هەوڵی تیرۆرکردنی پێغەمبەری داوە و هەوڵی کۆمەڵکوژی شاری مەدینە و موسڵمانانی داوە، بێجگە لەو هەموو ماڵ و سامانەی موسڵمانانی داگیر کردووە.

خوێنی ئەبو سوفیان ئاسانە بۆ ڕشتن لەو جێگایەدا.

کە عەبباس وتی: کات بەفیڕۆ مەدە، ئەبو سوفیان پیاوێکی واقیعی بوو، دەستبەجێ وتی (أشهد أن لا اله الا الله، وأن محمەمەدا رسول الله) خێرا موسڵمان بوو، لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند.

---

[97] ـ (قال له ﷺ: ويحك يا أباسفيان ألم يأن لك أن تعلم أني رسول الله؟).



# ڕۆڵی ئەبو سوفیان لە فەتحی مەککەدا

ماکوان: عەبباس هاوڕێی دێرینی ئەبو سوفیان بوو، باشتر لەهەموو دەیناسی، ئەو زانی لە ئێستادا لەچ قەیرانێکدایە، زانی بەتەواوەتی ڕووخاوە، بۆیە عەبباس داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد، کە ئەبو سوفیان لەو قەیرانەدا بهێنێتە دەرەوە, عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو سوفیان پیاوێکی خاوەن دەسەڵات و هێز بووە، حەزی بە ناوبانگە جا شتێکی بەرە دەست، پێغەمبەری خوا ﷺ بیری کردەوە لە قسەکەی عەبباس، زانی کە تەنانەت ئیسلام بوونەکەشی هەر ناچاری بووە، زانی هەر بڕوای بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا نییە، هیچ ئینتمای بۆ سیستەمی نوێ نییە و ئەگەر هەر دەسەڵاتێکی بداتێ ئەگەری ئەوەی هەیە ئینقلاب و هەڵگەڕانەوە بکات.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەبو سوفیان ماوەی چەند ساڵێک گەورەی مەککە بووە، ئەگەر لەو پۆست و مەقامەی بیهێنێتە خوارەوە زۆر کاریگەری نەرێنی دەبێت، لە هەمانکاتدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێت بیکاتە تەرەفی خۆی و هاوکاری لەجیاتی ئەوەی دوژمنایەتی بکات، هەروەها شتێکی بداتێ کە خزمەتی ئیسلام و موسڵمانانی پێبکات، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا شتێکی فەخری بداتێ، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ پارە و سەروەت و سامانی نییە لەوکاتەدا ببەخشێت.

هەروەها ئیمارەتی شاری مەککەی ناداتێ، چونکە جارێ دڵنیانین لەڕاستی و درووستی ئیمان و ئیسلامەتی، بەڵکو بە پێچەوانەوە دیارە کە بەناچاری موسڵمان بووە بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بیرکردنەوەیەکی بێوێنە دا کەلایەقە بە پێغەمبەرایەتی فەرمووی: هەرکەس بڕواتە ماڵی ئەبو سوفیان ئەوکەسە پارێزراوە، هەرکەس لەماڵی خۆیدا دەرگا لەسەر خۆی دابخات پارێزراوە، هەرکەس چووە مزگەوت ئەویش پارێزراوە.[٩٨]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمتیازێکی دایە کە هیچ کاریگەرییەکی نەبوو خەسارەت و زەرەر و زیانی لەدوا نەبوو، هیچ کاریگەری نییە بۆسەر کاری موسڵمانان، هەروەکو خەڵکی شاری مەککەیە هەرکەس دەرگا لەسەر خۆی دابخات وەکو ماڵی ئەبو سوفیان وایە، کەواتە ئەوەندە شتێکی گەورە نەبوو، بەڵام تەنها شتێکی فەخری و ڕێزێکی زیادە بوو بۆ ئەبو سوفیان، بەڵام لەناوەخندا مانای زۆری تێدایە لە ڕووی سیاسی و سەربازییەوە کە هەرکەس چووە ماڵی خۆی دەرگای داخست کەواتە هیچ جۆرێک لە بەرگری و شۆڕش درووست نابێت، ئەبو سوفیان

---

٩٨ ـ (من دَخَل دار أبي سفيان فَهو آمِن، ومَن أغلق بابَه فَهو آمِن، ومَن دخَل المسجِد فَهو آمن).



خۆی ئەم پەیامە بڵاودەکاتەوە، هێمنی و ئاسایش ئەدات بە مەککە، ئەم کارەی پێغەمبەری خوا ﷺ حیکمەتی سیاسی و فیقهی بانگەواز بوو لەمەزنترین ئاستدا.

حیکمەتی پێغەمبەر ﷺ ئاوابوو کە سەرەتا زۆر توند بوو لەگەڵ ئەبو سوفیان ئەو مامەڵەیەی کردی زۆر تووڕە و سەربازیانە بوو، بەڵام لەدواییدا زۆر نەرم بوو، شتێکیشی پێ بەخشی و ڕازی کرد و بەلای کەمەوە فەخری پێوەدەکات و دڵی ڕاکێشا بۆ لای دەوڵەتی ئیسلامی, هیچ لەدەوڵەتی ئیسلامیش کەم نابێتەوە.



## بەهێزترین تاکتیکی پێغەمبەری خوا ﷺ

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست هیچ ئاسەوارێک لە دڵی ئەبو سوفیان جێ نەهێڵێت، ئەوەی شەیتان دەیەوێت لەدڵی ئەبو سوفیان دا پێغەمبەری خوا بنبڕی کرد، پێغەمبەر ﷺ دەیویست ئیسلام چەکەرە بکات لە دڵیدا و هیچ خەیاڵ و بیرکردنەوەی بەلای هەڵگەڕانەوەدا نەڕوات، لەهەمانکاتدا عەرشی مەعنەویاتی بلەرزێنێت و هیوا و ئومێدی جەنگی نەمێنێت.

بۆ ئەم مەبەستە پێغەمبەری خوا ﷺ عەبباسی مامی ڕاسپارد کە ئەبو سوفیان لەسەر گردێکی (مەڕ زەهران) بۆ ئەوەی سوپا و ژمارەی سەرباز و جۆر و جۆریەتی سەرباز و هۆز و عەشیرەتەکان ببینێت، ئەحزابی موسڵمانان ببینێ، ئەحزابی موسڵمانان زۆر جیاوازترە لە سوپا و ئەحزابی ئەوان کەکاتی خۆی ئەبو سوفیان سەرکردایەتی دەکرد، بۆ ئەوەی بزانێت کە قوڕەیش توانای ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانانی نییە، هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە عەبباس لە نێوانی دۆڵەکە ڕایگرە تا سوپاکە دەبینێت و تێدەپەڕێت، لەسەربەرزاییەك تا بەجوانی هێزەکان ببینێت کە تێدەپەڕن، بزانێت توانای ڕووەڕووی سەربازانی خوای پەروەردگار نییە.[99]

عەبباس فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای جێبەجێ کرد، لەو جێگایە کە پێغەمبەر ﷺ بۆی دەستنیشانکرد ئەبو سوفیانی وەستاند، ئەبو سوفیان، ئۆپەراسیۆنی سەربازی موسڵمانانی بەچاوی خۆی بینی چەندە بەهێز و توانان، ئەبو سوفیان زۆر سەرسام بوو بەهێز و چالاکی سوپاکە و توانایان، هیچ هیوایەکی نەما بۆ بەرگری ئەم سوپایە.

پێش سێ ساڵ خۆی سەرکردایەتی سوپایەکی وایکرد، بەڵام پەیوەندی هۆزەکان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی و پارە و سامان بوو، بەڵام ئەم سوپایە پەیوەندییەکی زۆر پتەو لەنێوانیاندا هەیە، ئەویش پەیوەندی ئیمان و خواناسییە، هەروەها کە هۆزەکانی بینی هەموو ئەو هۆزانە پەیوەندی زۆرباش و چاکیان هەبوو لەگەڵ قوڕەیش، بۆیە ئەبو سوفیان سەرسام بوو، هەموو ئەم هۆزانە لەژێر ئاڵای پێغەمبەردا ﷺ کۆبوونەتەوە.

---

[99] ـ (قال ﷺ للعباس: يا عباس اجبس أبا سفيان بمضيق الوادي عند خطم الجبل حتى تمر به جنود الله يراها).



وەحدەتی ڕیز و ئەفکار هەموو کۆبوونەتەوە لەسەر دەستی یەک پیاو، ئەویش باشترین پیاوی سەر زەوییە.

هەموو سوپاکەی بینی کە چۆن لەگەڵ یەکدا بەڕەحم و بەزەیین و بەڵام ڕەق و توندی و جەنگ و ئازایەتی لە ناوچاویاندا دەباری.

ئەبو سوفیان کە ئەو دیمەنانەی بینی بەتەواوەتی ئەژنۆی شکا و هێزی پێنەما.

عەبباس حاڵ و باری دەروونی ئەبو سوفیان باس دەکات و دەڵێت:

هەر هۆزێک بە بەردەمیدا ڕۆشتنایە واتا کە چاوی لێبوو تێپەڕ دەبوون، ئەو لە تاوا ئەبو سوفیان دەیپرسی ئەوە کام قەبیلە و هۆزە؟!

عەبباس وەڵامی ئەداوە دەیوت هۆزی سولەیمە.

ئەبو سوفیان دەیوت: جا من چیم هەبوو لەگەڵ هۆزی سولەیم بۆچی هاتونەتە سەرم، یان بۆچی جەنگم لەگەڵ دەکەن، خۆ ئێمە نێوانمان باش بوو لەگەڵ سولەیم؟! دواتر ئەو دەیپرسی ئەو هۆزەی تر کێیە؟!

عەبباس وەڵامی ئەداوە دەیوت، موزەیینەیە.

ئەبو سوفیان: هەمان وتەی دووبارە دەکردەوە و دەیوت من کێشەم لەگەڵیاندا نییە بۆ هاتوونەتە سەرم بەم شێوەیە، هەتا کۆتا بەشی سوپاکە بە بەرگی تایبەت کە بەڕەنگی جلەکانیان هەموو سەوزی تۆخ بوو، کەتیبەیەک بوو هەموو دەموچاویان داپۆشرابوو، ئەم کەتیبەیە هەموویان تەنها موهاجیر و ئەنسار بوون، هەموو گیانیان چەک و قەڵغان بوو، تەنها چاویان بەدەرەوە بوو.

ئەبو سوفیان زۆر ترسا وتی ئەی ئەمانە کێن؟!

عەبباس وتی: ئەوە کەتیبەی تایبەتی پێغەمبەرە، لە موهاجیر و ئەنساریەکانن.

ئەبو سوفیان بەوپەڕی شکست و یەئس و بێ ئومێدی وتی: کێ توانای ئەمانەی هەیە، سوێند بەخوا ئەی باوکی فەزڵ (مەبەستی عەبباس بوو) موڵکی کوڕی براکەت زۆر گەورە و عەزیمە.

عەبباس: ئەبو سوفیان، ئەوە پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خوا ناردوویەتی و دەبێت سەربکەوێت.

ئەبو سوفیان: بەڵێ ڕاستە، ئیتر ئەبو سوفیان ئەو چرکە ساتە بڕوای بۆ درووست بوو کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نێردراوە لەلایەن پەروەردگارەوە.



پاشان ئەبو سوفیان بەپەلە گەڕایەوە بۆ شاری مەککەی پیرۆز.



## ڕۆڵی ئەبو سوفیان لەناو شاری مەككەی پیرۆزدا

ماكوان: ئەبو سوفیان بە پەلە خۆی گەیاندە شاری مەككە، بەپەلە هاواری كرد پڕبەدەنگی ئەی خەڵكی قوڕەیش، ئەوە محەمەد ﷺ بە سوپاكەیەوە هاتووە سەرەتای دیارە و كۆتایی نییە، ئێوەش تواناتان نییە ڕووبەڕووی ببنەوە.

لێرەدا ئەوەی مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو هاتەدی، ئەوەی دەیوست لە ئەبو سوفیان ئەنجامیدا، ئەوەتا ئەبو سوفیان ناهێڵێت قوڕەیش هیچ بەرگرییەك بكات و خوێن بڕژێت، لەهەمانكاتدا خوێنی موسڵمانانیش بڕژێنرێت، ئەمەش ئەوپەڕی ئاستی بەرزی سیاسەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

ئەبو سوفیان دووبارەی كردەوە وتی: توانای ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی (محەمەد) تان نییە، یان وتی: هەركەس بێتەماڵی من پارێزراوە، یەكەم جار تەنها باسی ماڵی خۆی كرد و هیچی تری نەوت، باسی مزگەوت و ماڵی مەككەی نەكرد بە گشتی تەنها ویستی ئەو شەرەفە بە خۆی بدات.

ئینجا ژنەكەی لەبەرچاوی خەڵكەكەدا هەڵسایەوە و وتی: ئەم بەكرێگیراوە لەناو بەرن و بیكوژن، یەكێكە لەهەرە خراپەكارەكانی قوڕەیش.

ئەبو سوفیان وەڵامی نەدایەوە بەڵكو جارێكی تر وتی: ئەی قوڕبەسەرتان! خۆتان پێ موهیم و گرنگ نەبێت، سوپاكەی محەمەد، سوپایەكی بێوێنەیە ئینجا دووبارەی كردەوە و وتی هەركەس بڕواتە ماڵی ئەبو سوفیان پارێزراوە ئینجا خەڵكی مەككە وەڵامی ئەبو سوفیانیان داوە وتیان: ئەی ماڵوێران، جا ماڵەكەی تۆ جێگای چەند كەسی تێدا دەبێتەوە؟

ئەبو سوفیان وتی: هەركەس لەماڵی خۆیدا دەرگا لەسەر خۆی دابخات پارێزراوە، هەركەس بڕواتە ناو حەرەم و مزگەوتی كەعبە پارێزراوە.

پاشان خەڵكەكە هەموو بڵاوەیان لێكرد و چوونەوە ماڵی خۆیان و هەندێك چوونە ناو مزگەوت.

ئەم هەڵوێستە گرنگەی ئەبو سوفیان كاریگەری باش و ڕۆڵی باشی بینێ لەكاتی فەتحی شاری مەككەدا، ئەو یەكێك بوو لەوانەی كە بەرگری كرد بۆ هاتنە ناوەوەی سوپای موسڵمانان و بۆ ناو شاری مەككەی پیرۆز.



پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰآلِهِۦوَسَلَّمَ سوپای جوڵاند بۆ ناو شاری مەککە و کە بڕیاری تەواوەتی درا خۆی بکات بەناو شاردا و بکەوێتە ژێر ڕکێفی موسڵمانان.



## هاتنی سوپا بۆ ناو شاری مەککەی پیرۆز

ماکوان: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سوپاکەی کرد بە چوار بەشەوە، بە پلانێکی تۆکمە و بەهێزی سەربازی بەم شێوەیە:

سوپای یەکەم: بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید لە باشووری شارەوە دەچنە ناوەوە، بەهێزترین بەشی سوپاکە لای خالید بوو، هێزی خالید و هێزی زوبێری کوڕی عەووام دوو هێزی سەرەکی بوون.

سوپای دووەم: بەسەرکردایەتی زوبێری کوڕی عەووام لە باکووری شارەوە دەچنە ناوەوە لە ناوچەی (کیدا).

سوپای سێیەم: بەسەرکردایەتی ئەبو عوبێدەی جەراح کە هێزی پیادەڕەو بوون (المشاة).

سوپای چوارەم: هێزی ئەنسار بوو بەسەرکردایەتی سەعدی کوڕی عوبادە، پێغەمبەری خواش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ ئەم هێزەدا بوو.

فەرمانی کرد بەهەر چوار بەشی سوپاکە کە لە کێوی سەفا یەک بگرنەوە، کێوی سەفا نزیک حەرەمی کەعبەیە.

لەڕێگادا سوپاکە تووشی چەند بەرگرییەک بوویەوە لەلایەن قورەیشەوە، کە هەندێک لە خەڵکی کۆکرابوونەوە لە عەبید و ئەوماشەکان بە سەرکردایەتی عیکریمە و سەفوانی کوڕی ئومەییە بۆ بەرگری کردن، لە ڕەوشێکی ڕۆز ئاڵۆز و دەروون ڕووخاویاندا لەدوای هەوڵێکی شکست خواردوو، ئەوانەی کۆکرابوونەوە هەموو بۆ پارە و سەروەت هاتبوون ئەم سوپایە لەناوچەیەکدا سەربازگەیان خستبوو پێی دەوترا (الخندمة) لە باشووری شاری مەککە دا بوو.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمانی کردبوو بە سوپاکان، هەوڵی خۆیان بدەن خۆیان لە کاردانەوەی جەنگ بەدوور بگرن، گرنگە بگەنە ناو شاری مەککە لە ڕێگادا لەگەڵ مەفرەزە و سرییە بچووکەکانتان دی خۆتانی لێ لابدەن با خوێن نەڕژێت .

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سێ فەرمانی جەنگیی دەرکرد.

یەکەم: جەنگ لەگەڵ کەسدا مەکەن هەتا جەنگتان لەگەڵ دەکەن, بە واتای ئەوەی ئێوە نەهاتوون بۆ تۆڵەکردنەوە، فەتحی شاری مەککە مانای ئەوە نییە تۆڵەی چەند ساڵەی دەرکردنی



خۆتان بکەنەوە، ئەگەر چی مێژووی موشریکەکان دوورو درێژە لەگەڵتاندا، بەڵام مەبەستی سەرەکی لە فەتحی مەککە بریتییە لەوە کە بەئیسلام حوکمڕانی بکرێت.

ئامانج لە فەتحی مەککە فێرکردنی خەڵکیە بەدینی ئیسلام و موسڵمان بوونیان و بڵاوکردنەوەی دینی خوا، ئەمەش ئامانجی هەموو فەتحێکی ئیسلامییە.

فەرمانی دووەم: ئەگەر لەوەودوا قوڕەیش خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ لەگەڵتاندا، دەستییان لێ مەپارێزن و جەنگیان لەگەڵدا بکەن.

لەبەرامبەر ڕەحمەتی یەکەمدا کە فەرمانی یەکەم بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەن بڕیاری سەربازی بوو کە هێز بەرامبەر بەوانە بەکاربهێنرێت جەنگتان لەگەل دەکەن، بەدڵنیاییەوە ئەهلی باتڵ دەبێت هێز و توانای موسڵمانانیان بۆ دەربکەوێت.

بۆ ئەوەی گەردەنکەچ بن و بەزوویی خۆیان بدەن بەدەستەوە، خوێنڕێژی زۆر نەبێت، چونکە هێز و توانای موسڵمانان کافر دەستبەسەر دەکات و بەو پێیە جەنگ ڕوونادات و خوێن کەم دەڕژێت.

فەرمانی سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری کوشتنی هەندێک کەسی دا، ئەگەر دەستیان بە کەعبە و بە پەردە ڕەشەکەشەوە بێت، ئەم کۆمەڵە تاوانی زۆر گەورە و قێزەونیان ئەنجامدابوو کەچەند پیاو و ئافرەتێک بوون، هەموو دەزانین پێغەمبەری خوا ﷺ هێمن و بەڕەحمەت و بەبەزەیی بووە، بەڵام بۆ ئەم چەند کەسە، بڕیاری کوشتنی دان ئەگەر دەست بگرن بە قەراغی کەعبەشەوە، (اقتلوهم ولو تعلقوا بأستار الكعبة) (ئەمەش مانای جددییەتی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، کە کەس بۆی نییە گاڵتە و قسەی ناشرین بە پێغەمبەر و درووشمەکانی ئیسلام بڵێت، ئەگەر دەستبگرێت بە کەعبەشەوە دەبێت بکوژرێت، ئەوانەی ناویان هاتبوو بریتیبوون لە (عەبدولعزی کوڕی خەتل، عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح، عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، حارسی کوڕی نوفەیل، مەقیس کوڕی صەبابە، هەباری کوڕی ئەسوەد، فرتنی و قەریبە کە دوو ئافرەتی جارییەی عەبدلعزی کوڕی فەزڵ، سارە خزمەتکارێکی بنەماڵەی عەبدولموتەڵیبە، ئەبو میعشەر، حارسی کوڕی طەلال خوزاعی، کەعبی کوڕی زوهیدە و قوحشی کوڕی حەرب و سەفوانی کوڕی ئومەییە و هندی کچی عوتبە؛ ژنی ئەبو سوفیان.)

هۆکاری زۆربەی ئەو کەسانە لە بڕیاری کوشتنیان دەرچوو، لەبەر ئەوەی گاڵتە و قسەی ناشرینیان بەرامبەر پێغەمبەری خوا کردبوو، قسەوتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەوتنە بە خوا و ئیسلام و ئوممەت و پەیامەکەی بۆیە حەدی قسە وتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ کوشتنە.



چونکە قسەکردن بەرامبەر پێغەمبەر و جنێودان پێی، وەکو ئەوە نییە قسە و جنێو بەسەرکردەیەک بدەیت، یان وەکو ئەوە وابێت قسە بە سەرۆکی وڵاتێک بدەیت، نەخێر لە ئیسلامدا قسە وتن بەخوا تەوبە و حەددی لەسەرە، چونکە زاتی بەرزی نەبینراوە و ئیمان و بڕوامان پێیەتی، بەڵام قسە وتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ حەددی کوشتنی لەسەرە، چونکە مرۆڤە و لە ئاستی بەرزی ئەو پلەیەی کە هەیەتی دەهێنرێتە خوارەوە، بەمەش تانە تەنها لە مرۆڤەکە نادرێت بەڵکو تانە و جنێودانە بە خوا و قورئان و ئیسلام و فریشتە و ئوممەت و هاوەڵان لەبەر ئەوە کوشتنی واجبە، مەگەر لە حاڵەتێکدا تەوبە بکات و بەڕاستگۆیی بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام.

لەوانەی فەرمانی کوشتنیان بۆ دەرچوو هەندێکیان تەوبەیان کرد و هەندێکیان گەیشتن بە سزای خۆیان.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەمانکاتدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو هاتوچۆی لەشاری مەککەدا قەدەغەکرد، هەروەکو فەرمانی کرد ئەوەی بڕواتەوە ماڵی ئەبو سوفیان پارێزراوە یاخود ماڵی خۆی یان مزگەوت.

بۆ ئەوەی هیچ کارێکی نەخوازراو ڕوونەدات، ئەمەش لەبەر خاتری ئاسایشی گشتی بوو، بۆ ئەوەی خوێنی خەڵکی بەناحەق نەڕژێت و ئاگاداری ژیان و سەروەت و سامانی خەڵکی شاری مەککە بێت.

پاشان ڕێگای کردەوە بۆ خەڵکی کە ژیانی خۆیان بەئاسایی بەرنە سەر و ژیان و کاری ڕۆژانە دوای چەند کاتژمێرێک ئاسایی بوویەوە لەناو شاری مەککەدا.

بۆیە بەهەموو شێوەیەک لەلایەن هاوەڵانەوە ئاسایشی شار دابینکرا و خەڵکی بەئاسایی ژیانی خۆیان بەرنە سەر.

ئەمەش مانای وابوو کە دەسەڵاتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەهێزە و وەکو دەسەڵاتەکانی تر نییە ماوەی دوورو درێژخایەن بۆ هاتووچۆ دابنێ، تەنها و تەنها مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بۆ پاراستنی ئاسایشی خەڵکی بوو بەگشتی، مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو کە هیچ جۆرە جەنگ و خوێن ڕێژییەک ڕوونەدات بۆ حورمەتی کەعبە و شاری مەککە، چونکە هەموو خوێنڕێژییەک حەرام کراوە لەم شارەدا، هەندێک لە خوزاعە هەڵسان بۆ تۆڵەکردنەوە لە هۆزی بەنی بەکر چەند کەسێکیان کوشتەوە لە بەنی بەکر، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لەوانیش کرد کە کاری کوشتن لە شاری مەککەدا نابێت ڕووبدات چونکە شارێکە بۆ بەندایەتییە، هەموو کارێک تێیدا حەرامە تەنها بەندایەتی بۆ خوا نەبێت هەر بۆیە ناونراوە (البلد الحرام).



هەندێک لە هاوەڵان ڕۆحی تۆڵەسەندنەوەیان تێدا درووست بوو لەوانە سەرۆکی ئەنسار کە خاوەنی کەتیبەی ئەنسار بوو واتا سەرکردایەتی دەکرد، ئەویش هاوەڵی بەڕێز سەعدی کوڕی عوبادە بوو، کە پێشتر بەدەستی قوڕەیش ئازار درابوو، ئەو کاتەی موسڵمان بوو هاتە ناو شاری مەککە سەرکردەکانی مەککە ئازاریان دا، بۆیە هاواری کرد ئەمڕۆ ڕۆژی جەنگی تۆڵە سەندنەوەیە و ئەمڕۆ لە کەعبەدا خوێن حەڵاڵە.

ئەم درووشمەی سەعد تەعبیری لە جەنگ و ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەی دەکرد هەرچەندە لە ڕووی شەرعییەوە بوونی هەیە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نایەوێت خوێنی تێدا بڕژێت، ئەگەر خەڵکی شاری مەککە جەنگ نەکەن.

کە سەعد ئەم وتەی دووبارە کردەوە ئەبو سوفیان گوێی لێ بوو، بەپەلە و خێرا خۆی گەیاندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و باسی کرد کە سەعد بەدوای تۆڵەوەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا ناردی بەشوێن سەعدی کوڕی عوبادە گەورەی خەزرەج، بۆ ئەوەی دڵنیابێت کە ئەو قسەیەی کردووە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ کە زانی قسەکەی کردوو پێی فەرموو: ئەمڕۆ ڕۆژی ڕەحمەت و ڕۆژی بەرز ڕاگرتنی کەعبەیە و ڕۆژی خوایە، ئەمڕۆ کەعبە بە پەڕۆ و بەرگی نوێ دادەپۆشرێت و دەبێت ئەمڕۆ بەرز ڕاگیرێت.[١٠٠]

هەموو چەمکی بیرکردنەوەی سەعدی گۆڕی بۆ چاکەخوازی، لەسەر ئەو کارەی ترسا کە شتی نەخوازراو ڕووبدات، سەرکردایەتی سوپاکەی لێوەرگرتەوە و دایە دەستی کوڕەکەی، بەناوی (قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە) بەمەش سەعدی ڕازی کرد، و ئەو ڕوحە جەنگاوەرییە کە بۆی درووست بوو، ویستی حەماسەتی کەم ببێتەوە هیچ کارێکی نەخوازراو ڕوونەدات.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەهیچ شێوەیەک نەفسیەتی سەعدی نەشکاند، بەڵکو ڕازی کرد بەسەرکردایەتی ئەنسار بە کوڕەکەی!

ئەمەش تەنها لایەقە بە بیرکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ و زیرەکی جەنابیان و حیکمەتی قیادە و سەربازی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە بوو.

ئەو سوپایەی عیکریمە و سەفوان کۆیان کردبووەوە، خالیدی کوڕی وەلید ڕووبەڕوویان بوویەوە بەملاو لای موشریکی دەخست و دەیکوشت، زۆری لێ بەدیل گرتن، لەکۆتاییدا عیکریمە و سەفوان ڕایانکرد، ئەگەر چی خالید هاوڕێی هەردووکیان بوو، بەڵام ئیسلام لای خالید گرنگ بوو، ئەوانیش کۆتاییان هات و سوپا بەتەواوی هاتە ناو شاری مەککە.

---

[١٠٠] ـ (اليوم يوم المرحمة، هذا يوم يعظم الله فيه الكعبة، ويوم تكس فيه الكعبة، ويوم تكسى فيه الكعبة).



## پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد

ماکوان: سوپای ئیسلامی هەموو چوونە ناو شاری مەککە و لە باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەچوونە ناوەوە، هیچ بەرگرییەکی وا ڕووی نەدا، تەنها لەناوچەی (الخندمة) ئەویش خالیدی کوڕی وەلید سەرکەوت بەسەریاندا و کۆتایی بەوانیش هات.

دەرگاکانی مەککە هەموو بۆ سوپا کرانەوە چوونە ناوەوە و چوونە ئەو جێگایەی پێغەمبەری خوا دەستنیشانی کردبوو بۆیان، زۆر بەهێمنی ئاسایشی مەککە هاتە ژێر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە خشوع و سەری وەکو سوجدە لەسەر وشترەکەی بۆ خوای گەورە دەبرد، نەکو وەکو سەرکردەیەکی سەرکەوتووی دونیا یی بەڵکو گەردەنی خۆی بۆ پەروەردگار کەچ کرد، تا خوای گەورە ڕەحم بە ئوممەتەکەی بکات و بەرەکەت بخاتە ناو کارەکانیان.



# هەڵدانەوەی یادگاری پڕ لەناسۆر

ماکوان: وا دوای ٢١ ساڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئازار و ئەشکەنجە درا و هاوەڵانی ڕاوەدوونران و دەربەدەرکران وا ئێستا بە ١٠ هەزار سەرباز فەتحی شاری مەککەی پیرۆزی کرد و لەمەولا بەشەرعی خوای پەروەردگار فەرمان ڕەوایی تێدا دەکرێت.

١٣ساڵ لێدان و ئازار و خوێن ڕێژی لەسەریەک بۆ پێغەمبەر و موسڵمانان، کوان ئەوانەی گاڵتەیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد؟!

لە کوێن ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ یان بەدرۆ دەخستەوە؟!

چوون بۆ کوێ کە دەیانوت شاعیر و شێتە؟!

کوان گەورە و زەعیم و سەید و ئەشرافی قوڕەیش و قیاداتیان (سەرکردەکانیان)؟!

کوان طاغوت و ملهوڕ و زاڵمەکان؟!

کەسیان نابینی هەموو لەماڵەکەنیاندا یان لەناو گۆڕدان، یاخود هەموو بەچپە چپ بەگوێی یەکتری و دەڵێن محەمەد) فەتحی شاری مەککەی کرد.(

گومانی تێدا نییە وا ئێستا پێغەمبەر ﷺ لەناو شاری مەککەی پیرۆزدا بە دونیا یەک یادگاری وەکو سیناریۆیەکی خەیاڵی سینەمایی ئێستایە وەکو شریتێک لێدەدریتەوە.

ژیانی منداڵی و لاوێتی و ژن هێنان و منداڵەکانی و هاتنی جوبرئیل بۆ لای و هێنانی قورئان و ئەو ساتانەی کە لەگەڵ خاتوو خەدیجەدا بەیەکەوە بوون و یادگاری بانگکردنی خەڵکی بۆ ئیسلام و موسڵمان بوونی خەڵکی و دونیا یەک یادگاری پڕ لە خۆشی و پڕ لەناسۆر، یادگارییە خۆشەکان کەمن بەڵام لەناوەخندا زۆر گەورە و پڕ لە خۆشین، وەکو موسڵمانبوونی ئەبو بەکر و عومەر و عەلی و عوسمان، حەمزە و ئەبو عوبەیدە و هتد.

پاشان یادگاری ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم و هەموو یادگارییە جوانەکان، کە پڕبوون لە هیوا و خۆشی و ئارامگرتن و شۆڕش کردن.

ناسۆر و یادگارییە ناڕەحەتییەکان پڕن و تەواو نابن، هەر لە هیجرەتی یەکەم و دووەمی موسڵمانان بۆ حەبەشە، بەردبارانی پێغەمبەر و گاڵتە پێکردن و جنێودان و زیندانی کردنی موسڵمانان و ئازار و ئەشکەنجە و سکهەڵدڕین و کوشتنیان، خواردنی سەروەت و سامانیان و بەچاوی سووک و کەم تەماشا کردنیان، هیجرەتیان بۆ شاری مەدینە، دەربەدەر و ماڵ وێرانی و



خۆشاردنەوە لە ئەشکەوت و شاخ و دۆڵەکاندا، ئەوکاتەی کە پێغەمبەر ﷺ دەربەدەر دەکرێت ڕووەو شاری مەککە دەفەرموێت: شاری مەککە تۆ خۆشەویسترین شار و وڵاتی لە دڵی مندا، خۆ ئەگەر خەڵکی و میللەتەکەت منیان دەرنەکردایە هەرگیز تێدا دەرنەدەچووم.[101]

ساڵ ڕۆیشت و هات بۆ یەک ساتەوەختیش شاری مەککە لە مێشک و بیری پێغەمبەر ﷺ دا لانەچوو، هەموو شۆڕش و توانای کۆکردەوە تاتوانی بگەڕێتەوە ناوی بەسەر بەرزی و خەونی چەند ساڵەی هاوەڵان هاتە دی، ئەوەی خەیاڵ بوو وابووە واقیع و ڕاستی خوای گەورە لە سوورەتی فاطردا دەفەرموێت:

﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِن شَيْءٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾﴾ [فاطر]

واتە: ئایا ئەوە نەگەڕاون بە زەویدا، تا سەرنج بدەن و تەماشا بکەن، چۆن بوو سەرئەنجامی گەلانی پێش ئەمان و چیمان بەسەر هێنان، ئەوانە هێزو دەسەڵاتیان لەمان زیاتر بوو، وەنەبێت خوا هیچ شتێك دەستەوسانی بکات لە ئاسمانەکان، یان لە زەویدا چونکە بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام زانایە و بەدەسەڵات و توانایە.

کۆتایی بەرگی سێ، خوێنەری بەڕێز؛ بێزەحمەت بڕۆ بۆ بەرگی چوار بۆ تەواوکردنی ژیانی باشترین پیاو لەسەر زەویدا.

(ونسأل الله عزوجل أن يعين الإسلام والمسلمين، وأن يرفع رايات الموحدين، وأن يرينا يوما تفتح فيه بلاد الارض بالاسلام، ويظهر فيه الدين ويعز الله عزوجل المسلمين، يزل فيه المشركين انه ولي ذلک والقادر عليه).

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[101] ـ (والله أنک أحب بلاد الله الي، ولولا أن أهلک أخرجوني منک ماخرجت).



پێرست


سەرەتای کتێبی سێیەم جارێکی تر لە زیندانەوە بۆ ناو پرۆژەی نوور ........................ ٨٨٩
جەنگی ئەحزاب ........................................................................ ٨٩١
پێشەکی جەنگی ئەحزاب ................................................................ ٨٩٣
کۆکردنەوەی هێز بۆجەنگ لەلایەن موسڵمانەوە ........................................ ٩٠١
بیرۆکەی خەندەق لەلایەن سەلمانی فارسی ............................................ ٩٠٢
پرۆژەی خەندەق لێدان ................................................................... ٩٠٤
سوپای موشریک گەیشتە سنووری مەدینە .............................................. ٩١٢
خیانەتی بەنی قورەیزە ................................................................... ٩١٤
دانوستانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هۆزی غەتەفان ........................................ ٩١٩
ناردنی سەرباز لەلایەن خوای پەروەردگار بۆ سەرکەوتنی موسڵمان ...................... ٩٢٣
جەنگی بەنی قورەیزە .................................................................... ٩٢٨
دامەزراندنی جێنشینکردن و تەمکین ..................................................... ٩٣٢
هەرگیز خەڵکێک شوێن کەسێک ناکەوێت کە ژیانی نەزانێت .............................. ٩٣٧
چالاکی سەربازی موسڵمان دوای خەندەق ................................................ ٩٤٠
کوشتنی سەلامی کوڕی ئەبو حوقەیق .................................................... ٩٤١
مەفرەزەی محەمەد کوڕی مەسلەمە ...................................................... ٩٤٢
بە دیل گرتنی سومامەی کوڕی ئوسەیل و موسڵمانبوونی .................................. ٩٤٣
گەمارۆی سومامەی کوڕی ئوسەیل بۆ قورەیش ............................................ ٩٤٦
غەزوەی بەنی لەحیان، بە سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ ..................................... ٩٥٠
غەزوەی (ذي قرد) بەسەر پەرشتی پێغەمبەر ﷺ ......................................... ٩٥٢
مەفرەزەی عوکاشەی کوڕی مەحصەن ..................................................... ٩٥٤
مەفرەزەی محەمەد کوڕی مەسلەمە ...................................................... ٩٥٤

مەفرەزەی ئەبو عوبێدەی جەڕاح ........................................ ٩٥٤
مەفرەزەی (١)ی زەیدی کوڕی حارس ........................................ ٩٥٤
مەفرەزەی (٢)ی زەیدی کوڕی حارس ........................................ ٩٥٤
مەفرەزەی (٣)ی زەیدی کوڕی حارس ........................................ ٩٥٥
مەفرەزەی (٤)ی زەیدی کوڕی حارس ........................................ ٩٥٥
مەفرەزەی (٥)ی زەیدی کوڕی حارس ........................................ ٩٥٨
غەزوەی بەنی موستەلەق بەسەرکردایەتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ........................................ ٩٥٨
ڕووداووی ئیفک چییە؟ ........................................ ٩٦٣
مەفرەزەی عەبدووڕەحمانی کوڕی عەوف ........................................ ٩٦٦
مەفرەزەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ........................................ ٩٦٦
مەفرەزەی ئەبوبەکری سدیق ........................................ ٩٦٦
مەفرەزەی کەرزی کوڕی جابری فەهری ........................................ ٩٦٧
مەفرەزەی عەبدوڵڵای کوڕی ڕاوەحە ........................................ ٩٦٧
مەفرەزەی عەمری کوڕی ئومەییەی زەمری ........................................ ٩٦٩
چالاکییە سەربازییەکانی موسڵمانان لە ساڵی ٦ی کۆچی و کاریگەرییەکانی ........................................ ٩٧٠
خەونی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ........................................ ٩٧٥
دەرچوونی موسڵمانان بۆ بەجێهێنانی عومرە ........................................ ٩٧٧
ڕێگری قوڕەیش لە موسڵمانان بۆ ناو ماڵی خوا ........................................ ٩٧٨
نەرم بوونی دڵی خالیدی کوڕی وەلید و دابەزینی نوێژی ترس ........................................ ٩٨٠
ناردنی نێوەندگیر بۆ لای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەلایەن قوڕەیش ........................................ ٩٨٤
شاندی یەکەم: بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی ........................................ ٩٨٤
شاندی دووەم: حەلیسی کوڕی عەلقەمە ........................................ ٩٨٨
شاندی سێیەم: عروەی کوڕی مەسعوود ........................................ ٩٨٩
بەدیل گرتنی ٥٠ سەربازی قوڕەیش ........................................ ٩٩٣
شاندی چوارەم: میکرەزەی کوڕی حەفس ........................................ ٩٩٤

ناردنی شاندی موسڵمانان بۆلای قورەیش ........................................ ٩٩٥
ناردنی عوسمان بۆ مەککە و داواکاری موسڵمانان ........................................ ٩٩٧
کاردانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەواڵی کوشتنی عوسمان ........................................ ١٠٠٠
هەڵوێستەیەک لەسەر چۆنیەتی سوڵحی حودەیبییە ........................................ ١٠٠٨
پێغەمبەر و شوورا و ڕاوێژکردن ........................................ ١٠٠٩
بەند و خاڵی سوڵحەکە ........................................ ١٠١١
نووسینەوەی پەیماننامەکە ........................................ ١٠١٦
ڕاهێنان لەسەر کارنەکردن لەسەر هەست و سۆز ........................................ ١٠١٩
شوورا تایبەت نییە بە پیاوان ........................................ ١٠٢٣
گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە و چارەسەر ........................................ ١٠٢٤
ئەبو بەسیر و جەنگی گەریلا ........................................ ١٠٢٧
هاتنی ئافرەتانی موسڵمان بۆ مەدینە ........................................ ١٠٣٠
ناساندنی ئیسلام بە جیهاندا ........................................ ١٠٣٢
واقعبینی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناساندنی ئیسلام بەجیهاندا ........................................ ١٠٣٥
ناردنی نوێنەری دەوڵەتی ئیسلامی بۆ وڵاتانی جیهان ........................................ ١٠٣٦
نامەکەی پێغەمبەر بۆ هیرەقلی ڕۆم ........................................ ١٠٣٨
دەقی نامەکە: ........................................ ١٠٤٠
وەڵامی هیرەقل مەلیکی ڕۆم ........................................ ١٠٤٢
گفتوگۆی ئەبو سوفیان و هیرەقل و ئوسقووفی پاپای ڕۆم ........................................ ١٠٤٤
نامەکەی پێغەمبەر بۆ کیسرا (مەلیکی فارس) ........................................ ١٠٥٣
بڕیاری دەستگیرکردنی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن کیسراوە ........................................ ١٠٥٤
حاکمی یەمەن بازان ئیسلام بوونی خۆی ڕادەگەیەنێت ........................................ ١٠٥٦
نامەی مقەوقیس مەلیکی میسر ........................................ ١٠٥٨
شیکارییەک بۆ سەفیر و نوێنەرەکانی پێغەمبەر ﷺ ........................................ ١٠٦١
هەڵدانەوەی مەلەفی خەیبەر ........................................ ١٠٦٥

هۆكاری فەتحی خەیبەر ........................................ ١٠٦٦
هاوپەیمانی مونافیق و یەهوود و غەطەفان دژی موسڵمانان ........................................ ١٠٧٠
سوپای پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناوچەی خەیبەر ........................................ ١٠٧٢
بانگەواز لە هەموو ڕەوشێكدا ........................................ ١٠٧٤
دەستپێكردنی جەنگ لە خەیبەردا ........................................ ١٠٧٧
تاقیكردنەوەی خوایی ........................................ ١٠٧٩
یەهوود داوای سوڵح دەكات ........................................ ١٠٨٥
هەندێك ڕووداو لەكاتی جەنگی خەیبەردا ........................................ ١٠٨٨
هەوڵی كوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ژەهر ........................................ ١٠٩٠
دوای جەنگی خەیبەر ........................................ ١٠٩٥
زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی شاری مەدینە و موسڵمانبوونی عەرەب ........................................ ١٠٩٨
ئامانجەكانی پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی ٧ی كۆچیدا ........................................ ١١٠٠
غەزوەی (ذات الریقاع) ........................................ ١١٠٢
دوای جەنگی غەتەفان چی ڕوویدا؟ ........................................ ١١٠٩
عومرەی قەزا ........................................ ١١١١
هۆكاری موسڵمانبوونیان ........................................ ١١٢٠
چۆن عەمری كوڕی عاس موسڵمان بوو ........................................ ١١٢٥
سێ سوارچاكەكە گەیشتنە شاری مەدینە ........................................ ١١٢٨
جەنگی موئتە ........................................ ١١٣٠
هۆكاری جەنگی موئتە چی بوو؟ ........................................ ١١٣١
هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر دەوڵەتی ڕۆم ........................................ ١١٣٣
وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ سوپاكە ........................................ ١١٣٦
سوپای ئیسلام گەیشتە ناوچەی (معان) ........................................ ١١٣٩
هەڵوێستەیەك لەسەر بڕیاری جەنگ لە موئتە ........................................ ١١٤١
هەڵبژاردنی جێگای ستراتیژی جەنگ لە موئتەدا ........................................ ١١٤٦

یەکەم شەهیدی جەنگی موئتە ........................................................ ١١٤٨
دووەم شەهیدی جەنگی موئتە ........................................................ ١١٤٩
شەهیدی سێیەم .......................................................................... ١١٥٠
خالیدی کوڕی وەلید سەرکردایەتی سوپا و جەنگ دەکات .................................... ١١٥١
ئایا جەنگی موئتە شکست بوو یان سەرکەوتن بۆ موسڵمانان؟ ................................ ١١٥٣
وەسیەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ عەمر ............................................ ١١٥٩
وریای و ستراتیژی جەنگی عەمری کوڕی عاس ................................................ ١١٦١
ڕای جیاواز لە نێوان عەمر و ئەبو عوبێدە ........................................................ ١١٦٢
سەرەتای دەستپێکی فەتحی مەککە ............................................................ ١١٦٨
تەمکین چییە لە سیرەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ............................................ ١١٧٠
ڕووداوی نێوان خوزاعە و بەنی بەکر ............................................................ ١١٧٣
خوزاعە داوای کۆمەک لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەکەن .................................... ١١٧٦
هۆکار چییە ماوەی دەستپێک درێژە و تەمکین کورتە ............................................ ١١٨٣
تەمکین هۆکارە نەك ئامانج ........................................................................ ١١٨٦
ڕەوشەکە لەبارە بۆ فەتحی مەککە ............................................................ ١١٨٩
بڕیاری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ فەتحی مەککە دەرچوو ............................ ١١٩٣
لایەنی قورەیش و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی هەڵەکەیان .................................. ١١٩٥
قورەیش و سەرۆکی گشتی مەککە داوای لێخۆشبوون دەکات .................................. ١١٩٧
شکاندنی شکۆی ئەبو سوفیان .................................................................... ١١٩٨
هەڵوێستەیەک لەسەر کاری ئوم حەبیبە ........................................................ ١١٩٩
پێغەمبەر بانگی جیهادی دا ........................................................................ ١٢٠٥
نامەکەی حاتیبی کوڕی ئەبو بەڵتەعە ............................................................ ١٢٠٧
دەرچوونی سوپا بۆ شاری مەککە ................................................................ ١٢٠٨
هەموو سوپای موسڵمانان گەیشتنە ناوچەکەی مەڕ زەهران .................................... ١٢١١
ڕۆڵی عەبباسی مامی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەکاتی فەتحی مەککەدا ...................... ١٢١٢

عومەر بڕیاریدا ئەبو سوفیان بکوژێت ............................................................................ ١٢١٤
بۆچی بوونی ئەبو سوفیان گرنگە ........................................................................ ١٢١٦
گفتوگۆی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ ئەبو سوفیان .............................................. ١٢١٧
ڕۆڵی ئەبو سوفیان لە فەتحی مەککەدا ...................................................................... ١٢١٩
بەهێزترین تاکتیکی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ................................................ ١٢٢١
ڕۆڵی ئەبو سوفیان لەناو شاری مەککەی پیرۆزدا ......................................................... ١٢٢٤
هاتنی سوپا بۆ ناو شاری مەککەی پیرۆز ................................................................... ١٢٢٦
پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەتحی مەککەی کرد ................................................. ١٢٣٠
هەڵدانەوەی یادگاری پڕ لەناسۆر ........................................................................ ١٢٣١




پێغەمبەرەکەم شەرم لەخۆم دەکەم کە تەنها بە چەند هاوڕێیەک و مزگەوتێکی بچوک پەیامەکەت گەیاندە دونیای زەمان و من و ملیارەها موسوڵمانی وەک من بە هەزاران مزگەوت و کەرەستە و ئیدیعا ئێمە چیمان کرد بۆ ئەوەی پەیامەکەت بگەیەنین و ئەرکەکەت بناسێنین، جەنابتان لە هەموویان شەرەفمەندتریت، جەنابتان تێپەڕیت بۆ ئەوەی میللەتەکەت بگاتە ڕووناکی و ڕاستی، بەڵام ئێمە چیمان کرد؟ ئێمە تەنها چاومان لە حەقیقەت داخست و کوێرانە ڕێگای تاریکیمان گرت و ناوی جەنابتان دەبەین،

شەرم لە پێغەمبەرەکەم دەکەم...






Design: **Braw** Al-Najjar

کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف

٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ —— /M.Ktebxana

نرخ: ٢٠٠٠٠